– : أصيب بالزكام/ توشی هەڵامەت بو، سەرمای بو، با پەری کرد.

– : فتر/ سارد بوەوە، گەرمی نەما.

– ت همّتُهُ: فترت خمدت/ سارد بوەوە، ئارەزوی نەما.

– بالمبْرد: سحَل/ لە برپەنگی دا، رنی.

بَرَّد الشيء صيَّرَهُ بارداً/ ساردی کردەوە، فێنکی کردەوە.

– الألم: هدَّأ. سكَّن/ ئێشەکە ی هێواش کردەوە.

– الهمّة: فَتَّر. خَمّد/ ساردی کردەوە.

تبَرَّد. برد نفسه/ خۆی فێنك کردەوە.

إستَبْرَد: اصاب بالبرد/ سەرمای بو، باپەری کرد.

أبردهُ المرض: أضْعفهُ/ نەخۆشیەکە لاوازی کرد، هێزی تیا نەهێشت.

أبْرَدَ: ارسل بالبرد/ ناردی، بە پۆستەدا ناردی.

– ت السماءُ: أمطرت برداً/ تەرزە باری.

برْد: عكس حرّ/ سەرما.

– قارص/ وشکە سەرما.

بَرَدٌ: حبُّ الغمام/ تەرزە.

بُرُودة: ضد حرارة/ ساردی، سەرما، ساردایی.

بُرداء: برد الحُمىً/ لەرز، لەرز لەکاتی سەرمادا، چۆقەی لەرز.

برّاد: خزان التبريد/ ساردکەر، ساردکار.

بارد: ضد حار/ سارد، فێنك.

– : بليد/ کەودەن، گێل، دەبەنگ، گەلۆر، تەپۆ، کاس، گەمژە.

– : ثالم/ کول.

– الطبع: هاديء. رزين/ لەسەرخۆ، سارد، خاوو خلیچك.

– : ضعيف/ لاواز، بێهێز، سست، خاو.

دُخّان – / توتنی (نەرم، سارد).

عيْشٌ – : هَني ء/ ژیانێکی ئاسودە.

غنيمةٌ باردة: مكتسبة دون عناء/ دەستکەوتێکی بێ ئەرك، تالانی.

تبريد: ضد تسخين/ سارد کردن.

– الأكل: تصقيع/ خواردن ساردکردنەوە.

– الألم: تسكين/ ئێش هێواش کردنەوە، ئازار شکاندن، ژان شکاندن.

خزان الـ – في السيارة/ رادێتەر.

مُبرِّد: مُبرِّدة فێنکار، باسارده، سارديار.

بُرادة: شُقاطة المبْرد/ وردە ئاسن، خاکەی ئاسن.

مِبرَد: آلة البرد/ برپەنگ، برپەن.

برّاد: الذي يركب الالات المعدنية/ فیتەر.

بريد: رسول/ نێرراو، نامە، پۆستە.

– بوسته/ پۆستە، پۆستەخانە.

– جَويّ/ نامە بە فرۆکە، پۆستەی هەوایی.

– عادي/ نامەی ئاسایی، پۆستەی ئاسایی.

اجرة الـ – / کرێ پۆستە.

طابع الـ – / پول پۆستە.

صندوق الـ – / سنوقی پۆستە.

ختم الـ – / مۆری پۆستە.

مكتب الـ – / پۆستەخانە.

هواية جمع طوابع الـ – / پول کۆکردنەوە.

دائرة الـ – / پۆستەخانە.

البُرد: ثوب مُخطَّط/ کراسی میل دار، خەت خەت.

الأبرد: نمر ارقط پلنگی بەڵەك.

بردي: نبات مائي/ زەل، لەبان.

بَرود: كحُل/ کل.

– : بارود/ بارود، باروت، دەرمان.

برْدَعَة: كساء الدابة/ کورتان، کۆپان.

بردقوس: نبات/ جاترە کێویلە.

برذ:

برْذعَة: كساء الدابة/ کورتان، کۆپان.

براذعي: صانع البرْذعة/ کورتان درو، کۆپان درو.

بِرذَوْن: حصان الجرّ أو الحمل/ بارگیر، ختە.

برز:

برَزَ: ظهَر دەرکەوت، دەرهات، هاتەدەر.

– : نتأ/ دەرپەری، هەڵ قوڵی.

– : برَزَ على غيره: فاق أصحابه/ پێش کەوت.

– خَرج الى البَراز/ چو بۆ چۆڵ بۆ گو کردن.

بارز. صارعَ شاجر/ زۆرانی گرت، شیربازی کرد.

أبْرَزَ: اظهر/ دەریخست، دەریهێنا، پیشانیدا.
– الكتاب: نشرهُ/ بلاوی کردەوە.
تبرَّز: تغوَّط/ گوی کرد، پیسایی کرد.
إبراز: إظهار/ دەرخستن، پیشان دان.
بُروز. نُتوء/ دەرپەڕیوی، هەڵ تۆقیوی، بەرزەکی، بەرز بونەوە.
– . تفوُّق/ سەرکەوتن، پێشکەوتن، بەدیارکەوتن، بەرزبونەوە، هەڵ کەوتن.
بارز: ناتيء/ دیار، بەرز، زەق، بە دەرەوە، قۆقز.
براز. ما يُبْرز من المخرج. گو، پیسایی.
– الإنسان: غائط/ گو.
– الحيوان: روث/ تەرس، ریخ، پشقڵ، شیاکە.
– الطيور. زرق/ ریقنە، جیقنە.
بَراز: فضاء/ چۆڵ، دەشت، دەر.
مبرز: موضع قضاء الحاجة/ شوێنی پیسایی لێ کردن، ئاودەست.
مُبارز: مُنازل. معارك/ شمشێرباز، جەنگاوەر، زۆران باز.
مُبارزة. براز: مُنازلة/ زۆران بازی، شمشێر یا خەنجەر بازی، جەنگین.
برزَخ. حاجز. ارض بين بحرين/ زەوی نێوان دو دەریا.
برس:
برسام. ذات الجنب/ ئاوبەنگ.
برسيم. نفل سێپەڕە.
– حجازی/ جۆرێکە لە سێپەڕە، سێپەڕەی حیجازی.
برسكوب/ دور بینێکە ئەودیو دیوار ئەبینێ، ئەودیو بین.
برش:
بُرْش. مَمْسحة الأرجل/ پێڵاو سڕە، پێپاکەرە.
ابرش. أرْقط. أبْقع. بەڵەک، پەڵاوی، کونج، شڵ.
برْشمَ الرجُل. اظهر الحُزن. پەست و دڵ تەنگ بو.
– فيه. احدَّ النظر/ چاوی تێ بڕی، مرخی لێ خۆش کرد.
– ختم. احكم إقفاله/ سەرمۆری کرد.
– المسمار. بَجَّنهُ. پەرچی دایەوە، خواری کردەوە.
برص:
برصَ. برص. اصابه البرصُ/ بەڵەک بو.

برصٌ. مرض خبيث بەڵەکی.
بَرْص. بُرص. ابو بريص: سحلية/ شەووگەرد.
– . – . – : اصفر/ بڵقە دەرە.
أبرص. مُصاب بالبرص/ بەڵەک، بازەڵە.
ارض بَرصاء. رعى نباتاتها/ گەڕەزەوی.
برط:
برطل. رشا/ بەرتیلی دا.
برطل. إرشاء. بەرتیل دان.
بِرطل. رشوة/ بەرتیل.
مُبرْطلٌ: مُرْتشٍ/ بەرتیل خۆر.
مُبرْطل: راشٍ/ بەرتیل دەر.
بُرطُل: تاج الأسقف/ کڵاو قەشە.
برطم:
برْطم. تبرْطم. إنتفخ غضباً/ توڕە بو، لە توڕەییانا ئاوسا، پیشی خواردەوە.
– . دَمْدم/ بۆڵانی، ریوەریوی کرد، بۆڵەبۆڵی کرد.
برطام. ضخم الشفة/ لچ ئەستور، لچن، لچە.
برع:
بَرَع: كان بارعاً/ سەرکەوت، چالاکی نواند.
تبَرّع: اعطى مع غيره/ بەخشی، باریوی کرد.
– : تطوّع/ خۆی بەخشی، خۆی تەرخان کرد.
براعة: مهارة/ چالاکی، وەستایی، سەلیقە.
بارع: ماهر/ چالاك، وەستا، بە سەلیقە، چاومار.
– ـة الجمال: فتّان/ زۆر جوان.
تبرُّع: تقديم إعانة/ هاوبەشی کردن، باریودان.
– : هبة/ بەخشین.
مُتبرِّع: واهب. بەخشندە، هاوبەش، باریودەر، خۆتەرخان کەر.
برعم:
برعم. تبرْعم: خرج بُرْعُمهُ/ چرۆی کرد، چوزی کرد، گۆپکەی کرد.
بُرْعُم. بُرعُوم/ چرۆ، شکۆفە، پۆخ، گۆپکە، گۆپیتە، چوز.
برغ:
برغث المكان: كثر فيه البرغوث/ کێچی هەڵ هێنا.
بُرغوث: حشرة/ کێچ.

— البحر: جمبري/ جەمبەری، کێچی دەریا.

بَرغَش: بَعوض صغير/ مێشولە وردە، خاکە، وڕە.

بُرغُل: جريش من الحنطة المسلوقة/ ساوەر.

— ناعم/ پیر خەنیلە، لەپە ساوەر، بروێش.

بُرغي. لولب/ برغو، جەڕ.

برق:

بَرَقَ: لمعَ/ درەوشایەوە، شەوقی دایەوە، تیشکی دایەوە.

— : تَحَيَّر و دَهَشَ فلمْ يَبْصُرُ/ بە شەوارە کەوت.

— ت و أبرقت السماء: ومضت السماء. چەخماخەی‌دا، بروسکەی دا.

— الرجل: تَوَعَّد/ هەڕەشەی کرد، توڕە بو.

— ت المرأة: تَزَيَّنَت/ ئارایشتی خۆی دا، خۆی رازانەوە.

أبْرق: اصابهُ البرق/ هەورە تریشقە لێی دا، تریشقە لێی‌دا.

— : أرْسَلَ برقيَّة/ بروسکەی نارد.

بَرْق: وميض السحاب/ چەخماخە، بروسکە، تریشقە.

— : تلغراف/ بروسکە.

— : الزركشة/ درەوشە، درەوشانەوە، ئارایشت.

— : فزعٌ و دهْشَة/ ترس و سەرسامی، سڵەمینەوە.

بارقة: سحابَة ذا برْق/ هەوری بە چەخماخە.

— أمل: قليل من الأمل تۆزێك هیوا.

برّاق: لمّاع/ درەوشەدار، شەوقدار.

بُراق: فرس مُجَنّح/ دولْدوڵ.

برقيَّة: رسالة تُرْسل بواسطة البرق/ بروسکە.

مُبرِّقة: آلة التلغراف تەلەگراف.

البروق من الرجال: الجبان/ پیاوی ترسنۆك.

الأبْرق: ما إجتمع فيه السواد و البياض ڕەش و سپی، ماش و برنج.

إبريق/ مەسینە، لۆلێنە، ئافتاوە.

— الشاي/ قۆری، کتلی، کتری، چاپەز.

— القهوة/ جەزوە.

— الشراب/ شوشەی شەراب، سوراحی.

— وطشت/ مەسینەو لەگەن.

برقَش: لَوَّنَ/ بۆیەی کرد، ڕەنگی کرد.

مُبرْقش: كثير الالوان/ ڕەنگاوڕەنگ.

برقش. أبو براقش ناوی مەلێکی بچوکی ڕەنگاوڕەنگە.

برْقعَ المرأة: البسها البُرْقع/ روی داپۆشی، پەچەی پێ گرتەوە.

تَبَرْقعت المرأةُ: لبست البُرقع/ روی خۆی داپۆشی، پەچەی گرتەوە، تارای گرتەوە، تارای دا بەسەریا.

بُرْقُع: نقاب/ پەچە، روپۆش، تارا.

برقوق. خوخ/ قۆخ.

— برّي. زعرور/ گوێژ.

برك:

برَك. إستبرك: نَخَّ. إستناخ/ چۆکی دادا، یخی دا.

برَك الماءُ في الارض: إستنقعَ/ گۆلی بەست، پەنگی خواردەوە.

— . أبرك الجمل: نخّ/ چۆکی دادا، یخی دا.

بارَك له: هَنأهُ/ پیرۆزبایی لێ کرد.

تبَرَّك. تباركَ به: إستبرك: تَيمَّنَ/ پیرۆزی کرد.

— به. طلب بركته/ داوای پیرۆز بونی لێ کرد.

برَك. بُروك: نخَّ/ یخ دان، بە چۆکدا هاتن، چۆك دادان.

— . صدر سنگ.

مبْرك. موضع البروك/ شوێنی مۆڵدانی حوشتر.

البَركَة: النعمة و السعادة/ پیرۆزی، خۆشی، بەهرەوەری، درود.

مُبارك: سَعيد/ پیرۆزین، پیرۆز.

بركة: مكان تجمع الماء. مستنقع الماء. ئەستێل، ئاوکۆ، سەراو، گۆل، گۆم.

— : الشاة الحلوبة مەڕو بزنی شیردار.

برّاك: طحّان ئاشەوان.

بركار: برجَل/ پەرگاڵ.

بُركان: جبل النار شاخی ئاگرین، ئاگرپژێن، گڕکان.

برْكَع. تَبرْكَعَ: وقع على عجزه/ بەقنگدا کەوت.

بُرْكُعُ: الرجل القصير کورتە بنە، پیاوی کورتە باڵا، گولە.

برل:

برلمان: مجلس النواب/ پەرلەمان، ئەنجومەنی نوێنەران.

برم:

بَرم. أبرم الحبل: فَتلهُ/ بایدا، لولی دا.

— . — الأمر: أحْكمهُ/ قایمی کرد، توندی کرد.

- . - : ضد نقضَ/ بەستی، بڕیاری لەسەر دا.

برم. تبَرَّم: سئِمَ و ضجر/ بێزار بو، قارس بو، بێتاقەت بو، جاڕس بو.

بَرْم. إبرام: فتْل/ بادان، لول دان.

- . - : إحكام/ قایم كردن، توندكردن.

- . - : ضد نقض/ بەستن.

بَرْمة. ليَّة/ بایەك، خولێك، بادانێك.

بريم. قيطان/ كشتەك، دەزوی بادراو.

بريمة: خُرّامة/ بەرینە، كون كەر، سمۆ، مەكتەبە.

مَبروم. بريم: مفتول/ بادراو، لول دراو.

مبرَم: مغْزل/ تەشی، بادەر.

إبرام: إحكام/ قایم كردن، توند كردن.

- المعاهدة: ضد نقض/ بەستن، پەیام بەستن، بڕیار لەسەردان.

تبَرُّم: ملل/ بێزاری، جاڕسی، قارس بون.

بُرمة: فُخار. گلێنە، گلێنەی سورەوەكراو.

- : من المعجنات/ برمە.

البَرَم: البخيل اللئيم/ پیسكە، ڕژد، دەس قوچاو.

برميل/ بەرمیل، بۆشكە.

برن:

بَرنامَج: منهاج/ پرۆگرام، بەرنامە.

- : فهرس/ ناوەڕۆك، پێرست.

بُرنُجُك/ برنجۆك.

بُرنز: مزيج النحاس/ زەرد، مەفرەق.

بُرنُس: ثوب راسه ملتصق به/ بەرگێكە كلاوەكەی بەخۆیەوە بێ.

- الحمام خاولی (حەمام، گەرماو)، ترنوس.

بره:

بُرهة: حين/ كات، ماوە، سات.

- : وقت قصير/ تاوێك، تاو، كاتێكی كەم، دەمێك.

برهَن: اقام البرهان/ سەلماندی، بەڵسای كرد.

بُرهان: حُجّة: دليل/ سەلماندن، بەڵسا، پارە.

بُرهى. للحظة فقط/ بۆ ماوەیەكی كەم.

برو:

بروتستانت/ پرۆتستانت، ئاینزایەكی دیانە.

برواز: اطار/ چێوە، چوارچێوە، چەمەرە.

بروستات: غُدَّة تحت القناة البولية/ پروستات، لوی بن میزەڵان.

بروليتاريا: الطبقة العاملة/ پرۆلیتاریا، چینی كرێكار.

بروميتر باروومەتر، باپێو.

برا:

برا: جعل في انفه البُرة/ لوتەوانەی كردە لوتی.

بُرة: حلقة او قرط يوضع في الأنف لوتەوانە، ئەڵقەیەكە ئەكرێتە لوت، غەزێم.

برى:

برى القلم و غيرهُ: نحَتَهُ/ دای دا، تیژی كرد.

- الشخص و الحيوان: هزَلهُ/ لاوازی كرد، لەڕی كرد، ڕەتانیەوە.

باری: سابقَ/ گرەوی كرد، پێش بڕكێی كرد.

- إمراته: صالحها/ ئاشتی كردەوە.

تباروا: تسابقُوا/ گرەویان كرد، پێش بڕكێیان كرد.

إنبرى له. تبّرى لمعروفه/ ئاكەس بەچە دەرچو، سپڵەیەتی كرد.

برّاءة. مبراة: مطوى چەقۆ، خامەتاش.

- . - . برّاية: آلة الحدّ/ تیژكەر، هەسان، بریەنگ.

مُباراة. مغالبة/ گرەو، پێش بڕكێ، پێش كەوتن.

الباري: الخالق/ دروستكار، كردگار، یەزدان.

- : ناحت/ تیژكەر، دادەر.

برى: تُراب/ خۆڵ، گڵ.

بريتون: غلاف الامعاء المخاطى/ تورەكەی ریخۆڵە، بەزی ریخۆڵە، هەناو، پریتۆنیۆم.

بز:

بزّ. إبْتزّ: سلب/ روتی كردەوە، سەرانەی سەند.

إبْتزاز: سلْب/ روت كردنەوە، سەرانە.

بَز: سلاح/ چەك.

- . ثياب القطن و الكتان جل و بەرگی لۆكەو كەتان.

بزّة: ثياب/ بەرگ، جل، كەل و پەل، كوتاڵ.

- : هيئة/ شێوە، روخسار، دیمەن، رواڵەت، سیما.

بزّاز: تاجر الأقمشة/ بازرگان، كوتاڵ فرۆش.

بُزّ. بزّ المرأة. ثديها/ مەمك، مەمكۆڵە، مەم.

— . — انثى الحيوان: ضرعها/ گوان.

— . — الرجل. كعب پاژنەی پێ، پاژنە.

— . — الخشب: أبنة. گرێ گرێی دار.

مُبزَّز: مُعَقَّدٌ. گرێ گرێ، گرێیاوی.

بزّازة الأطفال: رضّاعة مەمکە شوشە.

بزّ. سمك البزّ زەردە، ماسیە زەردە.

بزخ:

بَزَخ: خرَج صدره سنگی دەرپەڕی.

أبْزَخ/ سنگ دەرپەڕیو.

بزر:

بزَرَ الإناء: ملأه/ پڕی کرد.

— الحبَّ: زَرع تۆوی کرد، چاندی، رواندی.

— القدرَ: القى الأبزار فيها تام و بۆنی کردە مەنجەڵەوە.

بزْر: حبّ تۆو.

— . أبزار. أبازير. تابل. مايُطيَّب به الغذاء/ بەهارات، تام و بۆنی خۆش کە ئەکرێتە ناو خواردن.

بزراء. المرأة البزراء. كثيرة الاولاد/ شفتە ژنێکەر، ئافرەتی منداڵ زۆر.

بزغ:

بَزَغ: طلع/ دەرهات، هەڵهات، شەبەقی دا، سپێدەی دا.

— : إنبثق/ پڕا، دەرك بو، هاتەدەرێ، دەرپەڕی، تەقی.

بُزُوغ: ضد أفول. سەرکەوتن، بەرزبونەوە.

— : إنبثاق/ پڕان، دەرك بون، دەرپەڕین، تەقین.

— الشمس: طلوعها/ هەڵ هاتن، شەبەق دان، گزنگ دان.

مِبزاغ: آلة البَزغ. دەرك کەر، نەشتەر، چەقۆی پزیشکی.

بزق:

بزق: بصَق. تفی کردەوە، بەڵغەمی فرێدا.

بُزاق. بُصاق. تف، بەڵغەم.

بزّاقة: قوقعة مێلکە شەیتانۆکە.

— : مبصقة/ دۆلکەی تف.

بُزُق: طُنْبُور بوزق، ئامێرێکی سازە.

بزل:

بَزل. بَزَّل. ثقَبَ/ کونی کرد، کونی تێ کرد، دەرکی کرد، سمی.

— . — . شقَّ درِی، هەڵی دری، قڵێشانی، درزی تێ کرد.

— الأمر: أمضاهُ و قطعهُ/ برانیەوە، کۆتایی پێ هێنا، کارەکەی ئەنجامدا.

— : صَرَّف الماء ئاوەکەی رادا، ئاوەکەی دەرهێنا.

تَبزَّل. تَشقَّق/ قڵێشا، درزی دا.

بزْل: استخراج السائل و الهواء من البطن باکێشان، ئاوکێشان، دەرهێنانی باو ئاو لە ناو سك.

— : سحب الماء و الملح من الارض خوێ کێشان، ئاوەڕۆ کردن.

مِبزَل. بزال: مثقب. آلة البزل الطبي/ باکێش، ئاوکێش.

مَبزَل/ خوێ کێش، ئاوەڕۆ، خوێتاوگە، ئاوەڕۆگە، جۆگەی داشۆرگە.

بازِل: الرجل الخبير/ زانیار، دنیادیدە، کارامە، پسپۆڕ.

بزلاء: إمراة جيِّدة الراى. داهية/ زانیار، دنیا دیدە، کارامە.

بزليا. بزاليا من البقوليات/ پۆلکە.

بزى:

بزَىّ: اخ في الرضاعة/ برای شیریی، شیر برا.

أبْزَى (وهي بزواء): خرج صدره و دخل ظهره/ سنگ دەرپەڕیو.

باز. بازىّ: صقر الصيد. باز، هەڵۆ.

بست:

بستان: ارض فيها شجر و زرع/ باخ.

بُستاني: صاحب أو عامل البستان/ باخەوان.

بسر:

بسر: قطَّب وجْهَهُ/ روی گرژ کرد، خۆی مۆن کرد، دەم و چاوی دا بە یەکدا.

— . إبْتسرَ الخَبرَ: ذكره قبل وقته/ نوقڵانەی لێدا.

باسر: مُقطِّب الوجه مۆن، روگرژ.

بُسْر: البلح قبل ان ينضج/ خورمای نەگەییو، فەریکە خورما.

مُبْتسر: قبل أوانه/ نەگەییو، فەریك، کاڵ و کرچ.

باسور: مرض البواسير/ مایەسیری.

بسط:

**بسط:** وسَّع/ فراوانی کرد.

— : نَشَرَ/ بڵاوی کردەوە.

— : أبْدیَ/ دەری بری، خستیەڕو، رای گەیاند.

— **المائدة:** فرشها/ خوانی رازاندەوە، خوانی راخست، سفرەی راخست.

— **الأمر:** شَرَحَه/ رونی کردەوە، لێکی دایەوە، والای کردەوە.

— **ذراعه:** فتحها/ باڵی کردەوە.

— **یده:** مَدّها/ دەستی پان کردەوە، دەستی درێژ کرد.

— **ـه:** سرَّه/ دڵخۆشی کرد، دڵشادی کرد، پێخۆشحاڵی کرد.

— **ـه:** ضربهُ/ لێیدا، پیاکێشا، پیاماڵی.

— **السیف:** سلّه/ شمشێری (لە کالان) هەڵ کێشا.

— **المکانُ القوم:** وسعهم/ بەشی کردن، جێیان بوەوە.

— **العذر:** اقبله/ بیانوی قبوڵ کرد.

**بسَّط الحدید و غیره:** طرقه پانی کردەوە، کوتای.

— **الأمر:** جعله بسیطاً و سهلاً/ ئاسانی کرد.

**بسُط:** اصبح سهلاً/ ئاسان بو.

**إنبسط:** تمدَّدَ/ کشا، درێژ بو.

— : سُرَّ. إنْشَرَح. پێخۆشحاڵ بو، خۆش نود بو، شاد بو.

**بَسْط:** سُرور/ شادی، خۆشی، پێخۆشحاڵی، خۆش نودی.

— : مَرح/ شایی، ئاهەنگ، شادی.

— : مدّ/ فراوان کردن، پان کردنەوە، درێژکردن.

— : نشْر/ بڵاوکردنەوە.

— **الکسر:** صورته/ سەرە.

**بَسْطَة السُلَّم.** قرص الدرج/ پانتایی پلیکانە، پێچی پلیکانە.

**بساطة:** سذاجَة/ سادەیی، ساویلکەیی.

**بسیط:** ساذج/ سادە، ساویلکە، خاکی، هاموار.

— : سهل/ ئاسان، سوك.

— : سلیم النیَّة. دڵ پاك.

— **الکَفّ:** سَخّی/ بەخشندە، دەست بڵاو.

**معرفه — ـة/** ئاسیاویەکی کەم، سەرزاری.

**إنبساط:** سُرُور پێخۆشحاڵی، شادی، خۆشی، شادمانی.

— : تمدُّد/ کشان، فراوان بون.

**مبْسُوط:** مسْرُور. شاد، دڵ خۆش، پێخۆشحاڵ، روخۆش.

— : مضروب/ لێدراو، کوتراو.

— : ممتد/ راخراو، داخراو، درێژکراو.

— : سکران قلیلاً/ هەوای هەیە، سەری گەرمە، خەیاڵی هەیە، سەرگەرم.

— **فی وسعه:** میسور/ ساماندار، خۆش گوزەران، دەس رۆیو.

**بِساط:** سجادة. طُنْفُسهُ مافور، قاڵی، بەڕە، رایەخ.

— **الرحمة:** غطاء النعْش سەرتەرم.

**علی — البحث/** لەسەر خوانی قسەو باس، هەر لەو مەبەستەوە.

**بسیطة. البسیطة:** الارض/ زەوی.

**بَسْطرْمَة/** باستورمە.

بسل:

**بسُل:** شجُعَ/ ئازا بو، نەترسا وێرای.

**بسل. تبسَّلَ:** عبس گرژ بو. مۆن بو، دەم و چاوی دا بەیەکدا.

**إسْتَبْسَل:** إستقتل کۆڵی نەدا، نەترسا، نەبەزا، ئازایەتی نواند.

**باسل:** اسَد/ شێر.

— . **بسول:** شجاع/ ئازا، نەترس، نەبەز، دلێر، دلاوەر، نەبەرد.

**بسالة:** شجاعة/ نەترسی، نەبەزی، ئازایی، زات کردن.

بسم:

**بسَم. تبسَّمَ إبْتسم:** ضحك قلیلاً/ بزە گرتی، زەردەخەنە گرتی.

**باسِم. مُبْتسمْ** زەردە خەناوی.

**إبتسام. تبسُّم/** زەردە خەنە، بزە، بزەی لێو.

**بسّام. مبسام** دەم بە پێکەنین، روخۆش.

**مبْسَم:** فم. ثغر دەم، لێوار.

— **السجارة:** فُمّ ئاخزە جگەرە.

**بَسْمَل:** قال بسم الله ناوی خوای هێنا، بیسمیاللای کرد.

بش:

بَشَّ: إبتسم/ زەردەخەنە گرتی، بزە گرتی، پێکەنی، روی خۆش بو.
بشاشة: إنشراح. ابتهاج/ دڵخۆشی، روخۆشی.
بَشوش. باش. بَشّ. بشّاش: مُنْشَرِح/ روخۆش، دڵخۆش.
بشر:
بَشَرَ الجبن و الجوز و غيرهما: سَحَل/ وردی کرد، هاڕی، کوتای.
– الجلد: قشَر/ توێکڵی هەڵدا.
– العود و الثمر: قشَرَهُ، پاکی کرد، توێکڵەکەی لێکردەوە.
– الشَعْر: احفاه/ هەڵی گرت، مووەکەی هەڵ کێشا.
– الجراد الارض: أكل عليها/ خواردی، هیچی تیا نەهێشت.
– الأمر: اهتم به/ گرنگی پێدا.
– . بَشِرَ. إستبشر: سُرَّ/ دڵی خۆش بو، شادمان بو.
بشّر. اَبْشَر: بلّغ البُشرى/ هەواڵی خۆشی هێنا، مژدەی هێنا.
– بكلام الله.: وعظ/ ئامۆژگاری کرد.
باشَر العمل/ دەستی پێ کرد.
– الأمر: تَوَلاّه بنفسه، سەرەو کاری کرد، بەڕێوەی برد.
– المرأة: دخل عليها/ چوە لای، لاقەی کرد، دەستی لەگەڵ تێکەڵ کرد.
إستَبْشَر: تفاءل بالخَيْر، نوقڵانەی خۆشی لێدا، مژدەی دا.
بِشْر: سُرور/ خۆشی، شادی.
بَشير: نذير، مژدەهێن، دڵخۆشکەر، پیاوچاك.
– : مُبشِّر بالخير/ مژدە دەر، دڵخۆشکەر.
– الوجه: جميله/ جوان، روخۆش، ئێسك سوك.
بِشارة. بَشاره. بُشرى: الخير و الفرح/ خۆشی، هەواڵی خۆش.
– خَيْر: فأل حسن/ نوقڵانەی خۆشی، مژدانە.
بُشارة. ما يُعطاه البشير، مژدەدان، مزگێنی.
تبشير: إبلاغ الخبر السار، هەواڵی خۆش گەیاندن، مژدە.
– بكلام الله: وعظ/ ئامۆژگاری کردن.
مُبشِّر. بشير/ مژدەهێن، پیاوچاك.
مُستَبْشِر. متفائل، رون بین، گەش بین.
بَشارة: الجمال/ ئێسك سوکی، روخۆشی، جوانی.
تباشير: أوائل/ سەرەتا، نۆبەرە.
– الصُبْح: أوّله/ بەیان، بەرەبەیان.
مُباشر: على طول/ یەکسەر، راسەوخۆ.
غير – : أعوج به پێچ، ناڕاستەوخۆ، لار.
مُباشرةً. رأساً/ یەکسەری، راستەوخۆ، سوریەسور، گەرماوگەرم.
بشرة: ظاهر الجلد. أدمة/ روی پێست، توێخ.
مبْشرة: مَبْرشة/ پاك کەر، رنەك.
بشَرْ: إنسان/ مرۆڤ، ئادەمیزاد، مرۆ، مەردم.
ابو ال – : آدم/ ئادەم، باوکی مرۆڤ.
بشري: أنساني/ مرۆڤی، ئادەمی.
– : مختص ببشرة الجلد/ پزیشکی پێست، لە پێست زان.
بشرية: الجنس البشري. ناس/ مرۆڤ، خەڵك و خوا، ئادەمیزاد.
بشع:
بَشِعَ. بَشُعَ: صار بشعاً/ ناشیرین بو.
استبشع: إستَقْبحَ/ خۆی ناشیرین کرد، ئێسکی خۆی قورس کرد.
بشع. بشيع: قبيح/ ناشیرین، ئێسك قورس.
بَشاعة: قُبح. ناشیرینی.
بشق:
باشق: من الجوارح/ شاهێن، بازۆڕێ، واشە.
بشك:
بشكير: قطيلة/ خاولی.
– الحمام/ خاولی حەمام.
بشّاك: كذّاب/ درۆزن.
بشم:
بَشم. اَبْشَمَ من الطعام: اتْخَمَ/ تێری خوارد، زۆری خوارد، مڕ بو.
بشَمْ: تُخْمَة/ تێتراندن، زۆر خواردن.

بشامة: بشّام، ئەو دارەیە کە چیلکەکانی بۆ دان

پاکردنەوە بەکار دێ، دان ئاژنە.

بص:

بَصَّ: بَرَقَ/ درەوشایەوە، بریسکایەوە.

— : نظرَ/ سەیری کرد، تەماشای کرد.

بصَّة: نظْرة/ سەیرکردنێك، تەماشاکردنێك، نیگا.

— نار. بصْوَة/ پزیسك، تروسکە.

بصیص: بَریق/ تروسکە، بریسکە.

— من الأمل/ تروسکەیەك هیوا.

بصّاصَة: عیْن. چاو، بینەر، دیدە.

بصْبص بِذنَبِه: حرّكهُ/ کلکە لەقێی کرد، کلکی جولان.

— الرَّجُلَ: تملّق. مەرایی کرد، ماستاوی کرد.

— بعینه: هجّل/ چاوی داگرت.

بصر:

بصر. اَبْصر: رأی/ بینی، چاوی پێکەوت.

— . — : علم/ زانی، پێی زانی.

بصَّر: فتح عینه/ چاوی کردەوە، چاوی پشکوت.

بصَّرَهُ. عرَّفهُ/ پیشانی دا، پێی ناسان.

تبصَّر. إسْتَبْصر: تأمل. لێی وردبووەوە، بیری

لێکردەوە، سەرنجی دا، تێی روانی.

إسْتَبْصر: إستبان و وضح/ دەرکەوت، ئاشکرا بو، زانرا.

البصَرُ. الباصرة: حاسة النظر. العین. چاو، بینە،

بینایی، بینین، هەستی بینین.

— : العلم/ زانیاری، زانست.

فُقدان الـ — عَمی/ کوێر بون، کوێرایی داهاتن.

طویل — : بَعید النظر/ دووربین.

قصیر— : قصیر النظر/ نزیك بین، کورت بین.

کَلَمْح — : فی لمح البصر/ لە چاو تروکانێکدا، وەك چاو

تروکان.

مَدی — : مَرْمی البَصر/ چاوبڕکردن، ماوەی بینین.

بَصَری: مختص بالبصر/ بینابیەوان، پسپۆری بینایی.

تَبصُّر: ترَوٍّی/ هێمنی، لەسەرخۆیی، ژیری، بیرکردنەوە،

چاك بینی.

بصیر: فطن/ زرنگ، چاوکراوە، زیرەك، کارامە.

بَصیرة: عقل. فِطْنة/ زرنگی، چاوکراوەیی، زیرەکی،

کارامەیی.

— : حُجّة/ بیانو، بروبیانو.

بصّارة. مُبصِّر: الذی یری البخت. فالْ گرەوە، بەخت

گرەوە.

مَبْصر. مَبْصرة. دلیل. بەلگە.

بصرة: الارض التی فیها الحجارة رخوة. زەوی بەردە

رزیو.

بصرتان. مدینتی الکوفة و البصرة/ شاری بەسرەو

کوفە.

بصق:

بصق: تفل/ تفی کردەوە، بەلغەمی فرێدا.

بُصاق: تُفال/ تف، بەلغەم.

مبْصقة: متفلة/ دۆلکەی تف.

بصل:

بصل: نبات معروف/ پیاز، پیواز.

— اخضر/ تەرەپیاز.

— الزرع/ فیسقە، پیازی فیسقە، خسکە.

بصلة. سەلکەپیاز.

لا یُساوی — / پیازێك ناهێنی، هیچ ناهێنێ.

بصم:

بصم: وسم/ پەنجەمۆری کرد، شەقلّی کرد.

— بالختم: ختم/ مۆری کرد.

بَصْمَة: وسْمٌ/ مۆر.

— الأصبع/ شەقلّی پەنجە، نەخشی پەنجە،

پەنجەمۆر، تەپل.

بصا:

بصوة: جمْرة. پشکۆ، سکلّ.

بض:

بضّ. باضّ. بضیض: ناعم الجلد. پێست نەرم.

بضع:

بضَعَ: شَرَحَ/ هەلّی دری.

— : قطَعَ/ بڕی.

— . تبضَّع: تسوّق/ کڕی.

الباضع: السیف القاطع/ شمشێری تیژ.

مبضع: آلة يُشقّ بها الجلد/ نەشتەر.

بِضْع: بضعة: قليل. يسير/کەم، کەمێك، هەند، چەند.

بِضاعة: سلع/ کەل و پەل، کوتاڵ.

تَبَضُّع: تسوُّق، کڕین و فرۆشتن، بازاڕ کردن، کڕین. ,

بط:

بطُّ الجَرْحَ: شَقَّهُ/ هەڵی دڕی، بڕی، دەرکی کرد.

– البطنَ: اخرج امعائها/ ورگی هەڵ دڕی، ریخۆڵەی دەرهێنا.

مبطّ: آلة يبط بها/ نەشتەر.

البطّ: طير مائي/ مراوی.

بطّة/ مراویەك.

بطْبَط البطّ: غاص في الماء، خۆی کرد بە ئاوا.

– البطّ: صات قیڕانی.

بطاطا: نبات/ پەتاتە.

بطأ:

بطؤ. أبْطأ: تَأخَّر/ دواکەوت.

– . – . تباطأ: توانی/ خۆی دواخست، تەمەڵی کرد، خاوەخاوی کرد.

بُطْء: تَأخُّر/ دواکەوتن، پاش کەوتن.

– : توانٍ/ تەمەڵی، تەوەزەلی، خاوو خلیچکی، سستی.

ببطء: في مهل/ لەسەرخۆ، بەخاوی، بە ئەسپایی، وردە وردە.

بطيء الحركة/ خاو، خاو و خلیچك، هێواش، خرس، سست.

– : متوان تەمەڵ، تەوەزەل.

بطارية/ پاتری، پیل.

بطح:

بطح: القى على الارض/ فڕێی دایە سەر زەوی، فڕێیدا.

– ـه: القاه على وجهه/ کوتای بەزەویدا.

– الراس: جَرَحَهُ/ سەری شکان، سەری بریندار کرد.

إنبطح: إنطرح على وجهه، بەدەما راکشا، لە پەورِوکەوت.

مُنْبطِح. باطح: مستلقي على وجهه، بە دەما را کشاو، لە پەوڕو کەوتو.

– : مستلقي على ظهره، بەگازی پشتاکەوتو.

إنبطاح. تَبَطُّح/لە پەوروکەوتن، لەسەر پشت کەوتن، راکشان.

بطحاء. بطيحة: مسيل. وادي/ چەم، چەمی پڕ لە چەوو خڕکە.

بَطْح: إستلقاء/ راکشان، بەدەما کەوتن، لە پەوڕوکەوتن، بەگازی پشتدا کەوتن.

ب

بطخ:

بطِّيخ: نبات/ کاڵەك، کندۆرە.

– اصفر. شَمّام/ شەمامە.

بطر:

بَطَر: شَقَّ/ قڵیشانی.

بَطِر النِعْمَةَ. طغى بالنعكة/ لەخۆی بایی بو، زەڕی.

بيْطَر الدابّة: نَعَّلها/ ناڵی کرد، ولاخەکەی ناڵ کرد.

– الدابة: عالجها/ تیماری کرد، ولاخەکەی تیمار کرد.

بطِر: الطاغي بالنعمة. المتكبر/ بایی، لەخۆبایی.

بَطرٌ: الاستخفاف بالنعمة/ لەخۆبایی بون، ناقابیلی، بێزاری، زەڕین، پێنەزانین.

بطراً: باطلاً و هدراً/ فیڕۆ، خۆڕایی.

ذهب دَمَهُ – : باطلاً و هَدْراً/ خوێنەکەی بە فیڕۆ چو.

مبطور. بطير: شقوق/ قڵیشاو.

بيطرة: تنعيل الدواب/ ناڵ کردن.

– : الطب البيطري/ تیمار کردن.

بَيْطرى. مختص بمعالجة الدواب/ بەیتاڵ.

بَيْطار. طبيب بيطري/ پزیشکی ئاژەڵ.

– . مُبيطر، ناڵ بەند.

بطرير. طويل اللسان/ زمان درێژ.

بطريق: طير، پەتریق، پەنگوین.

بطريك: رئيس رؤساء الاساقفة. پەتریك، پلەیەکی بەرزی ئاینی گاورەکان.

بطل:

بَطَل: صار مُلغىً/ هەڵ وەشایەوە، پوچ کرایەوە.

– : ذهب خُسراً و ضياعاً/ بە فیڕۆ چو، بەخۆڕایی ڕۆیشت.

– عمله: تعطّل/ وازی لە ئیش هێنا، ئیشەکەی وەستا.

– إستعماله. لا يستَعمَل/ له كار كەوت، له ئیش
وەستا، بەكار ناهێنرێت.
– في كلامه: هزل/ گاڵتەی كرد.
بَطُلَ. كان (وصار شُجاعاً/ ئازابو، بو بە پاڵەوان.
بَطَّلَ. أبْطلَ. الغي/ وازی لێ هێنا، وازی هێنا، دەستی هەڵ
گرت.
– . – : نقضَ. فسخَ/ هەڵیوەشاندەوە، تێكیدا.
– ـه: أنهي عمله/ دەری كرد، دەستی لەكار كێشایەوە.
تَبَطَّلَ: تشَجَّعَ/ غیرەت گرتی، ئازا بو، ئازایەتی جوڵا.
إبطال: إلغاء/ هەڵوەشاندنەوە، پەك خستن، دامركانن، كپ
كردن، پوچ كردن.
بُطْل. بُطلان: كذب/ درۆ، هەڵ بەست،
– . – : عديم الفائدة/ بێسود، پوچ، بێكەڵك،
بێكار.
باطل: ضد حَقّ/ درۆ، ناڕەوا، ساختە، نادروست.
– : كاذب/ درۆزن.
– : عديم القيمة/ بێبایەخ، بێ نرخ، هیچ ناهێنێت.
– : عبث/ خۆڕایی، فیڕۆ، هەوانتە.
– : عديم التاثير/ بێكار، نابەكار، ناكاریگەر.
تُهمة باطلة/ تاوانێكی درۆ، تاوانێكی ناڕەوا.
باطلاً. عبثاً/ بەخۆڕایی، ناڕەوای، بەبێ هۆ.
بطّال. لا عمل لديه/ بێ ئیش، بێكار، دەست سپی.
– . رديء/ بێكەڵك، خراپ.
بطالة. عُطلة. إجازة/ پشو.
– ضد شغل/ بێ ئیشی، بێكاری.
بَطَل. شجاع/ پاڵەوان، ئازا، قارەمان، دلێر، جوان مەرد.
بطالة. بُطولة: شجاعة / پاڵەوانێتی، ئازایەتی،
قارەمانێتی، دلێری.
بطم:
بُطْم. شجرة التربنتين/ قەزوان، دارقەزوان، دارە بەن.
بطن:
بَطنَ. بطن: عظُمَ بطنَهُ/ ورگی زل بو، ورگن بو، سكی زل
بو، سكی هات.
بَطُنَ: خفيَ/ شاردرایەوە.
إبْطن: أخفي/ شاریەوە.
بطّنَ الثوب و غيره. جعل له بطانه/ بەری بۆ كرد، بەری
پیاگرت، ناوی بۆ كرد.
تبَطّنَ. إستَبْطنَ. عرف باطنه/ زانی، بە نهێنیەكانی زانی،
لای ئاشكرا بو.
بطْن: مأنة/ سك، ورگ، گەدە، زگ.
– : جَوف/ ناو، ناخ.
– الرجل: أخمص القدم/ بنی پێ، قوڵایی بنی پێ.
– الارض/ ناخ، ناخی زەوی، قوڵایی زەوی.
– عائلة/ خێڵ، بنەتیرە.
إبن – ـه: نهم/ زۆرخۆر، چڵێس، ورگ دڕاو، حەفیان لوش.
استطلاق الـ – : اسهال/ سكەشۆرە.
تضخم او انتفاخ الـ – / سك هاتن.
بُطَيْن / سكۆڵە.
– ايسر/ سكۆڵەی چەپ.
– ايمن/ سكۆڵەی ڕاست.
بِطنه: شرَه/ زۆرخۆری، چڵێسی، سك دڕاوی.
بطين. بطنْ. مبطان. كبير البطن/ ورگن، ورگ زل، ورگ
داكەوتو، ورگ هاتو.
– : شره/ زۆرخۆر، چڵێس، ورگ دڕاو.
باطني: داخلي. جَوّاني/ ناوەكی، له ناوەوە، لەژێرەوە.
– : خفي/ نهێنی، شاردراوە.
امراض باطنية/ نەخۆشی (ناوسك، دەرون، ناوەكی)،
مەناوی.
باطنياً: داخلياً/ له ناوەوە، له ناخەوە، له ژێر ەوە.
باطن. بَطن: داخل/ ناو، ناوەرۆك.
– : خفي/ نهێنی، شاردراوە.
بطانة الثوب: خلاف ظهارته/ بەری جل، بەر، ناوپۆش.
– : حاشية/ دەست و پێوەند.
بطان: حزام بطن الدابّة/ قەیاسە، قایش قەیاسە، تەنگە.
بطناً لظهره. مقلوب: معكوس/ هەڵاو گەڕاو.
بَطّانية: دثار/ پەتو، بەتانی.
بُطْنُج: نبات/ پونگە.
بظر:
بَظْرُ الانثي: من اعضاء تناسل الانثي/ قیتكە، میتكە.
بعبع:

بغبغ: ثرثر/ چەنەی دا، چەنەبازی کرد، زۆری وت.
بَغبَغة. تتابع الكلام في عجلة/ قسەکردن بە (پەلە، خێرایی).
بَغبُغ. تخويفة خێو، درنج، دێو.
بعث:
بعث. ارْسل/ ناردی.
— . اوْفدَ/ ناردی، نوێنەری نارد.
— . ايقط/ هەڵسا، راپەڕی.
— . بَعثَهُ من نومه: ايْقظه/ هەڵیسان، خەبەری کردەوە، بێداری کردەوە.
— : اخْرجَ. قذفَ/ دەرپەڕی، هاتەدەری.
— على: دفع/ هانی دا، جوڵانی.
— من الموت/ زیندو بوەوە، ژیایەوە، لە مردن گەڕایەوە.
إنبعث: إنبثق. خَرجَ/ دەرپەڕی، هاتەدەرێ.
— من الموت/ زیندو بوەوە.
بَعْث. إرسال/ ناردن، رەوانە کردن.
— : قيامة الأموات/ زیندو بونەوە، ژیاندنەوە، هەڵسانەوەی مردوان.
— : خروج/ دەرپەڕین، دەرچون.
— . بعْثة/ نوێنەر، ناردە، نێرراو.
باعِث. مُرسل/ نێرەر، بنێر.
— : سببٌ. دافع/ هۆ، هاندەر.
مبعوث. بَعيث: مُرْسل نێردراو.
— : رسول/ نوێنەر.
إنبعاث: إنبثاق دەرپەڕین، هاتنەدەر.
بَعثَرَ: بدَّدَ/ بڵاوی کردەوە، پەرشی کرد.
مُبَعْثَر: مُبدَّد/ بڵاو، پەرش و بڵاو، بڵاوکراو.
بعج:
بَعجَ البطْنَ: شَقَّهُ ورگی هەڵ دڕی.
— : جعَلَ فيه نُقْرة/ قوپانی، چاڵی کرد.
بَعْجَة: نُقْرة/ قوپاوی، چاڵ.
بعد:
بَعُد. بعد: ضد قرُبَ/ دورکەوتەوە.
ابْعد. بعَّد: ضد قرّبَ/ دوری خستەوە.
— : عَزَلَ/ جیای کردەوە، لایدا.
— : طرَدَ/ دەری کرد.
— : نفى دوری خستەوە، شاربەدەری کرد، رەهندی کرد.
— : اقصى/ لای برد، دەری کرد، دوری خستەوە، دەستی کێشایەوە.
— : أزال/ نەی هێشت، لای برد.
— : إسْتبْعدَ. إستثنى. پەڕانی، جیای کردەوە، بواردی.
إستبعد: حَذَفَ/ لای برد، دەریهێنا.
— الأمرَ/ بەدوری زانی، وای دانا کە رێی تێ ناچێ، ناشێ.
— الشيَ: ظنَّهُ بعيداً/ بەدوری دانا.
إبْتعَد. تباعَدَ: تجَنبَ/ دورکەوەوە، خۆی لادا، دورە پەرێز وەستا.
— . — : فارَقَ/ جیابوەوە.
بُعد: ضد قُرب/ دوریی.
— : مسافة/ ماوە، میانە.
— نقطتين: المسافة بينهما/ ماوەی دو خاڵ، ئەو هێڵەی لە نێوان دو خاڵدایە.
عن — : من بعيد لە دورەوە، دورە پەرێز، دوراودور.
على — : بعيداً/ لە دوری.
بُعْدَي الشكل/ درێژی و پانی، دولای شێوە.
ابعاد الشكل درێژی و پانی و بەرزی، لاکانی شێوە.
متساوي الـ — / پەل چون یەك، هاودوری.
بعيد: ضد قريب/ دور.
من — / لە دورەوە، دوراودور.
ابعد. اكثر بُعداً دورتر.
الأبعد: الأقصى/ زۆر دور، دورترین.
إبعاد: عزل/ لابردن، دورخستنەوە، جیاکردنەوە.
— : نقل/ گوێزانەوە، گواستنەوە، دورخستنەوە، رەهند کردن.
— . إستبعاد: حذف لابردن، بواردن، پەڕاندن.
بعدُ: ضد قبْلُ/ پاشان، دوایی.
— : ثُمَّ/ پاش ئەوە، دوای ئەوە، ئەویتر، ئینجا.
— : للآن/ تا ئێستا، هێشتا.
من — / لە پاشان.

ب

بَعد الآن/ دوای ئێستا، له دواییدا، لهمهودوا.
— ذلك/ دوای ئهوه.
— ئذٍ. بعدما/ دوای ئهوه، له دواییدا، دوایی.
— ان / پاش ئهوهی.
فی ما — / له دواییدا، دوای ئێستا، له پاشترا.

**بعر:**
بَعَّر. اِبْعر. تبعّر الحیوان: اخرج بعْرهُ/ پشقلی کرد، ریا، پیسایی کرد.
بعْر. بَعَر: بجیع/ پشقل، پیسایی.
مبْعر. مَبعَر: مخرج البعر/ کۆمی مالآت، کونی پیسایی.
بعیر. جَمل/ وشتر، حوشتر.

**بعز:**
بعْزق: بدّدَ/ به فیرۆی دا.
مُبَعْزق. بعْزاق: مُبذّر/ دهست بلاّو، به فیرۆدهر.

**بعض:**
بُعض: عضّهُ البعوض/ مێشوله گهستی.
بعّض: جزّأَ/ کهرتی کرد، دای بری.
بعوض. ناموس/ مێشوله.
بَعوضة. مێشولهیهك.
— الملاریا. مێشولهی لهرزو تا، ئهنۆفلس.
بعْضُ الشيء: جزء او قلیل منه/ پارچه، بهش، ههند، بڕ، ههندێك، کهرتێك، بڕێك.

**بعل:**
بعل الرجُل للمراة: صار بعْلها. بو به مێردی، ژنی هێنا.
بعلت المراة: صار لها بَعلاً. مێردی کرد، شوی کرد، هێنای.
باعل القوم قوماً: تزوج بعضهم الی بعض/ ژن و ژن خوزیان تێ کهوت.
تبَعلّت المراة: اطاعت بعلها. پهیرهوی و به گوێی مێردهکهی کرد.
بعْل: زوْج/ مێرد، شو.
لها — . متزوجة/ بهشوه، شوی کردوه، مێرداره.
بعْلٌ من الارض: ارض دیم/زهوی دێم، پێچهوانهی بهراو.

**بغت:**
بغت. باغت: فاجأ/ کوتو پڕی کرد.
بغتةً. مُباغتةً: مُفاجاة. کوت و پڕی، ناکاوی.
— : فجاةً/ کوت و پڕ، ناکاو.
— : علی غرّةً/ به کوت و پڕی، له ناکاو، له پڕێکا، لهپڕ.
بَغتی. باغِت: فجائی/ کوت و پڕ، ناکاو.

**بغد:**
بغد. تبغْدد: خجل. إستحیا. شهرمی کرد، خۆی شاردهوه.

**بغش:**
بغش السماء: امطرت قلیلاً/ نمهیهك باری، رشێنهی کرد.
بغْشة: رذاذ. نمه، نمهباران، رشێنه.

**بغض:**
بَغض. بَغُضَ. بُغضَ: صار بغیضاً/ وایلیّ هات کهس خۆش نهوێ.
اِبْغض: کرِه/ رقی بوهوه، کینهدار بو.
بُغضٌ. بغضة. بغضاء: ضد الحب. کراهیَة/ رق، قین، کینه.
مُبْغضٌ. بغیض: مکروه/ بێزراو، ناخۆشهویست، کهس نایهوێ.

**بغل:**
بَغل: دابة بین الحصان و الحمار/ ئێستر، قاتر، هێستر.
بَغّال: صاحب اوسائق بغال. ئێسترهوان، قاترچی، مهیتهر.

**بغی:**
بغی. إبتغی. رغب فی. طلب. ویستی، حهزی کرد، ئارهزوی کرد.
— علیه: ظلمهُ/ زۆری لیّ کرد، ئازاریدا، دهست درێژی لیّ کرد.
— : زنی/ داوێن پیسی کرد.
ینْبغی: یلزم/ پێویسته.
— علیه: علیه ان/ پێویسته لهسهری، لهسهریهتی که.
بغیة. بغیَة. بُغاء. إبتغاء: رغبة. ما یُرغب فیه/ ئارهزو، ههوهس، ویستن، نیاز، ئاوات، هیوا، خۆزگه.
مبْتغی: مرغوب فیه/ ویستراو، پهسهند.
بغي: ظُلم/ زۆرداری، زۆر، ستهم، جهور، ناڕهزایی.
— . بُغاء: زنی/ داوێن پیسی.

باغ: ظالم/ زۆردار، ستەمکار، گەردن کەش.

بغيٌّ: زانية/ سۆزانی، داوێن پیس.

بق:

بَقّ النبْتُ: طلع/ دەرهات، روا.

— الماءُ: قذف بشده، دەرپەڕی، فیچقەی کرد، هەڵ قوڵی.

— بقّقَ البيتُ: كثُر بقّهُ/ مێشوله زۆر بو.

البقّ: حشرة/ مێشوله.

— الدقيقي: آفة زراعية دۆوکه، بەڵخه سپیکه.

شجرة — : دردار/ داره رەش.

بقْبقَ الماء: صوّت/ بلّقه بلّقی کرد.

— الرجل: ثرْثرَ/ چەنەی دا، چەنەبازی کرد، فلّقه فلّقی کرد.

بَقّاق. بقباق: ثرثار چەنەباز، زۆربلّێ، هەڵەوەڕ، سازندە، سازنگە.

بُقّ: فمّ دەم، زار.

— : جُرعة/ قوم.

بقج:

بُقْجة: صرّة/ بوخچە، پڕپاسکە.

بقد:

بقد و نس: نبات. مەعدەنوس.

— برّي/ زورك.

بقر:

بَقَر: شقّ/ هەڵی دڕی.

بقَر: جنس البقر/ رەشه وڵاخ، گاو مانگا.

— وحشي/ گا كێوی.

ثور الـ — / گا.

لَبَن الـ — ، شیری مانگا.

لحم الـ — / گۆشتی گا.

بقَرة/ مانگا، مانگایەك، چێڵ.

— الماء/ مانگای ئاوی.

بقّار: صاحب البقر/ خاوەن رەشه وڵاخ.

— : راعي البقر/ گاوان.

باقر. باقور: جَماعة البقر/ رەوه، گاگەل، رەوگ.

بقع:

بَقِعَ الثوبُ. تَبقّع: ترك فيه بُقعاً. اصابته بُقع پەڵاوی بو، پەڵەپەڵە بو، پەڵەی گرت، بواردی.

بُقعَة: لُطخَة/ پەڵە، پینه.

— : مكان/ شوێن، جێگە، هەرێم، پەڵەزەوی.

ابْقع اللون: ابرش/ پەڵاوی، بەڵەك، منجڵ.

البقْعَة: مستنقع الماء/ زەلكاو.

بَقل:

بَقل النبْتُ نَبت/ روا، سەوز بو.

بقْل. بَقْلة: خُضَر/ سەوزە، سەوزی.

بَقّال. خضّار. خُضَري: بياع البقول/ سەوزە فرۆش.

باقلاء. باقلّى: فول. پاقله.

بقلاوة: عجين مرقوق/ پاقلاوە.

بقي:

بقي. دام/ بەردەوام بو، لەسەری رۆیشت، درێژەی هەبو.

— : مكث/ مايەوە.

— منه. تَبَقّى: فضل/ لێی ماوە.

ابقى. حجز/ هێشتیەوە، هێلایەوە.

— عليه . — على حياته: رَحمَهُ و شفق عليه/ بەزەیی پیا هاتەوە، هێشتییەوە، پاراستی.

إستبقى منه: ترك بعضه/ لێی هێشتەوە.

بقاء: دوام/ ماوە، خایاندن.

— : مكوث/ مانەوە.

— : خلود/ نەمری، جاویدی.

— الأنسب: بقاء الأصلَح/ مانەوە بۆ ئەوانەی ئەهێنن.

تنازع الـ — / کێشەی مانەوە، شەڕمان.

بَقيّة: جُزءٌ باقٍ/ ماوە، ئەوەی ماوە، لێ ماوە.

بقايا: فضلات/ پاش ماوە.

باقٍ: رصيد في الحساب/ ماوە، ئەوەی ماوەتەوە.

— : مستمر/ بەردەوام، یەك بینه.

— : الى الابد ابدي/ هەتاهەتایە، تاهەتا، تا دوایی.

— : دائم/ نەمر.. ماو، هەمیشە.

— على ارضه: غير محصود/ بەپێوەیە، نەدرواوەتەوە.

الحيّ الـ — : الله/ یەزدان.

إبقاء. استبقاء/ هێلانەوە، هێشتنەوە، دەست پیاگرتن.

مُتبَقّ. باقٍ/ ماوەتەوە، ماوە.

بكر:

بكر. بكّر: قام مُبكراً/ زو هەستا، زو هەڵسا.

– – : بدّر: أتاهُ بُكرَة زو هات، لە پێش کاتی خۆیدا.

إبْتكرَ: إستنبط داىهێنا.

– الشيء: أخذ أو أكل باكورته تۆبەرەی کرد، یەکەم جار لێی خوارد.

بكر. بكري. أول مولود لأبوية تۆبەرە، یەکەم منداڵ، یەکەم سك.

– : أول نتاج المواشي/ تۆبەرە، یەکەم زا.

– : عذراء کچ، کچی دەست لێ نەدراو، شو نەکردو، نەسمراو.

– : جديد نوێ، تازە، ناسك، نوخشە، تۆبەرە.

بكير. مُبكر: قبل أوانه زو، پێش کات.

باكورة الشيء: أوله تۆبەرە، نوخشە.

بُكرة. باكراً: غداً سبەی، سبەینێ.

– – : مُبكراً زو، بەیانی زو.

– : غداً صباحاً سبەی بەیانی، سبەینێ سەر لە بەیانی.

بكرية الولادة تلد أول مرة یەکەم جارە منداڵی ببێ، یەکەم جارە بزێ، تۆبەرە.

بكارة: عذرة کچێنی.

غشاء الـ – بن، پەردەی کچێنی.

إفتضاض الـ – بن پژان، بێ بن بون.

إزالة الـ – بێ بن کردن، بن پژاندن، پەردە درین.

بكْرة: جمع کل هەمو، هەموی، هەمویان.

على – أبيهم هەموی، بن و بێخیان.

بكرة بەکرە، پولی.

بكرَة الخيط خلۆکە، خلخلۆکە، خولخولۆکە، بەکرەی درومان.

بكم:

بكم: خرس/ لاڵ بو، زمانی بەسترا.

بكُم: سكت تعمداً بێدەنگ بو، خۆی لاڵ کرد.

أبكم: أخرس لاڵی کرد، بێدەنگی کرد.

أبكمُ: أخرس لاڵ، لاڵە پەتە.

بكمٌ: خرسٌ لاڵی.

بكى:

بكى. ناح. سال دمعه حزناً/ گریا.

– الميت: ناح عليه شینی کرد، شیوەنی کرد.

– بحرقة بە کوڵ گریا.

بكىَّ. أبكى. جعله يبكى گریانی، کردیە گریان.

تباكى: تكلف البكاء بە درۆوە گریا.

إستبكى. هيّج للبكاء هێنایە گریان، گریانی.

بُكاء: نواح گریان، نوکە، نوکە نوك، شین، شین و زاری، شیوەن.

باكٍ. في حالة البكاء گریاو، ئەگری.

بكّاء. كثير البكاء گرینۆك.

مُبْكٍ. مُبكّ: مُفجع، خەمگین، گرێنەر.

بل:

بل. حرف عطف بەڵکو، بەشکو.

بَلَّ: أعطى دای.

– : بلّل. ندّى تەڕی کرد.

– بكذا: ظفر به دەستی کەوت، پێی گەیشت.

– . إبتلّ. تبلّل. إستبَلّ من مرضه. شفى و صحّ/ چاك بوەوە.

بلّة: الرزق و الخير پیت، پیت و بەرەکەت، فەڕ، پیت و فەڕ.

إبتلّ. تبلّل: تندّى. جرى فيه الماء تەڕبو.

بلّة. بلالة: ندوة تەڕی، شێ.

بلل. تبلُّل/ تەڕ بون، شێ گرتن.

مُبلّل. مُبْتَلّ. مبلول: رطب، شێدار، تەڕ، تەڕ بو.

بلّة. نضارة الشباب تافی لاوی، هەڕەتی گەنجی، سێرەی لاوی.

بليل. بليلة: الريح الباردة مع الندى بای ساردی شێدار.

بلاّن: خادم الحمام ناتر.

– : المغسل في الحمام جورنە.

بلّ: شفاء چاك بونەوە.

– : داهية زۆرزان، تێگەیشتو.

بلا: بدون. من دون بەبێ.

بلبل: هيّج. قلق/ وروژانی، سەری لێ تێك دا، هەژانی.

تبلبل: تهيّج وروژا، سەری لێ تێك چو، هەژا.

ب

**بلبالْ:** مُهَيِّج/ وروژێنەر، هەژاندن.

**بلْبلَة. بلبال: قلقْ/** وروژان، سەرکردنە سەر، سەر لێ تێکدان، شلەژان.

**مُبَلْبَل. قلق/** سەری لێ تێك چو، پشێوی، شپرزە.

**بُلْبُل: طير/** هەزار، بلبل.

— : **دوّامة/** مزراح.

— **الابرق/** لولە.

— / هەلوك.

**شنْطرةْ و** — / دارو هەلوك.

**بلج:**

**بَلجَ. أبْلج. تبلَّجَ. إنْبلجَ. إبْتلج الصُبْحُ: اشرق و اضاء/** شەبەقی دا، سپێدەی دا.

**بُلْجة: اول ظهور الفجر/** شەبەق، سپێدە.

**بلجَ الحقّ: وضح و ظهر/** راستی دەرکەوت، ئاشکرا بو، دیاری دا.

— **صدره: إنشرح/** دڵی کرایەوە، پێخۆشحاڵ بو.

**تبلّجَ: ضحك/** پێکەنی، کەنی، خەنی.

**بَلْج. بليج: طلق الوجه/** روخۆش، روکراوە، دەم بە پێکەنین.

**أبْلج. مُفْترِقْ الحاجبين/** برۆ بلاو.

**بُلْجة. بلْجة بَلجْ/** برۆ بلاوی، بلاوی برۆ.

**بلح:**

**بلحَ. يبُس** وشك بو، وشکی کرد.

**بَلوح. بالح/** وشك، بێئاو، زەوی بێ ئاو کە هیچی تیا نەروێ.

**ابلح النخلُ: صار عليه بلحاً/** خورمای گرت، بەری گرت.

**بلح: ثمر النخل قبل ان ينضج/** فەریکە خورما، خورمای نەگەییو.

**بلد:**

**بلَدَ: اقام به/** لێی مایەوە، تیا ژیا، نیشتەنی بو، تیا جێگیر بو.

**بَلَدْ. کل مکان من الارض** ولات، شار، جێگە، شوێن.

**بَلْدَة: مدينة/** شار.

— : **صدر/** سنگ.

**بَلْدان: بَصْرة و کوفة/** بە دو شاری بەسرەو کوفە وتراوە.

**بلاد: قطر. إقليم/** ولات، نيشتمان، ديار.

**بلَدی: وطنی/** خۆماڵی، نیشتمانی.

— : **وطنية/** نیشتمان گەری.

**بلدية/** شارەوانی.

**مجلس الـ** — ئەنجومەنی شارەوانی.

**بلُد. بلُدَ/** گێل بو، گەوج بو.

**تَبلَّد: صار بليداً/** گێل بو، گەوج بو.

**تبالد: اظهر البلادة/** خۆی گێل کرد، خۆی گێل نواند.

**بليد: أبْلدْ: غبی. احمق/** گەوج، گێل، کەودەن، گەلۆر، کۆڵ، تەپۆ، تەپۆلە.

**بلادة/** گەوجی، گێلی، کەودەنی، گەلۆری، کۆڵی.

**بلر:**

**تَبَلَّر. تبلْور: صار شبيهاً بالبلور/** بو بە بلور، وەك بلوری لێ هات.

**بلّور/** بلور، کریستاڵ، تەورك.

**بلُوری: مُتبلّر: کالبلّور** بلورین، وەك بلور.

**بلز:**

**إبليز. طين الابليز/** قوم، لمی ناو چەم.

**بلس:**

**بَلسْ: من لا خير عنده/** بێکەڵك، بێسود، نەگریس، بەد.

**إبليس: شيطان/** ئەهریمەن، شەیتان.

— : **شرير/** بەد، نەگریس.

**بلسم. تبلْسم: سكت عن فزع/** لە ترسا بێ دەنگ بو.

**بَلسمْ: مادە تُضمَّد بها الجراح/** دەرمانێکە ئەخرێتە سەر برین، جۆرە رووەکێکە.

**بَلْسنْ. بَلَسان: من الاشجار/** جۆرە درەختێکە، بۆنی لێ دەرئەهێنرێت.

**بلْس: عدس/** نیسك.

**بَيْلسان: من اشجار الزينة/** درەختێکە بۆ جوانی.

**بلش:**

**بلْشون/: مالك الحزين/** شینەشاهۆ.

**بلص:**

**بلص: اخذ عنوه/** زەوتی کرد، بەزۆر لێی سەند.

**بلْص: إغتصاب الاموال/** زەوت کردن، بەزۆر زەوت کردن و لێ سەندن.

بلط:

**بلّط. فَرَشَ بالبلاط**/ خشتی دانا، فەرشی کرد، خشت ڕێژی کرد.

**تَبْليط** خشت دانان، فەرش کردن، کاشی کردن، قیرتاو کردن.

**بلاطة. تربيعه بلاط** شتایگەر، خشتی ناوفەرش.

**مُبلّط**/ بەردڕێژ، کاشی، قیرتاو، کاشی کراو، قیرتاوکراو.

**بلاطة الضريح**/ کێل، بەردی گۆڕ.

**بلاط**/ کاشی، ناوفەرش.

— **الملك**/ کۆشکی شا، شانشین.

**بلّوط: من الاشجار. شجر و خشب**/ بەڕو، داربەڕو.

— **عفص**. دارمازو.

**شاه** — / کەستەنە، شابەڕو.

**بلطة: فأس**/ تەور، تەورزین.

بلع:

**بلع. بَلِع. إبتلع: إزْدَرَدَ**/ قوتیدا، هەڵی لوشی، لوشیدا.

**أبلع. بلّع: جعله يبلع**/ پێی قوت دا، پێی هەڵ لوشی.

**بلّع الطعام بالماء**/ بە ئاو قوتیدا.

**بلْع. إبتلاع: إزدراد**/ قوت دان، هەڵ لوشین، لوش دان.

**مبْلع: مجرى البلع**/ گەرو.

**مبْلع. بُلْعة: اكول**/ زۆر خۆر، بخۆر، قوت دەر.

**بُلْعُم. بُلْعُوم: مَزْرِد**/ گەرو

**إلتهاب الـ** — / خوروزەك، گەرو هاتنەوە یەك.

**بُلْعة: ثُقب الرحى**/ گەروی دەستاڕ، کونی دەستاڕ.

**بالوعة. بلاّعة. بَلّوعة: مصرف الماء القذر**/ زێراب، گونج.

بلغ:

**بَلَغ: وصل الى**/ گەیی، گەیشت.

— **الولدُ: أدرك**/ فامی کردەوە.

— **سن الرشد: أدرك**/ گەییە تەمەنی هۆشیاری.

— **الثمرُ: نَضج**/ پێگەیی، کامڵ بو.

— **المقدار كذا: وصل الى**/ کرییە ئەوەندە، گەییە ئەوەندە.

— **ه كذا: علم به**/ زانی، پێی زانی، پێی ڕاگەیەنرا.

**بلّغ. ابلغ الخبر: أوصله** گەیانی، هەواڵەکەی گەیاند، ڕای گەیاند.

— . — : **اخبر**. پێی وت، ئاگاداری کرد.

— — **عنه: خَبّرَ**/ خەبەری لێدا، ئاشکرای کرد.

— . — **عنه و شي به** بوختانی بۆ کرد، بوختانی بە دەمەوە کرد، بۆی هەڵ بەست، خەبەری لێدا.

**بالغ: غالى** پێوەی نا، فیشاڵی کرد، زیادەڕەوی کرد، هاشەو هوشەی کرد.

— : **اكتفى**/ قایل بو، تێر بو.

**مُبالغ: مغالى**/ پێوەنەر، خۆ هەڵکێش، فیشال کەر، هاشەو هوشەکەر.

**مُبالغة. مغالاة**/ پێوەنان، زیادەڕەوی.

**بلاغ: خبر**/ هەواڵ، ڕاپۆرت.

— : **إعلان**/ بڵاوکردنەوە، ئاگاداری، بۆ زانین، ڕاگەیاندن.

— : **رسالة**/ نامە، پەیام.

— : **إنذار**/ وریاکردنەوە، وریایی.

— **نهائي**/ دوا ئاگاداری.

**بالغ: ضد قاصر**/ هوشیار.

— : **مراهق**/ هەرزە، هەرزەکار، نابەکام، تۆلاز.

— : **تام النمو**/ پێگەیو، پێگەیشتو، هەراش.

**بلوغ: تمام النمو** پێگەیشتن، پێگەیین.

— : **إدراك الفرص**/ هەل دەستکەوتن، بەهەل زانین.

— : **إدراك سن الرشد**/ گەیشتن بە تەمەنی هوشیاری.

— : **مُراهَقة**/ هەرزەیەتی.

— : **وصول**. گەیشتن.

**بليغ. فصيح**/ ڕەوان بێژ، زمان پاراو، نایاب بێژ.

**جُرْحُ** — : **عميق** برینێکی قوڵ.

**خطاب** — : **فصيح. مُؤَثر**/ وتەیەکی (ڕەوان، بەجێ، کاریگەر).

**بلاغة: فصاحة**/ زانیاری، بێژان.

**علم البلاغة**/ ڕەوان بێژی، نایاب بێژی.

**إبلاغ. تبليغ**/ گەیاندن، پێگەیاندن، پێوتن، ئاگادارکردن، ڕاگەیاندن.

**تبليغ**/ پێ ڕاگەیاندن، پێوتن.

**ورقة التبليغ**/ ڕاگەیاننامە.

مُبَلِّغ: مُخَبِّر/ گەیەنەر، پەیام بەر، پێڕاگەیێنەر.

— : واشٍ. فتّان/ سیخوڕ، بوختان کەر.

بُلْغَة. کفاف/ قایل، تێر، بەرچاو تێر.

مَبْلَغ. قَدْر. کمیة/ بڕ، هەند.

— . حَدّ الشيء و نهایته/ کۆتایی، سنور.

بَلْغَم. نفاثة الصدر/ بەلغەم.

بلق:

أَبْلَق. بُلْقَة: في لونه سواد و بیاض/ بەڵەك، ماش و برنج، ڕەش و سپی، بازوو.

بله:

بَلِهَ: ضعف عقله و عجز رأیه/ تێك چو، گێژ بو، وڕ بو.

أَبْلَهُ: ضعیف العقل/ گێژو وێژ، کەودەن، وڕ، مێشو، گێل، گەمژە، دەماخ سز.

بَلَه. بلاهة: ضعف العقل/ گێژو وێژی، کەودەنی، وڕی، گێلی، گەمژەیی.

بلهارزیا: نقیری/ نەخۆشی بەلهارزیا، خوێن میزکە.

بلی:

بَلِيَ الثوب: صار رثاً/ ڕزی، شڕو وڕ بو، شی بوەوە.

— : نَخِرَ/ پوکایەوە.

— : فَسَدَ. تعفّن/ بۆگەنی کرد، تێك چو، خراپ بو، ڕزی، گەنی.

ابلی: صیره بالیاً/ ڕزانی، شڕو وڕی کرد، شیکردەوە.

بالٍ: رثّ/ ڕزیو، شڕ، شی، پوکاو، ڕزۆك.

— : متعفن/ بۆن کردو، گەنیو، گەندەڵ.

— : ناخِر/ پوکاوە.

بِلو: القدیم البالی/ کۆن و ڕزیو.

إبْتَلی. بُلِيَ بمصیبة: أُصیب بها/ توش بو، تێوە گلا، دوچار بو، گرفتار بو، گیرۆدە بو.

ابتلاء: توش بون، تێوەگلان، دوچاربون، گرفتار بون، گیرۆدە بون.

بَلْوی. بلیَّه. بَلاء. محْنة. مُصیبَة/ بەلا، کوست، کارەسات، مەرە، وەی.

بالی: إهتم. اکترث/ بە تەنگەوە هات، گوێی پێدا.

مبالاة: إهتمام. إکتراث/ بە تەنگەوە هاتن.

لا — : عدم الاهتمام. عدم الاکتراث/ بە تەنگەوە نەهاتن، گوێ نەدان.

مبال: مکترث/ بە تەنگەوە هاتو، ئاگادار.

بَلی: نعم/ بەڵێ، ئێ، ئا، هۆو.

بلیون/ هەزار ملیۆن لە ئەمەریکا، ملیۆن ملیۆن لە وڵاتی ئینگلیز.

بن:

بَنَّن الشاة: ربطها لیسمنها/ دای بەست.

بنین: سمین/ دابەستە.

بُنّ: حب القهوة/ قاوە، قاوەی کاڵ، دەنکی قاوە.

— مسحوق/ قاوەی هاڕراوە.

بُنّی اللون/ قاوەیی.

بُنّی: سمك بُنی/ خرە سورە، سورە ماسی.

— : احمر داکن/ ئەسپی بۆر.

بنان: أطراف الاصابع/ پەنجە، سەری (پەنجە، ئەموست).

طوع — ه/ چاوەڕێی فەرمایشتە، هەر پەنجەیەك بجوڵێنێ.

علی أطراف — ه / لەسەر نوکی پەنجە.

بنج:

بَنَّج. نوَّمَهُ بالبنج. خَدّرَ/ بێ هۆشی کرد، سڕی کرد، نوانی.

بَنْج. نبات یستعمل للتخدیر. بەنج، بێهۆش کەر، بێهۆش داڕو.

بَنَج. رجع الی اصله/ گەڕایەوە بۆ (بنەچەی خۆی، نەژادیەتی خۆی).

بنجر: شوندر/ چەوەنەر.

— سکری/ چەوەنەری شەکر.

بند:

بَنْد. علمٌ کبیر/ ئاڵایەکی گەورە.

— . فقره من کتاب/ بەند، پارچە، بەش.

بُندُق: شجرة/ درەختی بوندوق، بندق.

بندقیة/ تفەنگ.

— رشّ/ ساچمەزەنگ، ڕەشۆکی.

مدینة الـ — / شاری بوندوقیە، ڤینیسیا.

بَنْدول رقاص الساعة/ بەندۆڵ، پانتۆڵ.

بَنْدير: دَفّ دەف.
- : طبل كبير دەهۆڵ.
بنص:
بنصر. الاصبع بين الخنصر و الوصطى برای توتە.
بنط:
بنطرون. سروال/ پانتوڵ، شەرواڵ.
- تحتاني/ دەرپێ، ئاوەڵ كراس.
- قصير/ بانتۆڵی كورت، دەرپێی كورت.
- الركوب/ بەرجیس، پانتۆڵی سواری.
بنطة. مثقاب/ بونتە، سمۆ، قەڵەم.
بنف:
بَنَفْسَج. نبات زينة/ وەنەوشە، بنەوشە.
بَنَفْسجي/ وەنەوشەیی، مۆر، خامەكی، بنەوشەیی.
بنق:
بَنَقة. بنيقة. رقعة في نحر القميص لتوسيعه/ گرۆڵە، بن قۆڵ.
بنك:
بُنْك. اصل/ بنەچە، نەژاد، رەگەز.
- العمر. عنفوانه/ تاف، هەڕەت، سێرە.
بَنْك. مصرف/ بانق، بەنك.
بنكرياس/ پەنرياس، ئالوی پەنكرياس.
بني:
بَنى. إبنتى. شَيّد/ دروستی كرد.
- الارض: عَمّر فيها داراً/ خانوی تیا كرد، خانوی تیا دروست كرد، زەویەكەی كرد بە خانو.
بِناء. بُنيان. تشيد/ دروست كردن، خانوكردن.
مواد الـ - / كەرەستەی خانو.
انقاض الـ - / داروپەردو.
بناء . بُنيان. بِناية مبنى: مُشَيّد/ خانو، بینا، ماڵ، دروست كراو، ساختمان.
بَنّاء: من كان حرفته البناء/ بەنا، وەستای خانو، خانوساز.
بَنى الكلمة. اعطاها صيغتها/ دایڕشت، وشەكەی لە جێی خۆیا دانا، سەرو بۆری بۆ كرد.
بُنية الجسم. تركيبه لەش، شێوەی لەش، قەوارە.
- الكلمة. صيغتها و مادتها/ داڕشتن و پێكهاتنی وشە.
بناء على: إستناداً الى/ بەپێی، بە گوێرەی.
بناء عليه: إستناداً اليه لەبەر ئەوەی، هەروەها، بە گوێرەی.
تبنّى. إتخذه إبناً/ كردی بە كوڕی خۆی، هەڵی گرتەوە، گرتیە خۆی.
إبن. الولد الذكر/ كوڕ، رۆڵە، منداڵ، زا، نێرینە، فرزەند.
- بطنه: همه مصروف اليه/ چڵێس، چی دەست ئەكەوێ بۆ خۆیەتی، ئەوسن، كوڕی ورگیەتی.
- جلا. الرجل المشهور/ پیاوی بەناوبانگ، ناودار.
- الطود. الصدى/ دەنگ دانەوە.
- ذُكاء. الصبح/ بەیانی، بەرەبەیان، سپێدە، تاریك و روون.
- السبيل. مسافر/ رێبوار، گەشتیار.
- السبيل: متشرد/ بەرەڵا، كۆڵانی، دەربەدەر، بێلانە، لانە شێواو.
- يومه. لا يفكر بغده/ كوڕی رۆژ، كەمتەرخەم، بێباك.
- غير شرعي. إبن حرام/ زۆڵ، بیژی.
- بالتبني: مُتَبنّى/ زڕ كوڕ.
- الإبن/ كوڕەزا.
- الاخ/ برازا.
- الأخت/ خوشكەزا.
- العم/ ئامۆزا.
- العمة/ پورزا.
- الخال/ خاڵۆزا.
- الخالة/ پورزا.
بنت: الولد الانثى/ كچ، كیژ.
- الارض الحصاة/ چەو، خڕكە، بەرد.
- الشفة. الكلمة/ وشەو قسە
- العنقود او الكرم. خمرة/ شەراب، بادە، مەی.
- العين. الدمعة/ فرمێسك.
- اليمن. القهوة/ قاوە.
- القنصل: من نباتات الزينة/ جۆرە گوڵێكە.
- الليل. الهموم/ پەژارەیی، خەم و خەفەت.
- وردان. صرصور/ سیسرك.

– الودن. لوزة الحلق/ ئالو.
– . عروسة: دمية/ بوك، بوكه شوشه.
– في ورق اللعب: الملكة/ كچ، ژن، شاژن.
إبنة. بنت/ كچ، زا، فرزەند.
– البنت/ كچەزا، كچی كچ.
– الأخ/ برازا، كچی برا.
– الأخت/ خوشكەزا، كچی خوشك.
– العم/ ئامۆزا، كچی مام.
– العمة/ پورزا، كچی پور.
– الخال خالۆزا، كچی خالْ.
– . الخالة/ پورزا، كچی پور.
تبنّ: إتخاذ الولد كإبن/ كردن بە كوڕی خۆ، گرتنەخۆ.
بن فلان. إبنه/ كوڕی (فلانە، فیسار).
ابناء. بنون. اولاد/ منداڵان، رۆڵە.
حروف المباني. حروف الهجاء/ ئەلف و بێ.
بنات الأرض. الانهار الصغيرة/ چەم و جۆگە، زێ.
– الدهْر: مُصيبة. نكبه/ بەلا ، كارەسات.
– الليل: عاهرة. مومس/ سۆزانی، ئافرەتی داوێن پیس.
– نعْش/ حەوتەوانە، حەوت برا.
بَواني. اضلاع الصدر/ پەراسوەكان.
– . قوائم الناقة/ چوار پەلی حوشتر.
بُنَيّات الطريق/ كوڵان و جادە بچوكەكان، كوچە.
بنيو. حوض الاستحمام/ بانیۆ.
بنّي. سمك بني/ خرە سورە.
بهت:
بَهَتَ بهِت. بَهُتَ. بُهِت دهش واقی وڕما، سەرسام بو، سەری سوڕما، هەڵ بزڕكا، راما.
– . إفترى عليه و كذب/ درۆی بە دەمەوە كرد، بوختانی بۆ كرد، بۆی هەڵ بەست.
بَهّتَ. باهت. اُدهش/ سەری سوڕمان، سەرسامی كرد.
بهوت: الذي يبهت السامع/ سەرسوڕهێنەر.
بُهْت. بَهيته. حيره سەرسوڕمان، رامان.
بَهّات. بَهوت: كذاب. مُفتري/ درۆزن، بوختان كەر، درۆ هەڵ بەست.

بهيتَة بَهت: بُهتان. كذب. إفتراء درۆ، دەلەسە، بوختان بە دەمەوە هەڵ بەستن.
باهت. مندهش. متحير. هەڵ بزڕكاو، سەرسام، واق وڕماو، سپی هەڵ گەڕاو، بزڕكاو.
بهج:
بَهج. أبْهج. سرّ: فرّح. گەشانیەوە، دڵی خۆش كرد، گەشكە داری كرد، گەشكەیی بو.
بَهج. إبْتَهَجَ. تَبهَّجَ. تَباهج: فَرِح و سَرّ. گەشایەوە دڵی خۆش بو، گەشكەداربو.
البهْجَة: السرور/ خۆشی، دڵخۆشی، ئاسودەیی، دڵشادی، روخۆشی، شادمانی.
– . رونَق/ درەوشانەوە، بریقانەوە.
بهيج. بهِج. مُبْهِج. سار مُفرح. دڵخۆشكەر، شەنگ.
مُبْتهج: مسرور دڵخۆش، ئاسودە، دڵشاد، گەشكەدار.
بهر:
بَهر الرجلُ. فاق اقرانه. پێش كەوت، سەركەوت، پێش هاوڕێكانی كەوت.
– ت المرأةُ. غلبت حسناً. جوانی بردەوە، جوانیەكەی برەوی سەند.
– القمر. أضاء. شەوقی دایەوە، تریفەی دایەوە.
– النظر: خطفَ البصر/ ئاوی چاوی برد، بە شەوارەی خست.
– . قذفهُ بالبُهتان. درۆی بە دەمەوە هەڵ بەست.
بُهر بصَرُهُ بە شەوارە كەوت، ئاوی چاوی داهات، چاوی رێشكەو پێشكەی كرد.
– . إنْبهر نفسهُ. انقطع نفسه من الاعباء/ هەناسەی سواربو، كەوتە هەناسەبڕكێ، پەكی كەوت لە هیلاكیا، هەناسەی وەستا.
أبْهر إستغنى بعد الفقر/ بوژایەوە، پاش كەم دەستی دەوڵەمەند بو، هەڵ گڕا.
– . جاء بالعجب شتی سەیری كرد.
– . تلون في اخلاقه/ بێباری نواند.
باهَر. فاخر خۆی هەڵ كێشا، لە خۆی بایی بو.
إبْتَهر إدعى كذباً/ درۆی كرد، خۆی هەڵ كێشا، لافی لێدا، گەزافی كرد.

**بَهَرَ الجرح: إتسَعَ**/ برینەکەی تەنیەوە، تەشەنەی کرد.

**بُهْر. إنقطاع النفس من الاعیاء**/ هەناسەبڕکێ، هەناسە سوار بون، تەنگەنەفەسی، نیخەنیخ.

**البَهار. الجمال**/ جوانی

– . **نَبْتٌ طیب الرائحة**/ روەکێکی بۆن خۆشە، چاوەگا.

– . **تابل**/ بەهارات، ئاڵەت و زەردەچەوە، داودەرمان.

**بُهار. صَنَم**/ بت، پەیکەر.

– . **قُطن محلوج**/ لۆکە یا پەموی شی، لۆکەی کراوە، هەلاجی کراو.

**باهر. یُبْهِر النظر**/ بریقەدار، بریسکەدار.

– . **فاخر**/ هەڵ کەوتو، نایاب.

**مبهور. لاهث**/ هەناسەسوار، کفت، کەشەنگ، شەکەت، نیخەنیخاوی.

**ابهر. الظهر**/ پشت.

– : **شریان ابهر**/ شاخوێن بەر، خوێن بەر.

**ابهران: عرقان یخرجان من القلب**/ دووشا خوێنبەر.

**بَهْرَجَ: زَوَّقَ**/ رازانیەوە، جوانی کرد، ئارایشتیدا.

**تَبَهْرَجَت المراة: تزَیَّنَت**/ ئارایشتی خۆی دا، خۆی (رازاندەوە، دا لەتەل).

**بَهْرَج: باطل. زائف**/ قەڵب، درۆ، پوچ.

**مُبَهرج: لون زاهي. مُزَوَّق**/ رەنگاو رەنگ، بۆیەکراو، ئارایشت دراو، رازاوە، نەخشاو.

**بهز:**

**بَهَزَ: دفع بضعف**/ پاڵی پێوەنا، بە ئەسپایی پاڵی نا.

**مبْهز: دَفّاع**/پاڵ نەر، پاڵ پێوەنەر.

**بهش:**

**بَهَشَ: اقبل مسروراً**/ بە روخۆشی هات.

**البَهْش: بَشوش**/ روخۆش، دەم بە پێکەنین.

**بهظ:**

**بهظ ابهظ: اثقل**/ قورسی کرد، گرانی کرد، زۆرداری کرد.

**باهظ: ثقیل**/ قورس، گران.

– **زائد عن الحدّ**/ لە رادەبەدەر، یەك جار.

**ثمن – : مُرْتَفِع. عالٍ**/ نرخێکی گران.

**بهق:**

**بَهَق. بُهاق: مرض جلدي. بیاض علی الجلد**/ پەڵەی سپی سەر پێست، بەڵەك، منجڵ، شڵ بازەڵە.

– **الصخر: نبات کالطحلب یعلو الصخر**/ قەوزەی سەر بەرد.

**بهل:**

**بَهَلَ: لعَنَ**/ نە فرەتی کرد، ئەفەرۆزی کرد.

**البَهْلَة: البُهلة. اللعنة**/ نەفرەت.

**إبْتَهَل. دعا و تضرع**/ نزای کرد، پاڕایەوە، لالایەوە.

**ابتهال: تَوَسُّل. تَضَرُّع**/ نزا، نزاکردن، پاڕانەوە، لالانەوە.

**مُبْتهل. مُتَوَسِّل. مُتضَرِّع**/ نزاکەر.

**بُهلول: ضَحّاك**/ قۆشمە، کوستەبابی.

**بهلوان: اللاعب علی الحبل**/ پاڵەوان، تەناف باز.

**باهِلْ. لا عمل له**/ بێ ئیش، بێکار، دەس سپی.

**بهم:**

**بهام. بَهام: اولاد البقر و المعز و الضأن**/ گوێرەکەو کارویەرخ.

**بَهیمة: کل ذات اربع قوائم**/ چوارپێ، ئاژەڵ، رەشە وڵاخ، چارەوێ.

– : **کل ما لا نُطْقَ له**/ بێ زمان.

**بَهائم: جمع بهیمة**/ ئاژەڵ، ماڵات.

**أبْهم الکلام: تکلّم بغموض**/ بە تێکەڵ و پێکەڵ قسەی کرد.

**مُبْهَم: غامض**/ نادیار، ئاڵۆز.

**إبهام: إلتباس. غُموض**/ نادیاری، ئاڵۆزی.

**بهیم: لا فتحَه فیه**/ کون بڕ.

– : **اسود**/ رەش، تاریك، تار، نوتەك.

**إبْهام: اکبر الاصابع**/ پەنجەگەورە، کەلەموست، ئەسپێ کوژە.

**بهو:**

**بها. بهی: حسُن و ظرُفَ**/ جوان بو، رازایەوە، گەشایەوە.

**باهی. تَباهی: تفاخَرَ**/ شانازی کرد، خۆی هەڵ کێشا، گەزافی لێدا، لافی لێدا، گەنجەفەی کرد.

**بهاء. حُسْن**/ جوانی، جوان پۆشی، رازاوەیەتی.

– . **إشراق**/ شەوق دانەوە، هەڵاتن.

ب

مُباهاة. تَباهٍ. تفاخر. تمجيد/ شانازی، خۆ هەڵ كێشان، گەزاف، لاف، گەنجەفە، بایی بون، لە خۆبایی بون.

بهی. باهٍ: زاهٍ/ رازاوە، روناك.

— . —: جميل/ جوان.

— . —: مُشرق/ بریقەدار، تیشكدار، گەش، گەشاوە.

باهٍ. فاخر/ نایاب، بەنرخ.

متباه: متفاخر/ خۆ هەڵ كێش، فشەكەر، بایی، لەخۆبایی بو.

بهو: قاعة او محل الاستقبال/ دیدەنگە، سالۆن، هۆڵ.

باء:

باء: رجع/ گەڕایەوە.

— بە/ گەڕانیەوە.

— بالحق: اقرَّ/ دانی پیانا، دركانی، دانی بە راستیدا نا، چوە ژێری.

— . تَباوأ: تعادل/ وەك یەك وەستایەوە، یەك بەیەك، داش بە داش، سەربەسەر.

بَوّأ: سدَّد/ روی تێكرد، ئاراستەی كرد.

— : حلَّ فیه/ تیایا لای دا، تیا نیشت، تیا گلی خواردەوە.

أباء بالمكان: اقام/ تیا نیشتەجێ بو، جێگیر بو.

— منه: فرَّ/ بۆی دەرچو، رای كرد، دەرباز بو، لێی هەڵ هات.

بيئة: مقام/ شوێن، ژینگە، بارەگا، نزرگە، وەتەن، شوێنەوار.

— : محيط/ دەوروبەر، ناوچە.

— : منزل/ خانو، ماڵ، نیشتگە، مەڵبەند.

تَبوَّءَ العرشَ: إعتلاه/ چوە سەرتەخت.

تَبوُّءُ العَرْشِ/ چونە سەرتەخت.

بُواء: ثعبان عظيم/ ئەژدیها، هەژدیها.

بواسير (في بسر).

باب:

باب: مدخل/ دەرگا، چەپەر، دەروازە، دەر، دەرگانە، دەرو.

— من كتاب: فصل/ بەش، بەند، بەست.

— : رتبة/ پلە، جۆر، پایە.

الـ — العالي/ ئەستەمول.

من — كذا: بسبب/ بەهۆی، لە بابەت.

من — أولى: وخاصة. خصوصاً/ بە تایبەتی.

بوّاب. حارس الباب/ دەرگاوان.

بوّابة/ دەرگای گەورە، دولایی.

بوَّب الكتاب. قسمة الى أبواب/ بەش بەشی كرد، پۆل پۆلی كرد.

مُبَوَّبْ مُقسَّم/ بەش بەش كراو، پۆل پۆل كراو.

باح:

باحَ السِرَّ. اظهره/ ئاشكرای كرد، دەریخست، خستیەرو، نهێنی ئاشكرا كرد، دركانی، نهێنیەكەی دەربڕی.

أباح اليه بالسِّر. اظهره له/ نهێنیەكەی بۆ ئاشكرا كرد، لای دركان.

— . استباحَ الشيء:عَدّه ملكاً للجميع/ بەرەڵای كرد، بە گشتی كرد، گشتانی.

. — : اجاز/ رێی دا، هێشتی.

بَوْح: إباحة: إظهار/ خستنەرو، دەرخستن، ئاشكراكردن، دركاندن.

إباحة: إجازة/ رێدان، هێشتن.

بواح: الظاهر المكشوف/ لەرو، ئاشكرا، دیار.

بووُح: المُظْهر بما في صدره/ دەرخەر، ئاشكراكەر، دەم شڕ.

مُباح: جائز/ شیاو، بەرەڵا، رێدراو.

— : مُحَلَّل/ حەلاڵ كراو، رەوابو.

— : عمومي/ كراو، گشتی.

اباحي: من أجاز لنفسه فعل المعاصي/ داوێن پیس، نارەوكار، خراپەكار، تگەوبەرانی.

إباحيَّة/ نارەوایی كردن، بەرەڵایی، تگەوبەرانی.

باحة: ساحة الدار/ حەوش، حەوشە.

— : وسط الطريق/ چەقی رێگا.

باخ:

باخ اللحمُ. فسدَ/ بۆگەنی كرد، بۆنی كرد، شەومەنگەبو.

— : أعيا/ هیلاك بو، شەكەت بو، كەنەفت بو.

— الحر و الغضب و النار: سكن وفتر/ نیشتەوە، كوژایەوە، ساردبوەوە.

بايخ: لا طعم له/ بێ تام.

جاب:

جَأب: مِعزة/ بزن، بز.

— : الاسد/ شێر.

جَأبَة: سُرَة/ ناوك.

جئث:

جُئِثَ: فَزِعَ/ ترسا، دڵی داخورپا، راپەڕی.

مجؤوث: مَذعور/ ترساو، داخورپاو.

جاجا:

كَفَّ و امتنع/ وازی هێنا.

جُؤجُؤ من الطائر و السفينة: الصدر/ سنگ. پێش.

جار:

جأَرَ الی الله: تضرع/ پاڕایەوە، لالایەوە.

— الثورُ: صاح/ بۆڕانی.

— : زَأرَ/ زریکانی، نەڕانی.

— النبات: إرتفع/ بەرزبووەوە.

جَأرٌ. جُؤار: جوار. زئير/ بۆڕانـدن، نەڕانـدن، بـۆڕە، نەڕە.

جاش:

جَأش. إضطرب/ شێوا، شپرزەبو، پەشۆكا.

جَأش. إضطراب/ شێوان، شپرزەیی، پەشۆكاوی.

رابط الـ — شُجاع/ نەترس، لەسەرخۆ، هێمن، خۆڕاگر.

جاءَ (في جَيأ) جائر (في جور) جائزة (في جوز) جاب (في جـوب و جيـب) جـاد (في جـود) جـار (في جـور) جار. جاری. جارية (في جری) جاز جائزة (في جوز) جازف (في جزف) جازی (في جزی) جاس (في جوس) جـاش (في جـيش) جـاع (في جـوع) جـال (في جـول) جالية (في جلو) جام (في جوم) جامع (في جمع) جامل (في جمل) جاموس(في جمس) جانّ (في جنّ) جان (في جنی) جـاهٌ (في جـوه) جـاهر (في جهـر) جـاوب (في جوب) جـاور (في جـور) جـائزة (في جـوز) جَبّـار (في جبر).

جَبَّ:

جَبَّ: إجْتَبَّ: قطع/ بڕی، دایبڕی.

إجْتَبَّ. لبس الجُبَّة/ جبەی لەبەرکرد.

جُبّ: بئر عميقة/ بیری قوڵ.

— : سجن تحت الارض/ زیندان.

— : حُفرة/ چاڵ.

جُبَّة: رداء معروف/ جبە، کەوڵ.

— : درع/ قەڵغان، زرێ.

— : العظم المحيط بالعينين/ ئێسقانی دەوری چاو، کالانە، کالانەی چاو.

جُبجُبَة: زنبيل من جلد ينقل به التراب/ زەمبیلەی چەرم.

جبر:

جبر المكسور: اصلحه/ چاكی كردەوە، وەكو خۆی لێ كردەوە.

– جبَّر العظم: اصلحه/ گرتیەوە، خستیەوە شوێن خۆی.

– الخاطرَ: أرضَى/ ئاشتی كردەوە، دڵی دایەوە، بەسەریاهات.

– القلب: عزّى/ دڵنەوایی كرد، دڵخۆشی دایەوە.

– الفقيرَ: ساعدهُ/ یارمەتیدا، دەستی گرت، حەوانیەوە.

– على: الزَمَ. أجْبر/ زۆری لێ كرد، ناچاری كرد.

تَجبَّر: تكبَّر/ فیزی نواند، خۆی بەزل گرت.

– انجبر. اجتبر: صَلُحَ بعد الكسر/ گیرایەوە، چاك بوەوە.

– : طغا. عتا/ جەورو ستەمی نواند، زۆرداری كرد.

– المريضُ: صلح حاله/ چاك بوەوە.

– النبتُ: نبت بعد ان اكل/ هەڵیدایەوە.

جبارة: مهْنَة مَن يُجْبر العظام/ ئێسك گرەوە.

تجبير العظام: اصلاحه/ ئێسك گرتنەوە.

جَبيرة العظام: المواد التي تُجْبر بها العظام/ كەرەسەی ئێسك گرتنەوە.

وضع في الـ – / گرتیە كەچەوە، كەچی تێ گرت.

مُجَبِّر: جابر العظام/ ئێسك گرەوە

جابر. مُجبِر/ ئێسك گرەوە.

ابو – : الخُبز/ نان.

ام – : الهريسة/ كەشكەك، كەنمەكوتاو.

جبْر اجبار: قهر/ زۆرداری، زۆركردن، ناچاركردن.

– . جبارة: تجبير العظام/ ئێسك گرتنەوە.

– : علم الجبر/ جەبر.

– : قضاء الله و حكمه/ فەرمانی خوا، ناچاری، بێدەسەلاتی.

جبْراً. بالجبر: قهراً/ بەزۆر، بە تۆپزی، بە ناچاری، زۆرەملێ.

جَبري: مختص بعلم الجبر/ جەبرزان.

– . إجباري: الزامي/ ناچاركردن، تەوزی، بەزۆر، تەوزیم.

جبّار: من صفات الله تعالى/ گەورە، گەورەیەتی خوا.

– : متمرد. عات. المسلط القاهر زۆردار، ستەمكار، بەجەور، زەبر بەدەست.

– : هائل القوة/ بەهێز، بەتوانا.

مجهود – /كردار یا كردەوەی گرنگ.

مُجبر. مجبور: مُلزم/ ناچار.

إجبار. جبر: الزام/ ناچاركردن.

إجباري. جبري الزامي/ ناچاری، تەوزیمی.

جبروت: القدره والعظمة/ هێز، گەورەیی، توانایی، جەورو ستەم.

جُبار: هدر/ فیڕۆ.

– : ذهب دمه هدراً/ خوێنەكەی بەفیڕۆ ڕۆی.

جبريل. جبرائيل اسم ملاك او رجل/ جبرائیل، ناوی مەلایكەیەكە، ناوە بۆ پیاو.

جبز:

جبَزَ: قطع/ لەتی كرد.

جَبُزَ الخُبْزُ: يبس/ وشك بوەوە، نانەكە وشك بوەوە.

جبزة: قطعَة/ لەت، كەرت، پارچە.

جبيز: الخبز اليابس/ نانە رەق.

جبس:

تجبسَ في مشيته: تبختر/ بەترو فیزەوە ڕۆیی، خۆی بادەدا.

جبّس الحائط. طلاهُ بالجبس/ گەچ كاری كرد، سپیكاری كرد.

– العضو المريض/ لە كەچی گرت، گرتیە گەچ.

جِبْس: جُصّ/ گەچ.

– اجْبس: جبان/ ترسنۆك.

– جبوس: لئيم/ نامەرد.

– : ثقيل الروح/ ئێسك قورس.

– : فاسق/ داوێن پیس ، چاولەوەڕ.

جبيس. ولد الدُّبّ/ بەچكە ورچ، تولە ورچ، بێوڵە.

جبل:

اجْبل و تجبّل المسافر. صار او دخل الى الجبل او سكن فيه روی كردە شاخ، لە شاخ نیشت، شاخی كردە نشینگە.

جبل: صوّر. صاغ/ دای رشت.

– : عَجن/ شێلای.

جَبْل: عجْن وصوْغ/ شێلان، گرتنەوە، دارشتن.

قابليه الـ – : طوّاعية. لدونة/ پێز.

جبلْ: طور/ شاخ، چیا، کێو، کەژ.

– نار : بُركان/ ئاگرپژێن، شاخی ئاگرین، گڕکان، ئاگرین.

– جليد / چیای بەفرین، بەفرە چیا.

انف الـ – / لوتی شاخ.

إبنه الـ – حيّة/ مار.

سلسلة جبال/ زنجیره شاخ، تیرەشان، تیغه شان.

جَبَلـي: مختـص بالجبـال/ شـاخ زان، چـیازان، شاخەوان، کەژەوان.

– : كثير الجبال/ شاخاوی.

– : ينبُت او يتواجد في الجبال/ شاخی، چیایی.

– جبلاوي: سكان الجبال/ دانیشتوانی شاخ و چیا، شاخ نشین.

– مختـص في صـعود الجبـال/ شـاخەوان، کەژەوان.

منطقة جبلية/ کوسار، شاخاوی.

جبيل. مَجْبال: قبيح الوجه او الخلق. رجل جبيل. أمراة مجبال/ خو یا شێوه ناشیرین، ئەرژەنگ.

جبن:

جَبُن. ضعف قلبه/ ترسا، ترسی لێ نیشت.

– . خارعزْمه/ روخا، ورەی بەردا.

جبّن. تَجبنَ الحليب: صار جُبناً/ مەیی، بو بە پەنیر.

جُبْن. جُبْنَة/ پەنیر.

– . جبانة ضد شجاعة/ ترسنۆکی.

ماء الـ – . شرش/ دۆوك.

جَبان. جبين: ضد شجاع/ ترسنۆك.

جبّان: صانع أو بائع الجبن/ دروسکەر یا فرۆشیاری پەنیر.

– . جبّانة: مقبرة/ گۆڕستان.

مجْبنة: وعاء صنع الجبن/ دەفری پەنیر.

– : خُثْرَة الجبن/ مەوێنی پەنیر.

جبين: جبْهَة/ ناوچەوان، تەوێڵ.

جبه:

جَبَه. جابَه: فاجأ/ کت و پڕی کرد، لەپڕ بو.

– . – : استقبل. واجه. بەرەنگاری بـو، روبـەڕوی بو، ئاوقاتی بو.

جبْهة: جَبين/ ناوچەوان، تەوێڵ.

– من الناس: جماعة/ کۆمەڵە خەڵك، کۆمەڵەیەکی یەك (کەوتو، گرتو).

– : الجزء الامامي/ پێش، رو، پێشەوە.

– القوم: سيدهم/ سەرگەورە.

الـ – الحربية: خط حربي حصين/ گەرمەی جەنگ، کۆڕی جەنگ.

جبى:

جَبى الضرائب و الاموال: جمعها/ باجی (کۆکردەوە، سەند، گرت).

جباية الامـوال أو الـضرائب: تحـصيلها/ بـاج (کۆکردنەوە، سەندن، گرتن)، پەتەبڕین.

جاب محصل الضرائب/ باج گر، باج سێن، پەتەبڕ.

جث:

جثّ. إجْتثّ. قلع/ هەڵی کەند.

مجثّة: حديدة تقلع بها النبات/ نوێڵ.

جُثّة: جسم/ تەن، لەش، جەستە.

– الميت . للانسان/ لاشە، تەرم.

– الميت. للحيوان/ لاك، کەلاك.

جَثيث: ضخْم/ تەڕلان، بۆشناخ.

جثم:

جَثم: قبع/ هەڵ نیشت.

– : لنطـرح بـصدره علـى الارض/ بەسـنگا کـەوت، لـە پەڕوکەوت.

جاثم: مُتلبِّد بالارض/ هەڵ نیشتو، لەپەڕوکەوتو.

مجْثم: محـل الجثـوم/ نیـشتگە، شـوێنی هـەڵ نیـشتن، هەڵنیشگە.

جُثـام. جـاثوم. كـابوس/ خـەوی نـاخۆش، مێردەزمـە، مۆتەکە.

جثمان: جسم/ تەن، لەش.

– الميت: رُفاتـه/ لاشـە، چـڵ و چـێو، کـەلاك، ئێسك و پروسك.

جثا:

جثـا: ركـع/ کورنوشـی بـرد، چـەمایەوە، چـۆکی دادا، بەچۆکدا هات.

جاثٍ: راكع/ لە کورنوشایە، چەماوەتەوە.

جُثُوُ: رُكوع كوڕنوش، کڕنوش بردن، چەمانەوە، چۆك دادان، بەچۆکداهاتن.

جُثْوَة: كوْمه تراب فوق القبر خۆڵی سەر گۆڕ.

جحد:

جحد: انكر. نكوڵی كرد، دانی پیانەنا، نەچوە ژێری.

— : كذب بەدرۆی خستەوە.

— : كفر رەفی كرد، بیٚ ئایینی نواند، كفری كرد، لەئاین دەرچو.

جَحْدٌ. جُحود: إنكار دان پیانەنان، نكول كردن، نەچونە ژێر.

— . — : كُفرٌ بیٚ باوەڕی، بیٚ ئایینی، كفركردن، لەئاین دەرچون.

— . — المعروف: نُكران الجميل سپڵەیەتی، پیٚ نەزانین، لەبەرچاونەبون.

جاحد ناكر دان پیانەنەر، نكول كەر.

— . كافر بیٚ باوەڕ، بیٚ ئایین.

= المعروف: ناكر الجميل سپڵە، پیٚنەزان.

جحر:

جحر. دخل حُجْرة چوه كونەكەیەوە، خۆی كرد بە كونەكەیا.

— . تأخر/ دواكەوت.

أحْجرت السماء. لم تمطر نەباری.

جُحْر الحیوان: وجار كون، ئەشكەوت.

مجْحر. مكْمن. ملجأ/ پەناگە.

جاحر: متخلّف دواكەوتو، دواكەوتە.

جحْرَة. جحرة: السنة المجدبة. ساڵی وشك و بیٚ بارانی، ساڵی تەنگ و چەڵەمە، وشكە ساڵ، نەهاتی.

جحش:

جحْشٌ ولد الحمار جاش، جاشەكەر.

— . عارض خشبي كەرە دارینە.

تجحيش بەجاش كردن، مارە بەجاش.

جحظ:

جُحظت عينه: عظُمت مقلتها و نتأت چاوی دەرپۆقی.

جحَّظ اليه: حدد النظر اليه چاوی تیٚ بڕی.

جُحوظ العين چاوی دەرچۆقین.

جاحظ العين چاودەرپۆقیو.

جحف:

جحف: جرف رای ماڵی، رایدا، راپێچی دا، بردی، فەوتانی.

— معهُ: مال إنحاز لایەنی گرت.

إجحاف جور زۆرداری، زۆر، ستەم، جەور.

— : ميل. تحزُّب لایەن گری، لایەن گرتن.

مُجْحف: جائر زۆر، ستەم، جەور.

تجحفلوا: تجمعوا/ كۆبونەوە، گردبونەوە.

جحْفل: جيش عظيم. فەیلەق، سوپا.

رجُلٌ — : عظيم القدر پیاوگەورە، كەڵەپیاو.

جحل:

جحْل: ولد الضب. الحرباء تولە مارمێلكە، مارمێلكە.

— : يعسوب پوش بەقنگە.

جُحال: سُمّ ژەهر، ژار.

جيْحل: العظيم من كل شيء گەورە، گابەرد، كەڵە.

جحم:

جحم النار: اوقدها دایگیرسان، كردیەوە.

جحمت. جحُمت النار: إضطرمت ئاگركەوتەوە، ئاگربەربوەوە.

اجْحمت النارُ: إشتدّت و تاججّت كڵپەی سەند، بڵێسەی سەند.

تجحّم: تحرّق حرصاً و بُخلاً خۆی خواردەوە، پیشی خواردەوە.

جحَمهُ بعيْنه: احدّ النظر اليه چاوی تیٚ بڕی.

جحم. أجْحم: كفّ وازی هێنا.

جاحم: الجمْر الشديد الاشتعال كەڵە پشكۆ.

جحيم: كل نار شديدة التاجج ئاگری بە كڵپە.

— : المكان الشديد الحرّ شوێنی زۆر گەرم، بڵێسە.

— : جهنّمْ دۆزەخ، جەهەنەم.

جحيمي. جهنمي دۆزەخی، جەهەنەمی.

جُحْمة: توقُد النار كڵپەو نێڵە نێڵی ئاگر.

جُحام: ورم العين. ئاوساوی چاو.

— : حُمْرة العين سوری چاو، چاوداگیرسان.

جد:

جدّ كان جديدا تازەبو، نویٚ بو.

— . إجتهد كدّ خەباتی كرد، كۆششی كرد، تیٚكۆشا.

— : حصلَ حديثاً تازه بابەت.

— في الامر. إهتم گرنگی پێدا، دڵکاربو.

— في العمل. عجَّل و اسْرع/ پەلەی کرد، خێرایی کرد، دەست و بردی کرد، گورج بو.

— . قطع بڕی.

جد:

جدَّد: اعاد سن جديد لە نوکەوە کردیەوە، دەستی پێکردەوە، دوبارەی کردەوە.

— : جعله جديداً تازەی کردەوە، نوێی کردەوە.

تجدَّد: إسْتجدَّ: صار جديداً نوێ بوەوە، تازە بوەوە.

جدّ. حظّ/ بەخت، شانس.

— : ابو الاب. ابو الأم باپیر، بابەگەورە.

— : سلف پێشین، پێشینان.

جدَّة: أم الأب. أم الأم/ نەنك، نەنە، دایە گەورە، داپیر.

أجداد باوو باپیر، باپیران.

جِدّ: إجْتهاد كۆشش، هەوڵ، هەوڵدان، خەبات، چالاکی.

— : ضد هزل/ بەراستی، دڵکاری.

جادّ: مجتهد هەوڵ دەر، خەبات کەر، چالاك، تێکۆشەر، دلکار.

— : ضد هازل/ راست.

جدّي: مثابر و مجتهد في العمل / دلكار.

مجدود: ذو حظّ/ بەختیار، بەختەوەر، کامەران.

تجدُّد تازەبونەوە، نوێ بونەوە.

تجديد/ تازەکردنەوە، نوێ کردنەوە، نوێ کاری.

مُجدِّد تازەکەرەوە، نوێ کار، نوێ خواز.

مُجدَّد تازەبوەوە، نوێ.

جديد: عكس القديم. حديث/ تازە، نوێ.

— . مجدود: مقطوع براو، بڕراو.

من — لە نوکەوە، سەرلەنوێ، دوبارە، لەسەرەوە.

تجديد نوێ کاری، نوێ کردنەوە.

جدّة: حداثة. تازەیەتی.

الجديدان. الأجدّان: الليل و النهار شەوو رۆژ.

جدْد: الارض المستوية/ زەوی تەخت.

جادة: طريق رێ، رێگە، شەقام.

جُدّ: محل القطع شوێن براوی.

جدّة: شاطيء النهر رۆخی روبار، گوێ ئاو، کەنار.

جُدجُد: صُرار الليل سیسرك، مێشەسەگانە.

جدار. جداره (في جدر) جدال (في جدل)

جدب:

اجْدب. جدب. جدُب. تجدَّب المكان. إنقطع عنه المطر فيبست ارضه/ بارانی لێ برا، بوبە روتەن، وشك بوەوە.

— القومُ: أصابهم الفقر هەژارکەوتن.

جدْب: محْل. ضد خصب وشکەوەبون، بێ پێزی، بێ پیتی.

— . قحط قاتی، گرانی، برسیەتی، نەبونی، سالی نەهات.

— : عيب شورەیی، نەنگی.

جدث:

جدث. قبر/ گۆر.

جدر:

جدُر بكذا. كان اهلاً له ئەیهێنا، لێی هات، شایانی بو.

جدر. إجْتدر: بنى الجدار/ دیوارەکەی (دروست کرد، هەڵ بەست، هەڵ سان).

جُدر. جُدِّر طلع فيه الجدري. ئاوڵەی دەردا، توشی ئاوڵە بو.

جدارة. أهلية ئەهاتویی، توانست، توانایی، پێ رەوابون.

جَدير: خليق به بەتوانا، ئەهاتو، شایان.

— بالذكر شایانی باسە.

— بكذا شایانێتی، پێی رەوایە.

جدار. جدْر: حائط دیوار.

— خشبي جاخ.

جُدرانيه: ما يعلق على الحائط. ئەوانەی بەدیوارا هەڵ ئەواسرێن.

مجْدار: فزّاعة داوەڵ، بوکە سەماکەرە.

مجدور. مُجدَّر: مصاب بالجدري ئاولاوی، کونج.

جُدري. جدري: من الامراض ئاوڵە.

— الدجاج/ پۆپە رەشە، دانکە.

— الحيوان خوروله، خورولکه، خوریله

— الارض: كماء دومەلان.

جُدَيْري: جدري الكاذب . مىَ‌كوته، دركه.

**جدع:**

جدعَ: قطع/ برى، لێى برى.

— عضواً من جسمه لتشويهه/ ئەندامێكى لەشى
برى بۆ (ئەتك، پەنگ)، ئەتكى كرد.

اجْدع. مجْدوع: مقطرع الأنف او اليد او الاصابع...
الخ/ لێبڕاو، لوت بڕاو، پەل پەڕیو.

جدع: شاب. گەنج، لاو.

— : شخص/ مرۆڤ، كەس.

— : ماهر/ چالاك، وريا، لێهاتو، بەتوانا، گورج،
چوست، وەستا.

— : شُجاع/ ئازا، بەجەرگ.

**جدف:**

جَدف الطائرُ. حرَّك جناحيه ولم يطر/ بالى
شەكانەوە، باڵەفرێى كرد.

— الرجُلُ: حرك يديه في مشيته/ بالى راوەشان.

جدَّف على الله: تكلم عليه بالكفر/ كفرى كرد.

— : كفر بالنعمة/ ناشكورى كرد، پێ نەزانى نواند.

— : سَيَّر بالمجذاف/ سەوڵى لێدا.

تجديف على الله/ كفر كردن، بێ ئايينى.

— : تجذيف/ سەوڵ لێدان.

مجداف: مِجْذاف/ سەوڵ.

**جدل:**

جدل الحبلَ. فَتلَهُ/ بايدا، بايدايەوە، لولى كرد، هۆنيەوە.

— : صَلُب و قوىَ/ رەق بو، قايم بو.

— : جَدَّل الشعر و غيره: ضَفرَهُ/ هۆنيەوە، كردى بە
پرچ.

جادل: حاجّ/ بيانوى گرت، مشت و مڕى كرد.

— : خاصم/ بەربەرەكانى كرد، مەرا مەراى كرد،
دەمەقالێ كرد.

جَدَلْ. جدال. مُجادلة: (اخذ و رَدّ/ مشت و مڕ،
گفتوگۆ، وت و وێژ، دەمەتەقێ.

— . — . خصام/ بەربەرەكانى، هەراهەرا،
دەمەقالێ.

يقْبل الجدل/ قايله يا رازيه به مشت و مڕو گفت وگۆ.

لايقْبل الجدل. ناقايله يا نارازيه به مشت و مڕو گفت وگۆ.

جدلى. جدّال: شديد الجدال/ مشت و مڕ كەر، زۆر
بلێ، وت و وێژ خواز.

جديلة: ضفيرة/ پرچ، پەلكە.

مجدول: محبوك/ هۆنراوە.

جديل: الحبل المفتول/ بادراو.

جدْوَل: نهر صغير/ جوگە، چەم، جۆگەلە، جۆ، جۆبار.

— : بيان. قائمة/ خشتە، ليستە.

— : عمود/ ستون.

— الاعمال/ كارنامە.

— الضرب/ خشتەى لێك دان.

جدْلە: مدقّة الهاون/ دەسكى دەسكەوان.

مجدل: قصْر/ كۆشك، تەلار.

مجْدل: جماعة من الناس/ كۆمە خەڵك.

**جدم:**

جدم: الرذال من الناس/ هەرچى و پەرچى، گەجەرو
گوجەر.

جُدامة. جُدام: سُنبل لم يُنَدَق/ كزرە، كۆتەل،
سەركۆزەر، نەكرتراو.

**جدا:**

جدا عليه: اعطاه عَطيّة/ دايە، پێيدا، پێى بەخشى،
پێشكەشى كرد، خەلاتى كرد، خێرى پێ كرد.

— . إجتدى. إستجدى. طلب جدواه: إستعطى
پاڕايەوە، دەستى پان كردەوە، داواى كرد، سواڵى كرد.

اجدى: نفع/ كەڵكى گەيان، سودى بەخشى.

جدْوَى: فائدة/ سود، كەڵك.

— : عَطيَّة/ خەلات، بەخششيش، دان.

بلا جدْوَى: بلا فائدة/ بێكەڵك، بێ سود.

جدي: سخى/ بەخشندە.

لايُجدى: لاينفع/ كەڵك ناگەيەنێ، كەڵكى نيە، بێ
سودە.

جادى: سائل/ سواڵكەر، دەروەزەكەر.

جدْوة: سرب. قطيع/ پۆل، گەلە، ران.

جدي: ولد الماعز/ كار، كارژۆڵە، گيسك.

مدار الـ — / خولگەى (كارژۆڵە، گيسك).

جدْية: قطعة تحت السرج/ ژێر زين، نەرمەزين،
تەكەڵتو.

جذ:

جذّ: قطع او كسر/ بڕی، شكانی.

— : أسرعَ/ خێرای كرد، پەلەی كرد، خێرا ڕۆیی.

جُذّة: قِطعة/ پارچە، كەرت.

جُذاذ، جَذاذ، جِذاذ: مُكسّر/ شكاو.

جُذاذات: القطع الصغيرة/ پارچە پارچە، وردە شت.

جذب:

جذَب. إجتَذَب: ضد دَفع/ ڕایكێشا، بەكێشی كرد.

— . — : اغـرى، إسـتمال/ سـەرنجی ڕاكێـشا، فریوی دا، هەڵی فریوان.

— . — القلـب: سَلَبهُ/ دڵـی سـەند، گرفتـاری كرد، شەیدای كرد.

جـذْب. إجتـذاب: سـحْب/ ڕاكێـشان، كـێش كـردن، كێشان، بەكێش كردن.

— . جاذبيَّة: القوة الجاذبية/ هێزی ڕاكێشان، كێشەنی.

جاذبيّة. إنجذاب او تجاذب المادة/ كێش هێز.

— الثقل الجاذبية الارضية/ كێش هێزی زەوی، زەمین كێش.

— الإلْتصاق/ كێش هێزی پێوەلكان.

— مغناطيسية/ كێش هێزی موگناتیسی.

— جِنسيّة: ميْل جنسي/ ئارەزوی ڕابواردن.

جاذب: جذّاب: يجْذب/ ڕاكێشەر، كێشەر، ڕاكێش.

— : خلاّب/ دڵگیر، سەرنج ڕاكێش.

مجْذوب: منجذب/ ڕاكێشراو.

— :مجنون/ شێت، وێت، پەتیارە.

مستـشفى المجاذيـب: المجـانين/ خەسـتەخانەی شێتان.

جذر:

جذّر. جذّرَ: إقتلع/ هەڵی كەند، هەڵی كێشا.

— العدد: استخرج جذره/ ڕەگی دەرهێنا، شیكردەوە.

— . مدَّ جذراً/ ڕەگی ایێدا، ڕەگی داكوتا.

جَذْر، جِذْر: أصل/ ڕەگ، ڕەگ و ڕیشە، ڕیشە.

— . — : تربيعي دوەم ڕەگ، دوڕەتەكی.

— . — : تكعيبي/ سێ ڕەتەكی، سێیەم ڕەگ.

— ليفي ڕەگی لفكەیی.

علامة الـ — : √ / نیشانەی ڕەگ، √

تجذير: استخراج الجذر/ ڕەگ دەرهێنان.

جُذير/ ڕیشە ڕەگ، ڕەگۆك.

جذع:

جذع: ساق الشجرة/ قەدی دار.

— الانسان: جسمه ماعدا الراس و الاطراف/ قەد، لەش، باڵا.

جذع مذَع: تعبير بمعنى التفرُق/ بڵاوبڵاو، جیاجیا، پەرت و بڵاو.

ذهبوا جذَع مذَع: ذهبوا متفرقين/ بەجیاجیا ڕۆیشتن، پەرت و بڵاوبونەوە.

جذف

جذَف القارب: دفعه بالمجذاف/ سەوڵی ایێدا.

مجذاف/ سەوڵ.

جذل:

جذل: فرح/ دڵخۆش بو، پێخۆشحاڵ بو، ڕوخۆش بو، شادان بو.

اجْذَل: فَرّح/ دڵی خۆش كرد، شادمانی كرد.

جَذل. اجْذَل: فرحان/ دڵخۆش، پێخۆشحاڵ، ڕوخۆش، شادمان.

جذَل: فرح/ خۆشی، ڕوخۆشی، شادی.

جذل الشجرة. الظاهر منها في الارض بعد قطعها/ كۆتەرە، بنەكۆتەرە، تەتە.

جذم:

جذَم: قطع/ بڕی.

جُذِمَ: اصابه داء الجُذام/ گول بو، توشی گولی بو، گولی گرت.

جذمة الشجرة/ كۆتەرە، بنەكۆتەرە، كۆتەرە دار، تەتە.

جُذام: داء الاسد/ گولی، نەخۆشی گولی.

جُذامة. جذمور: مايبقى من الزرع بعد الحصاد/ پوش، پوشی پەرێز، خۆشە.

اجذم: مقطوع اليد او الاصابع/ كۆڵ.

— . مجذوم: مصاب بالجذام/ گول.

جذو:

جُذوة: جمرة/ پشكۆ، سكڵ.

جر:

جرّ: سحب/ ڕای كێشا، بەكێشی كرد.

- رجلهُ: اغراه/ هەڵی فریوان، دەستی بڕی، هەڵی خەڵەتان، خەڵەتانی، لەخشتەی برد.
- . اجرّ. إجْترّ: اعاد الاكل من بطنه فمضغهُ ثانية كاویژی كرد.
- الكلمة: حركها بحركة الجر ژێری بۆ وشه كرد.
- على نفسه جريرة: إرتكب إثماً/ گوناهی كرد.
إنْجرّ. إنسحب/ راكێشرا.
- مع التيار: إنجرف پێوەبو، توش بو، رامالرا، رادرا.
- : إنقاد برابەرێوه.
جرّ: سحْب/ راكێشان.
- : جُحْر الضبع/ كونه كەمتیار.
- الحبْل گوریس كێشەكی.
حرف الـ - ، پرپۆزیشن، پیتی راكێشەر.
جارّ: ساحب/ راكێشەر.
مَجْرور: مسْحوب/ راكێشراو.
جرّار. جيشٌ جرّار. لەشكری بێ شومار.
جرّارة: عقرب صفراء/ دوپشكی زەرد.
- : ساحبة/ راكێشەر.
- : ساحبة. آلة الجر الزراعية تراكتۆر.
جارور: دُرج چەكمەجە، چاو.
هَلُمَّ جَرّا: و هكذا دواليك هەروەها، بەوپێیە، ئاوەها
.
من جرّاك، جرّائك. جراك. جرائك. من أجْلك/ لەبەر تۆ، لەبەر خاتری تۆ، لە پێناوتا.
مَجرّة: درب التبانه/ رێی كاكێشان.
جرّة. جرّة: مايلوكه الحيوان المُجْترّ/ كاوێژكردن.
- : إناء فخاري. كوپە، گۆزە، دەسەڵە.
- قلم به نوكه قەڵەمێك.
جرّار. صانع الجرّة گۆزەكەر.
مُجْترّ: يجْترّ طعامهُ كاوێژكەر.
جريرة: إثم گوناه.
من جريرتك. من أجلك/ لەبەر تۆ، لەبەر خاتری تۆ.
جرّي: نوع من السمك نقه، مارماسی، جرّی.
الأجرّان: الإنْس و الجنّ مرۆڤ و جنۆكە.
جرا:
جرّا: شجّع هانیدا.

جرُء. إجْترا: جسر وێرای، نەترسا، زاتی كرد.
إستجْرا: تكلف الجراة خۆی هەڵ كێشا.
جُراة. جراءة: جسارة. وێران، نەترسان، نەترسی، ئازایی، زات كردن.
- - : وقاحة/ بێ حەیایی، روهەڵ ماڵراوی.
جريء: جسور/ ئازا، گوستاخ، بەجەرگ، بەزات، نەترس، بێ پەروا، بێ بیم.
جرب:
جرب: اصيب بالجرب. گەڕبو، توشی نەخۆشی گەڕی بو، گەڕۆڵ بو.
- : ذهب لونه رەنگی تێك چو، بزركا.
جرّب: إخْتبر/ تاقی كردەوە.
- : اغرى هەڵی فریوان، فریوانی، فریوی دا، لە خشتەی برد.
- امراً: حاوله هەوڵی دا، كردی، كارێكی كرد بۆ تاقیكردنەوە.
جرب: مرض جلدى گەڕی، گرگە، گەڕۆڵ، خورولكە.
- السيف: صدأ ژەنگ.
جرب: جرْبان: اجرب گەڕ گروێ.
جرباء: السماء طالعة كواكبها سایەقە، سایەقەی ساماڵ.
تجْربة. تجريب: إختبار تاقی كردنەوە، ئەزمون.
- - : محْنة ناخۆشی، كۆست كەوتن.
- : إغواء فریودان، خەڵەتاندن، لەخشتە بردن.
- : خبْرة. شارەزایی، پسپۆڕی.
- : سعي هەوڵ دان، كۆشش، تێكۆشان.
مُجرّب: مُختبر تاقی كراوە.
- : مُجرّب: خبير شارەزا.
مُجرِّب: فاحص تاقی كەرەوە، ئەزمۆنیار.
- : مُغْرٍ فریودەر، خەڵەتێن، لەخشتەبەر.
تجريبي تاقی گەری، ئەزمونگەری.
جراب: غلاف بەرگ
- السيف: غمد. قراب. كێلان. كالان.
- السلاح كیف.
- النقود جزدان، كیسە پارە.
- : وعاء من جلد هەمانە.
- : وعاء الخصيتين. صفن پێستی گون، گوندان، تورەكەی گون.

- :جوف البئر  بیر.

جربان. جُربان: غمْد السيف  کێلان، کالان.

-   -  : طوق القمیص/ یەخە، یاخە.

جوْرب. ، گۆرەوی.

-   طویـل/ گـۆرەوی (لاسـک درێــژ، لاسـک دار، پوزەوانە).

جَربوع: یربوع  گۆڕمەڵ کەنە.

جرث:

جرثوم. جرثومة  میکرۆب. خۆرە.

جرِّیث: نوع من السمك/ مارماسی.

جرجر:

جرْجر الماء في حلقه: غرغر/ ئاوی لە دەمی رادا، غەرغەرەی کرد.

جَرجاره: رحی/ دەستاڕ.

جرجر: فول. پاقلە.

جرّجرَ: آلة یداس بها الحصید  جەنجەر.

جرجیر: نبات قُرّة العین  کوزەڵە.

جرح:

جرح. جرح. اصابه جُرْح  بریندار بو، بری، زامداربو.

-   شعوره  هەستی بریندار کرد.

- بلسانه: عابهُ و تنقصَهُ/ شـکانی، قـسەی ناشـیرینی پێوت.

إجْترح: إرتکب الإثم  تاوانی کرد.

جُرح: کلمْ. برین، زام، براوی، زەخم.

-   رطب  زلّزلّە.

-   قدیم/ خۆرە.

مجروح. جریح. کلیم  بریندار، زامدار، کەلەلا.

جارح. یجرح. قاطع  برەر. برندە. بریندارکەر.

-   : مؤلم/ بە ئێش. بەسوێ. بە ئازار.

-   : حیوان مفترس  دڕندە.

إنتقاد -  رەخنەی ناڕەوا، گاڵتە پێکردن.

جارحة: عضو. طرف/ ئەندام  پەل.

-   : سکّین  چەقۆ، کێرد، قەڵەم بڕ.

جراحة: عملیة جراحیّة. نەشتەرکاری، برینکاری، برینگەری.

-   . إثْم  تاوان.

جرّاح: طبیب جرّاح/ برین کار، برین ساز.

-   العظام  ئێسک گرەوە.

العملیات الجراحیّة  برین سازی، نەشتەرگەری.

غرفـة العملیـات الجراحیَّـة  ژوری (بـــرین ســـازی، نەشتەرگەری).

جَریح. مجْروح: المصاب بجُرح/ بریندار، زامدار.

جوارح: الطیور المفترسة. مەلی گۆشت خۆر.

-   النهار: مصائبه  بەڵای ڕۆژگار.

جرد:

جرد. جرّد: نزع القشر/ پاکی کرد، توێکڵەکەی لێ کردەوە.

- . -  من کذا: أخذه منه/ لێی سەند.

- . - من کساء: عرّی. روت بوەوە، روت کرایەوە.

- الموجودات: عدّها و حَسبها/ ژماردیەوە، ژماردنی، لیستەی ناوەرۆکی گرت.

جرّد السیف: سلَّهُ  لە کالان دەری هێنا، شمشێری هەڵ کێشا.

-   مـن الرُّتـب  هێنایـە خـوارەوە، پلـەو نیـشانەکانی لێ سەنرا.

-   من السلاح: نزعَهُ/ چەکی پێ دانا، چەکی کـرد، چەکی لێ سەند.

-   الجلْد: نـزَع شـعره  هـەڵی گـرت، تاشـی، توکەکـەی لێ کردەوە.

-   الکتابـة: عرّاهـا مـن الـضبط  سـەرو بـۆری بـۆ نەکرد، حینحە نوسی نەکرد.

تجرّد: تعرّی/ روت بوەوە.

-   للامر: تفرغ له  خۆی بۆ تەرخان کرد.

إجْتـردَ القطـن: حلجـهُ/ چـیکەنەی کـرد، پەمووەکـەی چیکەنە کرد، لە چیکەنەی دا.

جرْد  جرد: لانبْت فیه  روت، روتەن.

-   الاشیاء و البضائع: عَدّو إحتساب/ ژماردنەوە، لیستەگرتن، بەسەرکردنەوە.

أجرد  جرداء: لا نبت فیه  روتەن، روت، گرویێ.

-   : مالا شعر علیه  روت، کۆستە، بێ توك.

-   : التام المجرد من النقص/ تەواو، بێ خەوش.

لبن - . لارغوه علیه  شیری بێ کەف، بەبێ سەرتوێژ.

خمْرة جرداء صافیَة/ شەرابی ساف و بێ خڵتە.

صخْره جرداء/ تاشە بەردی ساف و روتەن.

مُنْذُ اجْرَدین. منذ یوْمیْن أو شهرین أو عامیْن  لە (دو ڕۆژ، دو مانگ، دو ساڵ)ەوە.

تجريد. نزع الجلد. پاك كردن، لێكردنەوە، كەوڵ كردن، گۆرين، گۆڕين.
— من الكساء: نزّع/ ڕوت كردنەوە، ڕوت بونەوە، داماڵين.
— من الرُتب: لێ سەندنەوە، هێنانە خوارەوە.
— من السلاح: نزع السلاح. چەك كردن.
**تجريدة: حملة عسكرية.** هێرش بردن، پەلاماردان، هێرشی (سەربازی، سوپایی).
**مِجرد: محلج القطن.** چيكەنە.
— : **فرشاة الاسنان.** فلچەی دان.
**جرّاد: جلاّء النحاس.** مس سپی كەرەوە، مس گەر.
**مُجرَّد: ضد مَزيد (في الصرف).** تەنها، بەبێ.
— **من كذا**/ پەتيەلە...، بێ بەشە، بێ ئەوەيە...، بێ لەو، بێ ئەو.
— : **صرْف.** پەتی، پاك، خاوێن.
— . **مُعطّل.** لە كەلك كەوتو، لەكار كەوتو.
— : **عُريان**/ ڕوت.
**بالعين المُجرَّدة.** بەچاو، تەنها بەچاو.
**بمُجرَّد.** هەر بەتەنها، هەركە..
**جَراد. جرادة: من الحشرات.** كوللە.
— **مراكشي.** كوللە بۆرە، خەنجەردەم.
— **نجدي.** كوللە زەردە.
— **محلي**/ كوللە مسكە.
**جريدة: صحيفة.** ڕۆژنامە.
— : **بيان.** ليستە.
**جارود. جارودة: سنة قحط**/ ساڵی گرانی، ساڵی نەهاتی، وشكە ساڵ.
**جريد: قضبان ورق النخل**/ لاسكی گەڵای دارخورما، جەريد.
**جرذ:**
**جُرَذ: فأر.** مشك، جرج.
**جَرِذ. مكان يكثر فيه الجرذ.** شوێنێ كە مشكی زۆر بێ.
**جرس:**
**جرس: اسمع صوتاً.** دەنگێكی (لێ بوەوە، كرد، بيسان)، دەنگی لێوە هات.
**أجْرس الجرس: ضربهُ**/ لێی دا، زەنگی لێدا.
— . **إنجرس الحلي: سمع له صوتاً**/ زرنگايەوە، خرنگايەوە.
**جَرَّس به: هتكهُ**/ ئابڕوی برد، ناوبانگی زڕان.
— **ـه الدهر. حنكه**/ قاڵ بو، ڕۆژگار قاڵی كرد.
**جَرْس. جرس: صَوْت**/ دەنگ، زايەڵە.
**جَرَس: آلة تُقْرع للتنبيه.** زيل، زەنگ.
— **صغير.** زەنگوڵە.
— **التحذير**/ زەنگی ئاگاداری.
— **الخطر**/ شوتە.
— **كهربي**/ زەنگی كارەبايی.
**دَقّ الـ —** / زەنگی لێدا، لەزيلیدا.
**دقّة —** . دەنگی زەنگ، زايەڵەی زەنگ.
**ذات الاجراس: قرطال (حيّة)** ماری زەنگ لێدەر، ماری زەنگوڵەدار.
**مُجرّس: الذي جرّب الأمور**/ قاڵ، ئاوەسو.
**جُريس. جُرَيْسة: الاجراس الزرقاء.** گوڵە زەنگ، گەزيزە.
**جرش:**
**جَرَش: طحن ولم ينْعم طحنه.** كوتای، هاڕی، كرەی كرد.
**جريش. مجْروش مطحون غير ناعم.** كوتراو، هاڕراو، پەل خورد.
**جاروش. جاروشة: رحى**/ دەستاڕ.
— . **ماكنة الجرش.** ئامێری كوتان، كوتەر، هاڕەر، دنگ.
**جرْش: طحْن.** كوتان، هاڕين، پەل خورد كردن.
**جرض:**
**جرض. اجرض. خنق.** خنكانی، لە بينی گيران.
**جرض: إختنق. غضّ.** خنكا، لەبينی گيرا.
**جرْض. جَريض: الريق يُغصُّ به**/ لە بين گيران.
**جرع:**
**جرع. إجترع: إبتلع. شربَ.** قوتیدا، خواردیەوە، هەڵی لوشی، هەڵی قوڕان.
**تجرّع: إبتلع. شرب شيئاً فشيئاً**/ بە شێنەيی خواردیەوە.
**إجترع إجتراعاً الماء: إبتلعه بمرّة.** نای بە سەريەوە، هەڵی لوشی، بينی پێوەنا.
**جَرْعةُ الماء: إبلعه جرعة بعد جرعة.** قوم قوم پێی خواردەوە.

جُرعة. جَرْعَة. جرعة: بَلْعَة. شَرْبَة/ قوم.

— دَوائية/ ژەمە دەرمان.

جرف:

جرف. إجْترف. كَسح/ گسکیدا، رای دا، رای مالّی.

— . — الماءُ الشيء: ذهب به/ بردی، رایدا.

جُرف. جُرُف: الجانب الذي اكله الماء من حاشية النهر/ کەند، لاپاڵ، کەندەلان.

— . — النهر/ گوێ، رۆخ، کەنار، لێوار، موزورك.

جُراف: سَيل/ لێشاو، لافاو.

مجْرف. مجْرَفَة: آلة الجرف/ رامالّ، پێ مەڕە.

جارف: طاعون/ رشانەوە.

— : الموت العام/ قرتێکـەوتن، قربـون، مردنـی گشتی.

— : البلية/ بەلا، کارەسات.

سيل — بەخوڕ، لێشاوێکی بەخوڕ.

جرم:

جرم الشيءَ. قَطعَهُ/ بڕی.

— الشيءَ. اتمّهُ تەواوی کرد، کۆتایی پێ هێنا.

— النَخْل. قطف ثمره/ بەرەکـەی لێ کردەوە، بەرەکـەی رنی.

— . أجْرم. إجْترم: إرتكب الجريمة. اذنب/ تاوانی کرد.

جرّمـهُ. تجـرّم عليه: إتهمـه بجـرم/ تـاوان بـاری کـرد، گوناهباری کرد.

جُرم. جريمة. جناية: ذنب/ گوناه، تاوان.

لاجُرم: حقاً، بێ گومان.

جريم. مُجْرم: مُذنب. جانٍ/ گونـاه کـار، تـاوان کـار، تـاوان دار.

جَرْم: زَوْرَق/ بەلەم.

جِرْم: جسم/ لەش، تەن، قالب، جەستە.

— : نجم/ ئەستێرە، هەسارە.

جريم: كبير الجسد. قەبە. زل، زەبەللاح.

جرموق: مايُلبَس فوق الحذاء/ كالۆش، سەرپێڵاو.

جرن:

جرَن على الامر: تعوّد و تمرّن عليـه/ رامـات، تیاقـاڵ بو.

— الحبَّ. طحنه/ کوتای، ماڕی، وردی کرد.

جرَّن الحصيد: كوَّمهُ كۆی کردەوە، کۆمەڵی کرد.

جُرن: حوض/ حەوز، جورنە.

— : هاون/ دەسکەوان، دیبەگ، دنگ، دۆڵ.

— : جرين: بَيْدَر/ خەرمان، کۆگە، شوێنی میوە هەڵ خستن بۆ وشك کردنەوە، جۆخێن، شتاغ.

جارن: ولد الحيّة/ تولەمار.

جرو:

جِرو. جَرو: صغير كل شيء حتى الرمان و البطيخ/ بێچو، بەچکە، تولە، جاش، جوانو، بێوڵـە، بزەڵـە، کـار، بەرخ، زەرنەقوتە، توتك، زۆڵەك، جوچك، ساوا..

— . — . جـروَة: صـغير الكلـب و الاسـد/ تولـە یـا توتکە سەگ، تێژك، بەچکەشێر.

— . — الخنزير و الدُبّ/ بێوڵە، بزەڵە.

كَلْبَةٌ مُجرٍ أو مُجرِيَة: معها جِراء/ تولـەی بەدواوەیـە، دەڵەسەگی تولە دار.

جرا:

جرى: سالَ/ رۆیی، لەبەری رۆی، چوڕا.

— : رَكَضَ. رای کرد، هەڕای کرد.

— : سار/ رۆیی، چو.

— : حدث/ رویدا.

— الى الشيء: قصدهُ/ بۆی چو.

جـرّى. أجْـرَى: جعلـه يجْـري/ ئاوەکـەی (کـردەوە، بەردا).

اجرى عليه الرزق: عَيَّنَهُ له/ بۆی بڕیەوە، دایە.

— الأمْرَ: نفَّذَهُ/ کردی، بەجێی هێنا.

— الأمْر الى فلان: فوَّضَهُ/ پێی سپارد.

— عليه قصاصاً: اوْقعهُ عليه، سزای دا.

جاري: سابَق/ پێشبڕکێ یا پێش کەوتنی کرد.

— : سايَرَ/ لەگەڵی رۆی، لێی بێ دەنگ بو.

— فِي الأمر: وافَقَ/ قایل بو.

جَـرْي. جريـان: سَـرَيان/ رۆیـین، رۆیـشتن، لەبـەرڕۆین، رەوت، دەو.

مَجْرى: مسلك. طريق/ رێباز، رێڕەو.

— البول. إحليل/ میزەڕۆ، بۆڕی میز.

— الحياة: سَيْرَها/ رێڕەوی ژیان.

— الماء: محل جرى الماء/ چـەم. گـونج، ئـاوەڕۆ، جۆ، جۆگە.

— الهواء/ باکێش، باڕەو.

جرّاء: ركّاض/ راكەر.

من جراك. من جرائك. من أجْلك. بسببك. لەبەرتۆ، بەهۆی تۆوە.

جار. راكض راكەر.

جاري. لايجفّ لەبەری ئەڕوا، وشك ناكا.

– : حاضر ئێستە. ئەم.

الشهر الجاري. السنة الجارية/ ئەم مانگە، ئەم ساڵ.

جارية: أمَة/ كەنیزەك.

– : صبية أو خادمة/ كچ، كارەكەر.

– : إمرأة زنجية/ ئافرەتی زنجی.

إجراء: إنفاذ/ بەجێهێنان، رایی كردن، كاررایی.

– قانونی/ بەجێ هێنانی یاسایی، رایی كردنی یاسایی، كار رایی یاسایی.

إجراءات: تصرفات پێویستی.

– قانونية أو قضائية. پێویستی یاسایی.

جز:

جزّ الصوف وغيرهُ. قصّهُ/ بڕیەوە.

جزّ. قصّ/ بڕینەوە، مەڕ بڕینەوە، خوری بڕینەوە.

جزّة: الصوف المجزوز/ خوری، خوری (پاش بڕینەوە، بڕاو).

جزّاز. قصّاص الصوف/ مەڕ بڕەوە، بڕێنگ (كار، وان)

مجزّ. مقص لجز الصوف/ بڕێنگ، مەوڕێنگ.

مجزوز. مقصوص/ بڕاو.

جزاز. جزاز: وقت الجز مەڕبڕینەوە، كاتی مەڕبڕینەوە.

جزأ:

جزأ. إجتزأ: قنع/ قایل بو.

جزّأ. قسّم دابەشی كرد، كەرتی كرد، لەتی كرد.

تجزّأ: إنْقسم كەرت بو، لەت بو.

يتجزّأ: ينْقسم/ لەت ئەكرێ، دابەش ئەكرێ، كەرت ئەكرێ.

لا – : لاينقسم لەت ناكرێ، بەش ناكرێ، كەرت ناكرێ، جیاناكرێتەوە.

جزء: قناعة قایلی.

جزيء:

مُجزيء: مُشْبع/ تێرەخۆر.

جُزء: قسْم/ بەش، كەرت.

– : قطعه/ پارچە.

– من عدد صحيح: كسر كەرت.

– : فصْل بەش.

– لاينفصل أو لاينجزأ بەشێك كە جیا نەبێتەوە.

تجْزأة: تقسيم/ كەرت كردن، لەت كردن، بەش كردن.

قابلية الـ – : خاصية الانقسام توانای كەرت كردن.

خاصية عدم الـ – : عدم الانقسام كەرت نەبون.

جُزئي: خلاف الكلي بەشی.

– : طفيف. كەرتێك یا پارچەیەكی زۆر بچوك، تۆزقاڵ.

جزئياً: خلاف كلياً كەمێك، تۆزێك.

جُزيْئة: جُزيء: اصغر جزء من المادة/ گەردیلە، گەرد.

جزر:

جزر. نحر: ذَبح/ سەری بڕی، كوشتی.

– البحرُ: عكْس مدّ/ نیشتەوە، گەڕایەوە، ئاوی دەریا گەڕایەوە.

جزْر: ذَبح/ سەربڕین، كوشتن.

– : عكس المدّ نیشتنەوە، نیشتاو، داچون، كشانەوەی ئاو.

جزّار: ذبّاح أو بائع اللحم قەساب، سەربڕ، گۆشت فرۆش.

جزاره: مهنة الجزّار قەسابی، سەربڕین، گۆشت فرۆشتن.

مجزر: مذْبح قەسابخانە، كەوڵگە.

مجْزرة: مذْبحة قەسابخانە، كەوڵگە.

– – : كوشتار، سەربڕین. قەلاچۆ.

جزيرة: ارض يحيط بها الماء/ دورگە.

شبه – نیوەدورگە، نیمچە دورگە، كەركە.

جزر: نبات جذره يؤكل/ گێزەر.

جزع:

جزع: لم يصْبُر/ ئارامی (نەگرت، لەبەر بڕا، نەما).

– : حزن دلگیر بو، پەست بو، پەژارەدار بو.

– له : قطع له قطْعة پارچەیەكی بۆ لێ كردەوە.

– : قلق شپرزەبو، پەشۆكا، شێوا.

– عليه: اشفق بەزەیی پیاهاتەوە.

جزع. إجْتزع: قطع منه قطعة پارچەیەكی لێ كردەوە، لێی دابڕی، لێی جیاكردەوە.

إنجزع. تجزّع: تقطع لێی دابڕا، لێی جیاكرایەوە.

جزعة. جُزعة: القليل من الشيء كەرت، جیاكراوە، لادراو، پارچەیەك لە شتێك.

جـزِعَ: ضـد صـبْر بێئـارامى، ئـارام لەبــەربڕان، شپرزەیى.
ـ : خوف. قلق ترس، شپرزەیى، پەشۆکاوى.
جزع. جازع. جزوع: ضد صبور/ بێئارام.
ـ ـ : قلقْ/ شپرزە، پەشۆکاو، مۆلەکە.
جُزع: محْور تەوەرە.
جزع. خلية النحل/ پورەى هەنگ، شانەى هەنگ.
جُزعة: مقبض السكين/ دەسکى چەقۆ، مشتۆ.
ـ جزعة: القليل من الشيء/ کەمێك، تۆزێك.
جزع: نوع من العقيق سلیمانى.
جزف:
جزف. جازف: باع على التخمين بەگوترە فرۆشتى.
ـ . ـ : خاطر هەڵەشەیى کرد، سەرەڕۆیى کرد، جەربەزەیى کرد.
ـ . ـ : تصرف بلا تبصُّرُ/ کوێرانە کردى.
جُزاف: من غير تبصُّر/ کوێرانە، گوترەکارى.
جُزافاً: عفواً. صُدفة/ ڕێکەوت، بە ڕێکەوت، لەخۆیەوە، کوێرانە.
مُجازف: مُتسرِّع/ هەڵەشە، سەرەڕۆ، سەرچڵ، جەربەزە.
مُجازفة: طيش. هەڵەشەیى، سەرەڕۆیى، نەترسى، جەربەزەیى، کوێرانە، گوترەکارى.
جزوف: المتجاوزة حد ولادتها کاتى زایینى بەسەرچو، بەو ئافرەتە ئەڵێن کە کاتى منالّ بوونەکەى تێپەڕى کردبێ.
جزل:
جزل: جعل الشيء قطعتين/ کردى بە دو (کەرتەوە، لەتەوە، پارچەوە، بەشەوە).
جزُل: وفر. زۆربو، فرەبو.
ـ المنطق: فصُح قسە (ڕەوان بو، پاراو بو).
اجْزل له العطاء: أوْسعهُ و اكثرهُ/ زۆرى پێ بەخشى، فرەى پێدا، گەلێکى دایە.
جزْل. جزيل: وافر كثير زۆر، فرە، گەلێك.
ـ . ـ : فصيح زمان پاراو، زمان ڕەوان.
جزيل: الكثير من كل شيء زۆر، فرە.
جزيل الاحترام ڕێزێکى زۆر.
شُكرٌ جزيل گەلێك سوپاس.
خيْرٌ جزيل. سودى زۆر، پیتى زۆر.
جزالة: وفرة زۆرى، فرەیى.

ـ المنطق: فصاحة/ زمان پاراوى، زمان ڕەوانى.
جزلة: قطعه. شرحة پارچە، کەرت، توێژاڵ، بەش، کوت.
جوزل: فرخ الحمام/ زەرنەقوتەى کۆتر، بێچوى کۆتر.
جزم:
جزم: قَطع/ بڕى، بڕیەوە.
ـ الأمر: بتّ. فصل في الأمر/ بڕیارى لەسەردا، بڕانیەوە، ناگەڕێتەوە.
ـ على الأمر. عزم بڕیاریدا، نیازى کرد.
ـ عليه الأمر. أوْجبهُ بڕیارى بەسەرا درا، ئەبێ بیکا.
ـ . جزّم: ملأ/ پڕى کرد.
جزْم: بتّ/ بڕیار، بڕیاردان، بڕانەوە.
أمرٌ ـ حُكْمٌ ـ : لا عودة فيه بڕیار لەسەر دراو، کارێکى بڕیار لەسەر دراو.
جازم. مجزم. ملآن پڕ، لێواولێو، لێوان.
ـ : بات بڕیاردراو، جێگیر.
مجْزوم فيه: مُقرَّر بڕیار لەسەردراو.
حَرف ـ : مسكون/ پیتى کپ، نەبزێو.
جزمة: الكلة واحدة ليلاً او نهاراً یەك ژەم خواردن شەو یا ڕۆژ.
ـ : حذاء پێڵاو.
ـ : حذاء طويل جزمە.
جزى:
جزى الشيء: كفى. بەشى کرد.
ـ جازى: كافأ خەڵاتى کرد، بەشیدا، پێى دا، دایە.
ـ . ـ : عاقب/ سزاى دا.
ـ و أجزى عن: قام مقامه و اغنى عنه/ لەجێى، لە جیاتى، لەبرى ئەو کردى.
جزاء. جـزاء. مجازاة: مُكافاة/ خەڵات، بەش دان، پێدان، پاداشت دانەوە.
ـ : قصاص/ سزا.
ـ نقدى: غرامة/ بژاردن.
جزائي: قصاصى عُقوبى سزایى.
جزْية: اتاوه سەرانە.
ـ : خُراج الارض باجى زەوى، زەویانە.
جس:

جسّ. إجْتَسّ الارض: وَطِئها پێی تێخست، چوه ناو زەویەکەوە.

— . — : مسّ بەری کەوت، لێی کەوت، دەستی لێدا، دەستی پیاخشاند.

— . — . تجسَّس الاخبار: بحث عنها/ گوێی هەڵ خست، گوێی گرت، سوسەی کرد.

— . — تجسّس: قام بالتجسُّس سیخوڕی کرد، جاسوسی کرد.

— بعَيْنيه. أحد النظر اليها/ تێی ڕوانی، چاوی تێ بڕی، لێی وردبوەوە.

— نَبْضَهُ: أخذ نبضه/ ترپەی دڵی گرت.

— نَبْضَهُ: استطلعه دەم و دوانی تاقی کردەوە، ویستی شتێکی لێ تێ بگا.

مجسّ. موضع اللمس شوێن دەست لێدان.

— . صدر/ سنگ.

ضيّق الـ — : غير رحب الصدر دەرون فراوان نیە، میهرەبان نیە، توڕەو تڕۆیە.

مجسّ: مِسْبَر شاخی مێرو، هەستار، هەستەوەر.

جاسوس: مستطلع الاحوال. رقيب سیخوڕ، جاسوس.

جاسوسية: مهنة الجاسوس سیخوڕی، جاسوسی.

جسأ:

جسأ: تصلّبَ/ ڕەق بو، پتەوبو، سەخت بو، وشك بوەوە.

— : غلظ وخشُنَ سەخت و زبر بو، کرژ بو.

جاسيء: خشِن/ زبر.

— : صُلب. قاسٍ سەخت، ڕەق، دڵ ڕەق.

جسد:

جسِد الدمُ به. لصق خوێنەکەی پێوە (نوسا، مەیی).

تجسّد: صار ذا جسد/ دروست بو، تەنی کرد، تەنداربو.

جسيد: الدم اذا يبس خوێنی (مەیيو، وشکەوەبو).

جسدٌ: جسم لەش، تەن، قالب، جەستە.

مُتجسِّد: ذو جسد تەندار.

جسر:

جسر على الأمر: اقدم دەستی پێکرد، بۆی چو.

— : بنى جسراً پردی دروست کرد.

— . تجاسر: تطاول/ دەست یا دەم درێژی کرد، بەرەنگاری کرد.

— : إجتسر: عبر پەڕیەوە.

جسُر: شجُع هانیدا.

جَسارة: جَراءة توانایی، ئازایی، ئازایەتی، زاتکردن.

— : وقاحة بێحەیایی، ڕوهەڵ ماڵڕاوی.

جَسور. جاسر: شُجاع/ ئازا، بەزات، بەتوانا، بەجەرگ، بێپەروا، گوستاخ.

جسّار: شديد الجُرأة زۆرئازا، هیچ نەترس، بێبیم، بێپەروا.

جِسْر: قنطرة پرد.

— مُتحرك/ پردی بزۆك.

— مُعلّق پردی هەڵواسراو.

— البناء/ جیسر.

— البنّاء داربەست.

جسم:

جَسُم: عَظُم گەورەبو، زل بو.

جسَّمَ: عظّم گەورەی کرد، زلی کرد.

— : بالغ/ پێوەی نا، فیشاڵی کرد.

تجَسّم: صار جسيماً گەورەبو، قالبی بەست.

جُسمان. جسم: جُثمان تەن، لەش، جەستە.

جسم: بدن تەن، لەش، داروبار، جەستە.

— : مادّة توخم.

— : كُتْلة قەبارە.

— : شكل/ شێوە، دیمەن.

جسيم: عظيم/ گەورە، زل.

— : ضخْم کەتە، زەبەللاح، تێکسمراو.

— : بدين. سمين. قەڵەو، تێك سمراو، تەن و مەند، خپو (پڕ، خەپان، خۆڵ).

جسامَة: عَظمَة گەورەیی، گرنگی.

— : ضخامة/ کەتەیی، گەورەیی، زەبەللاحی.

مُجسَّم/ تەندار.

جُسَيْمَة تەنۆکە.

جشّ:

جشّ. اجشَّ: دقّ و كسر کوتای، تێکی شکان، هاڕی.

جُشّة الصوت: بحّة دەنگ نوساوی، گڕی، زڕی.

اجش: غليظ الصوت دەنگ زل، گڕ، دەنگ گڕ.

— : صوت أبحّ دەنگی نوساو، دەنگ نوساو، زیی.
جَشيش: طحين خَشن/ ئاردی زبر، برویش.
مِجَش. مجَشّة: رَحى/ دەستاڕ.
جشأ:
جشأ تَجشّأ: اخرج من فمه الجُشاة/ قرقێنەی دایەوە.
جُشأة: جُشاء: ريح يُخرَج من الفم مع الصوت/ قرقێنە.
جشع:
جَشَعَ: طمع/ چلێسی کرد، نەوسنی، چاوچنۆکی کرد.
جَشع: طمّاع/ چلێس، نەوسن، چاوچنۆک، چاوبرسی.
جشم:
جشِم. تَجَشَّم: قاسى المشقّة/ چێژتی، سزای چەشت.
جشَمْ. جُشُمْ: الأمر الثقيل/ سزا.
جص:
جَصَّصَ الجرو: فتح عينيه/ چاوی (پشكوت، كرايەوە).
— البناءَ: طلى بالجُصّ/ گەچکاری کرد، سپیکاری کرد.
جصّ. جِصّ: جبس/ گەچ.
جَصّاص: بائع الجصّ/ گەچ فرۆش.
جصّاصة: مصنَع الجصّ/ کورەی گەچ.
جع:
جعْجع: اجْلب/ ژاوەژاوی کرد.
— البعير: برك/ چۆکی دادا.
— بالغريم: طالبه و ضيق عليه/ سەری کردە سەر، تەنگاوی کرد.
جَعْجَعة: صوت الرحى/ کرەی دەستاڕ، هاڕەی دەستاڕ.
— : جلبه/ ژاوەژاو، قاووقیژ.
— بلا طحْن/ يُقال للجبان أو البخيل يوعد ولا ينجز/ فشەکەر، خۆ هەڵ کێش.
جعب:
جَعبة: كنانة/ هەگبە، خورج، تورەکەی تیر.
جعد:
جَعّدَ الجلد و الثوب وغيرهما: غضّنَ/ لۆچی کرد، چرچی کرد، ژاکانی.
— الشعر. موّج/ لولی کرد.
جَعُدَ. تجعّدَ الجلد و الثوب: تغضّنَ/ چرچ بو، کرژبو، لۆچ بو، ژاکا، هەڵ قرچا.
جعْد من الشعر: مُتموّج/ لول.
— في الجلد أو الثوب: مُغضّن/ چرچ و لۆچ، گرژ.
— اليد: بخيل/ پیسکە، بەرچاوتەنگ، دەست قوچاو.
رجُل — : لئيم/ رژد.
مُجَعّد: مُخضّن. مُتموّج/ کرژ، گرژ، لول، چرچ و لۆچ، لۆچ، ژاکاو.
جبين — / ناوچەوان گرژ.
جعر:
جَعَرَ السَبُعُ: تغوّط/ پیسایی کرد، گوی کرد.
جَعَّر: جار/ نەرانی، زریکانی.
تَجعَّرَ: شدّ وسطه بالجِعار/ پشتێنەی خۆی بەگوریس بەستەوە.
جَعْر: نَجو السَبُع/ پیسایی یا گوی شێر.
جَعار: أبو جَعار، ام جَعار: ضبع/ کەمتیار، گوکەر.
ابو جِعْران: جُعَل/ قالۆنجەی دەشت کە تەرس کۆئەکاتەوە، گوخلێنکە.
جعار: حبْل يشُدُّهُ المستقي عند نزوله الى البئر گوریس، ئەو گوریسەیە کە لە پشت هەڵ ئەکێشرێ لەکاتی خۆ شۆرکردنەوەدا.
جَعَل:
جَعَلَ: صَنَعَ/ دروستی کرد، پێکی هێنا.
— : ظَنَّ/ وای زانی.
— : صَيَّرَ/ کردی بە..
— : وضَعَ/ دایهنا.
— : أعطى/ دایە، پێیدا.
— يفْعلُ كذا: شرعَ/ دەستی پێکرد.
— له كذا: عيّنَهُ/ دایهنا، دایمەزراند.
جُعْل. جِعالة. جعال. اجرة/ کرێ، مز، رۆژانە.
— . — : جائزة/ خەلات، بەخشیش.
— . — : عُمولة/ پێشەکی.
جَعالة: رشوة/ بەرتیل.
جعال: خرقة تُنزّل بها القدر/ دەسکرە، دەزگرە.
جُعَل، جِعلان: ابو جِعْران/ خلێنکە، گوخلێنکە، کازۆلك.
جَعا:

جعة. بيرة: خمر الشعير بيره، ئاوی جۆ، سەرخۆشکار.

جفر:

جفرافيا. جُغرافيا. جُغرافية/ جوگرافيا.

جف:

جفّ: يبس/ وشك بوەوە، کزربوەوە.

جفّف: يبّس وشکی کردەوە.

جفاف: يبوسة وشکی.

جاف. جفيف: يابس وشك

تجفيف: تنشيف/ وشك کردنەوە، وشك بونەوە.

مُجفّف. مُنشّف/ وشك، وشك کراوە.

مُجفّف، مُجفّفة: آلة التجفيف وشکار.

جفيف: مايبس من النبت/ وشك کراوە، وشکەوەبو.

تجفاف: آلة للحرب يُتّقى بها كالدرع زرێچە.

جفجفة. صوت الثوب الجديد/ ورشە.

جفل:

جفل: اجفل: نفر و شرّد مەڵی تێزان، بەلەسەبو.

– : – . فرّ راچەنی، راچڵەکی، راپەڕی، سڵەمیەوە.

جفل: جُفول/ راچەنین، راچڵەکین، راپەڕین، سڵەمینەوە.

اجفيل: جبان ترسنۆك.

جُفال: رَغْوة کەف.

جفن:

جفْن: غطاء العين پێڵو، پەڵك.

– : غمد السيف کالان، کێلان.

جفْنه: القصعة الكبيرة لەگەن، تەشت.

جفا:

جفا. جافی. تجافی: ضد واصل فەرامۆشی کرد، گوێی نەدایە، کەم تەرخەمی کرد.

– . اجفی: اتْعب/ میلاکی کرد.

– : خشُن رەق بو، وشك بو، دڵ ڕەق بو.

تجافی. تنحّی لاچو، دورکەوتەوە، خۆی لادا.

جفو. جفوة. جفوة. جفاء: غلظ في المعاشرة لالوتی، دڵ رەقی، سزادان، بەتەنگەوە نەهاتن، فەرامۆش کردن.

جفاء: غلاظة دڵ رەقی، سزادان.

جافٍ: خشن/ دڵ رەق، تورە، تڕۆ.

جل:

جلّ: تقدّم في السنّ چوەساڵەوە، پیربو.

– قدْرُه: عظُمَ گەورەی کرد، شکۆداری کرد. رێزی لێ نا.

– الشيء: اخذ مُعظمهُ بەشی زۆری برد، زۆرەکەی برد.

– : تجالّ عن كذا: تنزه و ترفّع روسوربو، روسور دەرچو.

– : خرج من بلده رەوی کرد، رای کرد، دەرچو، رۆیشت، ئاوارەبو.

– الفرس. البسه الجُلّ کورتانی لێ کرد، زینی کرد.

جلّل: غطّی دای پۆشی.

– : اجلّ: عظّم/ گەورەی کرد، شکۆداری کرد، رێزی لێ نا.

– – . كرم. بجّل رێزی لێنا، رێزی گرت.

– – . عن كذا: تنزه وترفع روسوربو، روسپی دەرچو.

جُلّ. ورد گول، گوڵەباخ.

– اوجُلّة الشيء: مُعْظمه بەشی زۆر، بەشە زۆرەکەی.

جلال: سناء سەربەرزی، مەزنی.

– : جلالة: عظمة شکۆ، مەزنی.

صاحب الجلالة/ خاوەن شکۆ.

جَللْ. جُلّی: عظيم. هام/ گەورە، مەزن، شکۆدار.

جُلّة. جلّة. جلّة الحيوان: بعر/ پشقل، تەرس، پیسایی، ریخ، پەیین،تەسەقول.

جليل: عظيم گەورە، شکۆدار، مەزن.

– : مُحْترم بەرێز.

– . جُلّ: مُسِنّ/ بەساڵاچو، پیر.

صاحب المقام الجليل خاوەن شکۆ، پیاوماقوڵ، بەرێز، شکۆدار.

تجلّة. إكرام رێزگرتن، شانازی.

جلّ من المتاع: بُسُط و اكسية راخەر، پێخەف.

جالية. جالّه: الجماعة المستوطنه في غير أوطانها ئاوارە، ئاوارەکان.

مجلّة: صحيفة دوْريّة کووار، گۆڤار.

جلب:
جلب: أحْضَر. ئامادەی کرد.
— : جاء بكذا هێنای.
— عليه. سبَّب بو بەهۆی، توشی کرد.
— الجُرح: ربَى جُلْبةً. بريء قەتماخەی بەست، وشکی کرد، گوشتەوزونی کرد.
— النظر: جذبه سەرنجی راکێشا.
— أجلب لأهله: كسب بۆی پەیاکردن، دەستی کەوت.
— . أجلب القومُ: تجمعوا، کۆبونەوە.
— . — القومُ: ضجوًا کردیان بە ژاوەژاو.
— — الدمُ. تخثّر مەیی.
— . إجتلب. استجلب: استورد. جاء به/ هاوردی، هێنای.
— . — — : حصل على دەستی کەوت.
جلْبٌ: إحضار ئامادەکردن، هێنان.
— : تسبُّبٌ بونە هۆ.
— . إجتلاب: اكتساب. دەسکەوتن، پەیاکردن.
— . استجلاب: استيراد هاوردن، هێنان.
جلب. جليب. مجلوب: ما يُجْلب من بلد الى بلد هێنراو.
— . جلبة: ضوضاء ژاوەژاو، دەنگەدەنگ، قاووقیژ.
جُلْبة: قشرة الجرح عند البرء قەتماخە، توێك، توێخ.
جلاّب: تاجر بازرگان، هێنەر، بهێن.
— : نخّاس. مَنْ يجلب العبيد/ بەندەهێن، بازرگانی بەندە.
— : المصوّت السيء الخلق بێ حەیا، بێ ئابرو، ژاوەژاوکەری بێ ئابرو و رەوشت پیس.
جلابيّة. جلباب: رداء عريض کراسی پان و پۆر، دیزداشە.
جالب: مُحضّر هێنەر، ئامادەکەر، پێك هێنەر.
مجْلبة: مُسبّب هۆ، ماندەر.
جلباب. ثوب واسع دیزداشە، کراسی پان وپۆر
جُلاب: ماء الورد گولاو
— : شراب حُلو شەربەتی گولاو.
جُلّبا: نبات شب الليل لالەباس.
جلجل: جلْجل الرجُلُ: صوّت شديداً قیژانی، هاواری کرد، نەڕانی.
— الصوت: دویّ دەنگی دایەوە، تەقیەوە.
جَلْجَلة: تَرَدُّدُ الصوت. دەنگ دانەوە، تەقینەوەی دەنگ.
مُجلْجِلٌ حاد النغمة/ دەنگ تیژ، دەنگ زولاڵ.
جُلْجُلٌ. جلْجلة: جرس صغير/ زەنگۆڵە.
— : شحاذ العين/ ریپۆق.
جُلجلان: سمسم اوكزبرة کونجی یا گژنیژ.
جلح:
جلح: سقط شعْرهُ. سەری روتایەوە.
اجْلح: اصلع/ روتاوە، بێ توك.
ثور — : لا قرْن له گای بێ شاخ.
سطح — : لم يُحْجز بجدار. گای بێ شاخ، سەربانی بێ ستارە.
جلخ:
جلّخ الموس على الحجر: حدد و صقل لە هەسانیدا، تیژی کرد.
— — على الجلد. لە قایشی دا، بە قایشیا هێنا، تیژی کرد.
مجْلخ آلة حد السكاكين چەرخ، هەسان.
جلد:
جلد. جلده بالسوط: ضربه بها بەقامچی لێیدا، فەلاقەی کرد، جەڵدەی لێدا.
جلُد: كان ذا صلابة پتەو بو، بەرگەی گرت، بە ئارام بو.
جلد اجْلَد: تجمّد بالبُرودة بەستی، کرژ بو.
جلّد اجْلد. جمَّد بالبرودة بەستانی، هێناوە یەك.
— الكتاب: البسه الجلد. بەرگی تێگرت، جزوبەندی کرد، لەبەرگی گرت.
تجلّد صبر على الشدة ئارامی گرت.
جالد: صارع/ زۆرانی گرت.
— ه. تجالدوا. إجتلدوا بالسيف: تضاربوا شیربازیان کرد.
جلْد: الضرب بالسياط بە قامچی لێدان، فەلاقەکردن، جەڵدە لێدان.
— : الشديد القوى بەزەبرو زۆنگ، بەهێز.
جلْدة. مجلَد. مجلدة. مجلاد: سوط قامچی
— : ضربة سوْط. فەلاقەکردن، دارکاری کردن، جەڵدەلێدان.
جلد: غشاء كل جسم پێست، چەرم، توێکڵ، بەرگ، کاژ.

- الانسان/ پيست، چەرم.

- الحيوان قبل الدبْغ/ پێستە، كەوڵ.

- مدبوغ/ چەرم، گەلاسی، مێشن، قەڵناخ، سەختيان، پێستە.

- : غلاف/ بەرگ.

- اللبّة/ بەردوگ.

- الحيّة: سلاخ/ كاژ، كاژی مار.

**جِلدة.** العشيرة والاقرباء/ خزم و خوێش. كەس و كار.

**إبن جِلدَتِك:** مِنْكُم/ لە خۆتانە، لە خزمانتانە، كەسی خۆتانە.

**هُم من جلدتنا:** من عشيرتنا/ لە خۆمانن، خزمن، كەسن، خوێشن.

**جلَدَ. جَلادە:** صبْر/ ئارام، ئارام گرتن، تاقەت.

- : القوة و الشدّة/ زەبرو زەنگ.

الـ - : السماء أو القُبّة الزرقاء/ ئاسمان.

**جليد:** ذو القوة و الصبر/ بەهێزو بە ئارام.

- : عكس بليد/ وريا، ژير، زيرەك.

- : ماء متجمد/ سەهۆڵ، زوقم.

جبل - / شاخەبەفرين، سەهۆڵە شاخ.

مركبة الـ - . مزلَجَة/ خليسكە.

التزليج على الـ - / بەفرەخلێسكێ.

**جلاّدة.** (كداس من الجليد/ بەستەڵەك.

**جليدي:** بەستو.

العصر الـ - /دەمەی بەستو.

**جَلاّد:** تاجر الجلود/ پێستەفرۆش.

- : الذي يضرب بالمجلد. المعذب/ جەڵداێدەر، فەلاقەكەر.

- : منفذ حُكم الاعدام/ سەربڕ، بكوژ، خنكێنەر، پیاوكوژ، جەلاد.

**مُجلِّد الكتب:** نطّاع/ بەرگ تێگر، جزوبەندكار، سەحاف.

**مُجالد:** مصارع/ زۆران باز، پاڵەوان.

**مُجالدة:** مُصارَعة/ زۆران بازی، پاڵەوان بازی.

**تجليد الكتب:** تغليف. حبْك الكتب/ بەرگ تێگرتن، جزوبەندكردن، شیرازەكردن.

- الحيطان: تكسية/ دیوارپۆشین، تەختەبەنگ، تێگرتن، روكەش كردن.

- الماء و السوائل: تجميد بەستن.

**مُجلَّد:** مُجمَّدْ، بەستو.

- : كتاب محبُوك/ بەرگ تێ گیراو، جزوبەندكراو.

- : كتاب او جزء منه/ جلد، بەند، بەست، بەرگ، پەڕتوك، بەشێك لە پەڕتوك.

عظم - : لم يبق عليه الا الجلد/ هەر پێستەكەی ماوە، پێستەكەی بە ئێسقانەكەیەوە نوساوە.

**جُلذ:**

**جُلْذ** (جمع مناجذ). الفار الاعمى. خُلد/ مشكە كوێرە.

**جلز:**

**جلَز.** شَدَّ طرفَه/ سەرەكەی گرێدا.

**جِلاز. جِلازة:** السيْر المشْدود في طرف السوْط/ گرێی سەری قامچی.

**جلّز.** ذهب مُسرعاً/ چابوكانە بۆی دەرچو، بە جرت و فرت بۆی دەرچو.

**جلْوز:** كان يخُفُّ في ذهابه و مجيئه/ لەش سوك و چابوكانە هاتوچۆی دەكرد، جرت و فرتی كرد.

**جلْوزة.** خفّة في الذهاب و المجيء/ لەش سوكی لە هات و چۆدا، جرت و فرت كردن.

**جلواز. جلاوزە/** بەردەست، كاسەلێس، چلكاوخۆر، ئیش كەر.

**جلس:**

**جلس:** قعد/ دانیشت.

**اجْلَس. جَلّس:** اقْعَدَ/ دای نا، داینیشان.

**جالس:** قعد مع/ لەگەڵی دانیشت.

**استجلس:** طلب منه الجلوس/ دانیشەی لێ كرد، دانیشتنی لێ خواست.

**جِلْسة:** المرّة من الجلوس/ دانیشتنێك.

- . جلوس: قُعود/ دانیشتن.

- . مجلس: جلسة رسْميّة/ كۆبونەوە، دانیشتن، كۆڕگرتن.

**جليس:** رفيق/ هاوڕێ، هاودەم، یاوەر.

**جِلْسة:** هيئة الجالس/ چۆنیەتی دانیشتن.

**جُلَسَة:** كثير الجلوس/ زۆر دادەنیشن، نیشتەك، نیشۆك.

**جالس:** قاعد/ دانیشتو.

مجلس: موضع الجلوس/ نیشتگە، شوێن دانیشتن، کۆڕ، ئەنجومەن، دوانگە، کۆمیتە.

جلط:

جلَطَ: حلَف و کذَب/ سوێندی خواردو درۆی کرد، بەدرۆ سوێندی خوارد.

— السیف: سلَّهُ/ هەڵی کێشا. شمشێرەکەی هەڵ کێشا.

— الجلد: خدش و نزَع/ روشانی، دایماڵی، پێستەکەی داماڵی، گروی.

— الرأس: حلقهُ/ پاك سەری تاشی، سفری کرد، کردی بەکەللەشەك.

جلْط: خدْشْ و نزْع/ روشاندن و پێست داماڵین.

مجلوط: مسحوج/ روشاو، پێست داماڵراو.

جُلْطة: جُزْعة خاثرة من اللبن الرائب/ ماستی بزرکاو کە بوە بە تۆپەڵ.

— دمويّة: تخثُّر جُزْعة من الدم في الوريد/ خوێن مەیین لە خوێن هێنا.

جلُوط. إمرأة جلُوط: قليلة الحياء/ ئافرەتی روهەڵ ماڵراو، بێ حەیا.

جلع:

جلِعَ اجْلَعَ: كان قليل التربية/ بێ حەیابو، بێ تەربیە بو.

جلِع. اجْلَع. جلِعة. جلعاء: لاتنظم شفتاه على اسنانه/ بەوانە ئەڵێن کە دەمیان جوت نابێ، دەم کراوە.

جالِع. جلعم. قليل الحياء/ بێ حەیا، زمان پیس، بێئابرو.

جلف:

جلَفَ: قشَر. نَظَفَ/ پاکی کردەوە، ساویەوە، شەوقی پێ هەڵ هێنا، سیلی کرد.

— . إجْتَلَفهُ الدهْر. اذهَبَ ماله/ لات کەوت، هیچی نەما.

جلف: البدن لا راس عليه/ لاشەی بێ سەر.

— : الظرف و الوعاء/ دەفر، قاپ.

— : الاحمق/ گەمژە، تێ نەگەیشتو. وشك، کوستەبابی.

— : حرف الرغيف/ تەراخە کولێرە.

— . جَليف: الغليظ الجافي/ دڵ رەق و بێ بەزەیی، زۆر وشك.

— . — : الظالم/ زۆردار، ستەم کار.

جلم:

جلم الصوف: جزّه/ خوریەکەی بریەوە.

جلم: مقصّ الجزّ/ برێنگ، مەورێنگ.

جلْمَد. جلمود: صخر. بەرد. زۆر رەق، حەلان.

جلا:

جلا. صقل/ تیژی کرد، لە هەسانیدا، ساف و لوسی کرد، ساویەوە، ساویدا.

— عنه الهم: أزاله/ خەمی رەوانەوە.

— عنه كذا: دفَع/ لێی دور خستەوە.

— الامر: أوضحه/ ئاشکرای کرد، رونی کردەوە، دەری خست، یەك لایی کردەوە.

— . اجلى عن: رحَل/ کۆچی کرد، رەوی کرد، چۆڵی کرد.

— . انْجلى. تجلّى: إتضّح/ ئاشکرابو، رون بوەوە، دەرکەوت، زانرا.

— النحل: دخَنّ عليها/ قانگی دا.

— البصر بالكحل: رَوَّقهُ/ رشتی بەکل، چاوی رشت.

اجلى: أبْعد. طرد/ دەری کرد، دوری خستەوە، پێی بەجێ هێشت.

إنْجلى عن كذا: انتهى بكذا/ بەوە کۆتایی هات.

— : إنصقل/ سوایەوە، تیژبو، ساف و لوس بو.

تجَلّى: ظهر و إنكشف/ ئاشکرابو، رون بوەوە، دەرکەوت، زانرا.

تجالى: إنكشف كل منهم لصاحبه/ لەیەك ئاشکرا بون.

استجلى: استكشف/ گەڕا، پشکنی، گەڕابەدوای.

جَلْي. جَلو: صقل/ ساوینەوە، تیژکردن، ساف و لوس کردن.

جلاء: وضوح/ ئاشکرایی، رونی، زانراوی، دیار.

— : رحيل/ رەو، کۆچ، رەوکردن، کۆچ کردن، بەجێهێشتن.

إجلاء: انسحاب/ کشانەوە.

— : تخلية/ چۆڵ کردن.

جَليٌّ: **واضح**/ ئاشكرا، رون، زانراو، ديار.
**جَليّة الامر: الخَبَراليقين**/ هەواڵی ڕاست.
— **الامر: ماظهر من حقيقته**/ ئەو راستیەی کە ئاشکرابو.
**جليّاً: بوضوح**/ بەئاشكرايى، بەرونی.
**تَجلٍّ: ظهور**/ ئاشكرابون، دەركەوتن، پێزانین.
**جَلا: وضوح**/ ئاشكرايى، رونى، زانراوى، ديار.
**إبن — : واضِح**/ ديار، ئاشكرا.
**إبن — : الصُبح**/ بەيانى.
**إبن — : القمر**/ مانگ.
**جالِيَة: الجماعة المستوطنة في غير اوطانها**/ ئاوارە، ئاوارەكان، نيشتەجێ لە نيشتمانى تردا
**جِلاء: كحل**/ كل.
**جلوة: هدية الزواج**/ ديارى دواى شەوى پەردە.
**جم:**
**جَمَّ. جَمَّمَ. تَجَمَّمَ: كَثُر**/ زۆربو.
— . — : **ملأه لحافته**/ لێوان لێوی كرد، پڕی كرد.
— . **اجمّ: اراح**/ پشوى پێدا، حەوانیەوە.
— : **تجمَّعَ**/ كۆبوەوە، كۆبۆتەوە.
— : **دنا وحان**/ كاتى هاتوە، وەختیەتی.
**إستَجَمّ الماء: تجمع بِكثره**/ ئاو زۆر بوە، ئاو زۆر كۆبۆتەوە.
— **عافيته: شُفي . إسترجع قُوّتَهُ**/ پشویدا، هاتەوە سەرخۆی، چاك بوەوە.
— **ت الارض: خرج نبتها**/ سەوز بو، شین بو، روا.
**جَمٌّ. جَمّ: الكثير من كل شيء**/ زۆرى، زۆر لە هەر شتێك.
— **غفير: عدد كثير**/ خەڵكێكی زۆر.
— **النشاط: النشاط الكثير**/ چالاكى، چابوكى، چوستى، گورجی.
**جمّام: ممتلىء للحافَة**/ لێوان لێو، زۆرپڕ، لێوان.
**استجمام الراحة: استرجاع القوى**/ پشودان، هاتنەوە سەرخۆ.
**اجمّ: لاقرن له**/ بێ شاخ، كۆڵ.
— : **مُحارب لا سلاح له**/ شەركەرى بێ چەك، جەنگاوەرى بێ چەك.
**جَمجَمَ. تَجَمجَم الكلام: لم يبينه**/ پچڕپچڕ قسەی كرد، نەیبزركان، لەبەر خۆیەوە ئەدوا.

**جُمجُمَة: قحف**/ كاسەى سەر، كۆچەڵەى سەر، كاپول.
**جمح:**
**جمح الحصان: تغلب على راكبه و ركض**/ ياخى بو، بەلەسەبو، سەركێشى كرد، هەڵیتیزان.
— **الرجل: ركب هواه**/ شوێن ئارەزوى خۆى كەوت، دواى هەوەس كەوتوە، ياخى بوە.
— **ت المراة زوجها: هجرته**/ تۆرا، مێردەكەى بەجێهێشت، ماڵى بەجێهێشت، وازى لەماڵ و مێردەكەى هێنا.
**جامح. جَموح: عَنيد، عاصى**/ ياخى، راكردو، بەلەسە، سەركێش، هەلەت، قیرسچمە.
**الجامح من الحصان**/ سەركێش.
— **من النساء**/ تۆراو، هەڵاتو.
**جُمّاح. جماع: المنهزمون من الحرب**/ ياخى، راكردوان لە جەنگ، فیرار.
**جماح: هوى**/ ئارەزو، هەوەس، خەیاڵ.
**كبح — ـه: قمع هواه**/ داى مركانەوە، دابینی كرد، ئارەزوى شكاند. لە خەياڵی دا، لە لوتیدا، لوتی شكان، راى هێنا.
**جمد:**
**جَمَد الماءُ: صار جليداً**/ بەستی، بو بە سەهۆڵ.
— **الدمُ: تيَبّسَ**/ مەیی، بەستی، وشك بوەوە.
— . **اجمد: بَخُل**/ پیسكەیی كرد، چڵێسی كرد.
— **عينه: إنقطع دمعها**/ وشكی كرد، ئاوى چاوى وشكی كرد.
**جمَّد: يَبَّس**/ رەقی كردەوە، وشكی كردەوە.
— : **خثَّر**/ مەیانی.
— **بالبرودة. لجَمد: صَيَّرهُ يجْمد**/ بەستانی، كردی بە سەهۆڵ.
— **الاموال المنقولة: اوقفها في المصرف**/ وەستانی، دەستی بەسەراگرت، پارەكانی نواند.
**جمُد: يَبُس**/ وشك بوەوە، رەق بو، رەق هەڵات.
— . **تجمَّد. تيَبَّس**/ رەق بوەوە، وشك بوەوە.
— . — **الدم: تَخَثَّر**/ مەیی، بەستی.
— . — **المزيج السائل: عقد**/ بزركا.
— **ت يده: بَخُل**/ پیسكەیی كرد، چڵێسی كرد.

جَمْدٌ. جَمَدٌ. الماء الجامد/ ئاوی بەستو.
جَماد: ارض/ زەوی، خاك.
— : مالا حياه له/ بێ رۆح، بێ گیان.
— الكف: بَخيل/ پیسكە. چلێس.
عَيْنٌ — : لاتَدْمَع/ فرمێسك ناكا، چاوی بێ فرمێسك.
سنة— : لم يصبها مطر/ ساڵی وشك، بێ بارانی.
جامِد: صَلب/ رەق. وشك.
— : مُتَجَمِّد/ بەستو.
— : خاثِر/ مەبیو.
— : عديم الحركة/ بێ جوڵە، نەبزێو، نەبزۆك.
جُمود: عدم حركة/ بێ جوڵەیی، نەبزێوی، نەبزۆكی.
— : قصور ذاتي/ سستی.
— . جُمودَة: صَلابَة. مَتانَة/ رەقی، پتەوی.
تجَمُّد بالبرودة/ بەستن، بون بەسەهۆڵ.
— . تَخَثُّر/ مەیین.
تجميد/ بەستن، بەستانن.
مُتَجَمِد بالبردوة/ بەستو.
— : خاثِر/ مەبیو.
المنطقة المتجمدة الشمالية/ هەرێمی بەستوی باكور.
— — الجنوبية/ هەرێمی بەستوی باشور.
مُجَمَّد/ بەستو.
إنجماد/ بەستن.
ضد الـ — / دژ بەست.
درجة الـ — / پلەی بەستن.
مُجمِّدة/ بەستەن، بەستێن، سەهۆڵگە.
جمر:
جَمَّرَ. اَجْمَرَ. جَمرَ. إستجمر القوم على أمر: تجمعوا و إنضموا/ كۆبونەوەو یەكیان گرت.
— ت — ت المرأة شعرها: جمعته الى الوراء و عقدته و لم ترسله/ پرچی لە دواوە (بەست، گرێدا).
— اللحمَ: وضعه على الجمر/ برژانی، خستیە سەر ئاگر.
— النَخْلَةَ: قطع جُمّارها/ كرۆكی دارخورماكەی دەرهێنا.
جَمْرَة: إنضمام القوم يداً واحداً/ یەكیەتی، كۆبونەوەو یەكیەتی.
— : بَصوَة نار/ پشكۆ، سكڵ، پزلو، پەنگر.
— خَبيثة: خُراج فتَّاك مميت/ ئارنگ، تیراوێ.
— : حصاة/ چەو، وردە بەرد.
مِجْمَرة النار: موقد/ ئاگردان، كوانو.
— البخور: مبخَرَة/ ئاگردانی بخورد، بخوردان.
جَمْر: نار متقدة/ ئاگری گەش، پشكۆ، سكڵ.
على أحرَّ من الجمر: على نار/ لەسەر ئاگر، زۆر بەپەلە.
مُجَمَّر: مُحَمَّص/ برژاو.
جَمار: جماعة/ كۆمەڵ.
جِمارُ الحَجّ: الحَصى التي يرْمى بها الحُجّاج/ بەردی رەجم كردن.
جُمّار. شحم النَخْلَة/ كرۆك، ناوكرۆكی دارخورما.
جَميرة: ضفيرة/ پرچ.
إبْن جَمير: الليل المظلم/ شەوەزەنگ.
إبنا جمير: الليل و النهار/ شەوو رۆژ.
جمرك. دائرة المكوس/ گومرگ، رێژی.
رسوم جمركية/ باجی گومرگ، باجی رێژی.
جمس:
جاموس/ گامێش.
عِجل الـ — / پەڵغ، پالاخ، پەرخ.
جمش:
جَمَش الرأسَ: حَلَقَهُ. ازال شعره/ سەری تاشی، توكەكەی لێ كردەوە.
جَمَّش: دغدغ/ ختوكەی دا.
جميش: مُزيل الشعر. نورە/ دارو.
تجميش: دغدغة/ ختوكەدان.
جمع:
جَمَع: لَمَّ. ضَمَّ/ كۆی كردەوە.
— : حصد/ درویەوە، رنی، چنی.
— : وصل. وَحَّدَ/ گەیاندیە، خستیە پاڵ، بەستنی بەیەكەوە. یەكی خستن.
— : حَشَدَ/ كەڵەكەی كرد، خستیە سەریەك، كۆمەڵی كرد، گردی كردەوە.
— بينهم: وَحَّد/ كۆی كردنەوە، ئاشتی كردنەوە.

- الإسم: جَعله في صيغة الجمع/ كۆی كردەوە، كردی بەكۆ.
- الجمْعيَّة/ كۆی كردنەوە، بانگی كردن بۆ كۆبونەوە.
- الحروف في الطباعة/ ریزی كرد، ڕێكی خست.
- كتاباً: صَنَّفهُ/ ڕێكی خست، پێكی هێنا، دروستی كرد.
جامَعَهُ: إتفق معه/ لەگەڵی ڕێك كەوت، پێك هاتن.
جامَعَها: وطئها/ گای، لاقەی كرد، ڕای بوارد لەگەڵی، لێی پەڕی.
اجمع على الأمر: عزم/ بڕیاری كردنیدا، دەستی پێكرد.
- ماكان متفرقاً: جعله غير مُنتشر/ كۆی كردەوە.
- وا على: إتفقوا/ ڕێك كەوتن، یەك كەوتن، یەك بڕیاریان دا، پێك هاتن.
إجتمع. تَجمَّعَ: إنضم/ چوە پاڵ، كۆبوەوە.
- - : إحتشد/ كۆمەڵیان بەست، كۆبوەوە.
- به: قابله/ بینی، چاوی پێكەوت، لەگەڵی كۆبوەوە.
إستَجْمعَ القومُ: ذهبوا كلهم/ هەمویان ڕۆیشتن، بڵاوەیان لێكرد.
- له الأمرُ: تم حسْب مرامه وەك خۆی ویستی وابو.
/ كۆكردنەوە، خستنەپاڵ یەك.
- الارقام في الحساب/ كۆكردنەوە.
- المال/ پارەكۆكردنەوە، پارە هەڵ گرتن، پاشەكەوت كردن.
- الشمل/ یەك بون، یەكیەتی، یەكانگیربون.
- سالم/ كۆی (ساخ، دروست).
- تكسير/ كۆی (شكاو، نادروست).
- . جمعية: قوم مجتمعون/ كۆبونەوە.
- الكثرة/ زوربە.
صيغة الـ — في النحو/ كۆ.
الـ — الرأسي/ تان كۆ.
الـ — الافقي/ پۆكۆ.
حاصل الـ — / شیكار.

ناتج الـ — /ئەنجام كۆ.
يوم الـ — : يوم القيامة/ ڕۆژی قیامەت.
جَمْعيَّة. جَماعة: إتحاد/ كۆڕگە، كۆمەڵ، كۆمەڵە.
- خيرية/ كۆمەڵەی چاكەكاری.
- عمومية/ كۆمەڵەی گشتی.
- الهلال الأحمر/ كۆمەڵەی خاچی سور.
- الطيران/ كۆمەڵەی فڕۆكەوانی.
- مكافحة السلّ/ كۆمەڵەی نەهێشتنی دەردە باریكە.
جُمعة: اسبوع/ هەفتە.
- : يوم الجُمعة/ هەینی، ڕۆژی هەینی.
مُجامَعة: لمدة اسبوع/ هەفتانە، بۆ ماوەی هەفتەیەك.
جِماع: وطء/ گان، گان كرین، لاقەكردن، پەڕین، پەڕاندن.
جَماعَة: زُمْرَة/ دەستە، كۆمەڵ، كۆڕ، برادەران.
جماعي: مُشْتَرَك/ بەكۆمەڵی، پێكەوەیی، بەگشتی، بەهاوبەشی.
جميع. جميعاً: كل/ هەمو، گشت، سەراپا، سەرجەم، سەرپاك، دوایەك، تێكڕا.
- . اجمع: بأجْمَعه/ بەتەواوی، هەموان، سەراپا، سەرانسەر.
جميعاً: الكُلّ/ سەراپا، سەرجەم، سەراسەر، پەیاپەی، دوایەك، سەرانسەر، تێكڕا.
جامع: مَسْجِد/ مزگەوت.
- : الذي يجمع/ كۆكەرەوە، كۆگر.
- : حاشد/ كەڵەكەكەر.
- : شامل گشت گر، سەراپایی، تێكڕایی.
- الكتاب/ ڕێكخەر، پێك هێنەر، دروست كەر.
الكلام الـ — / كەم وتنی پڕ مانا، وتەی پڕوچڕ.
اليوم الـ — . يوم الجمعه/ ڕۆژی هەینی.
ابو — : مائدة الأكل/ خوان، سینی و خوان، سفرە.
جامعه: رابطة/ كۆمەڵە، پەیوەندگە.
- الامم: عُصبة الأمم/ كۆمەڵەی گەلان.
- : مدرسة عالية/ زانكۆ، زانستگا.
اجمع. جميع: كلّ/ هەمو، سەراپا، سەرجەم.
اجماع: اتفاق الآراء/ یەك دەنگ، یەك بون، یەك ڕایی.
بالـ — . إجماعي: باتحاد الآراء/ بەیەك دەنگ.
إجتماع: جمعية/ كۆبونەوە، كۆرگرتن، كۆنگرە.

رَتَج. رِتاج: باب عظيم/ دوده‌وری، ده‌رگای گه‌وره.

مرتاج: مايُغلَق به الباب/ كلۆم.

راتِنج: صمغ الصنوبر/ جیوه.

رتع:

رَتَعَ: عاش في خِصب/ ئاسوده ژیا، به‌خۆشیه‌و تێرو ته‌سه‌ل ژیا.

– ت الماشية: رَعَت/ له‌وه‌ڕا، چه‌را، چه‌رى.

مَرتَع: مَرعى خَصيب/ له‌وه‌ڕگا، له‌وه‌ڕ، پاوه‌ن.

– الرذيلة أو الشر. الخ/ كانگـاى خراپــه‌و داوێـن پيسى.

رتق:

رَتَقَ: ضد فَتَقَ/ دروى، چنيه‌وه.

– الفَتْقَ: اصلحَهُ/ پينه‌ى كرد، درويه‌وه، چنيه‌وه.

– فَتْقَهُم: اصلح ذات بينهم/ ئاشتى كردنـه‌وه، رێكـى خستنه‌وه، پێكى هێنان.

– الشيءَ: سَدَّهُ و أغلقه/ داى خست، سه‌رى نايه‌وه.

رَتْق: نقيض فَتْق/ درونه‌وه، چنينه‌وه، پينه‌كردن.

رتل:

رَتِلَ الشيءُ: تناسق و انتظم/ رێك بو، رێك و پێك بو.

رَتَّلَ الكلام: أحسن تأليفه/ باشى وت، به‌كوبو.

– القُرآن: تأنق في تلاوته/ باشى خوێند، قورئانه‌كـه‌ى باش خوێند.

ترتيل: ترنيم/ خوێندن، وتن، ئاوازى خۆش.

رَتَل: الحَسَن من الكلام/ قسه‌ى باش و به‌جێ، وتـه‌ى جوان.

رَتَل: صَفّ/ ريز، رێچكه، ژماره‌يه‌كى نۆد.

ارتَل: مَن في لسانه حُبسَة/ زمان ئه‌گرێ.

رُتيلاء: عنكبوت مؤذٍ/ جالجالۆكه‌ى به‌زيان.

رتم:

رَتَمَ بكلمة: فاهَ/ وشه‌يه‌كى (وت، به‌ده‌ما هات)، ده‌مى كرده‌وه.

ارتَمَ: شَدَّ الرَتَمَة على اصبُعِهِ/ پـه‌تى به‌سـت بـه په‌نجه‌يه‌وه.

رَتَمَة. رتيمَة: خيط يُشَدّ في الاصبع للتذكُّر به/ په‌تێك به په‌نجه‌وه ئه‌به‌سترێ بۆ بيركه‌وتنه‌وه.

رث:

رَثَّ. ارَثَّ الثوب: بَلي/ شربو، كۆن بو، رنى.

ارَثَّ الثوب: جعله رَثّاً/ شرى كرد، كۆنى كرد، رزانى.

رَثّ. رثيث: بالٍ/ شر، كۆنه، رزيو.

– . – الهيئة/ شڕۆڵ، په‌ڕپوت.

كلام – : سَخيف/ قسه‌ى قۆڕو بێ مانا، قسه‌ى هيچ و پوچ.

رَثاثَة/ په‌ڕپوتى، رزيوى.

رثا:

رَثا. رَثى الميِّتَ: بَكاه و عَدَّدَ محاسِنَه/ شيوه‌نى بۆ كرد، لاوانيه‌وه، به‌سه‌ريا گريا.

– . – – : نظم فيه شعراً/ هـۆنراوه‌ى به‌سـه‌را هه‌ڵ دا، هه‌ڵ به‌ستى له‌سه‌ر دانا.

رثى له: رَقّ له و رَحِمَهُ/ دڵى بۆ نه‌رم بو، دڵى پێ سوتا، به‌زه‌يى پيا هاته‌وه.

– له : حَزِنَ عليه/ بـۆى دڵگير بـو، جلى ره‌شـى بۆ له‌به‌ركرد.

يُرثى له/ شايانى به‌زه‌ييه، پياو به‌زه‌يى پيادێته‌وه.

رَثيَة: ضَعفٌ و فتور/ لاوازى و ساردى.

– : التهاب المفاصل/ جومگه ئێش.

– : حُمق/ كه‌رێتى، گێلى، كه‌وده‌نى.

رجل رَثو: في عقله ضعف/ گێل، كه‌وده‌ن، حه‌پۆله.

مَرثاة. مَرثية: مايُرثى به الميت من الشعر و غيره/ وتارو هۆنراوه بۆ مردو يا به‌سه‌ر مردوا وتن، شيوه‌ن.

رِثاء. رَثى نَدْب/ شيوه‌ن كردن، دڵگيربون.

رج:

رَجَّ: هَزَّ و خضخض/ شـڵه‌قانى، جـوڵانى، له‌رانيـه‌وه، راى‌وه‌شان.

رُجَّ. إرتَجَّ: إهتزَّ و تحرك/ شڵه‌قا، جولا، له‌ريه‌وه.

رَجَّة. إرتجاج: إهتزاز/ شڵه‌قان، جوڵان، له‌رينه‌وه.

رَجاج. مُترَجِّج/ له‌رزۆك، بزۆك.

مُرتج: مُهتَزّ/ له‌رزيو، شڵه‌قاو.

رَجرَجَ: اهتزّ و اضطرب/ له‌رزى شپرزه‌بو، شێوا.

– : حَرَّك/ جوڵانى، بزوانى.

تَرَجرَجَ: تَحَرَّك/ جولا، بزوا.

– : إضطرب/ شپرزه‌بو، شێوا.

رجا:

ارجا الأمرَ: اخَّرَهُ/ دواى خست، خستيه كاتێكى تر.

إرجاء: تأخير/ دواخستن، خستنه كاتى تر.

رجب:
رَجَبَ منه: إستحيا/ شەرمی کرد، شورەیی کرد.
– . ارجب. رَجَّبَ الرجلَ: هابَهُ/ لێی ترسا، شەرمی لێ کرد، سڵی لێ کردەوە.
تَرَجَّبَ: تَخَوَّفَ/ ترسا، سڵی کردەوە.
رَجَب: الشهر السابع الهجری/ مانگی رەجەبی کۆچی.
رجح:
رَجَحَ. تَرَجَّحَ الميزانُ: مال/ سەری کرد، لاسەنگ بو.
– . – الرأی: غلب علی غيره/ قسەکەی سەری گرت، پەسەند کرا.
– ت . – ت القوة: غلبت علی غيرها/ زاڵ بـو، سەرکەوت.
– الشيءُ بيده: وَزَنَهُ/ هەڵی سەنگان.
رَجَّحَ. ارجَحَ: جعله راجحاً/ لاسەنگی کرد.
– الرأی و الظَنَّ/ پەسەندی کرد.
– علی: فَضَّلَ/ بە باشتری دانا.
– . ارجح: هَزَّزَه و ذَبْذَبَهُ/ رای ژەن، رای وەشان.
تَرَجَّح. إرتجح. تارجح: إهْتَزَّ و تذبذب/ لەریەوە، هات و چۆی کرد.
رُجحان. لرجحية: ميلان/ لاسەنگی، لاری.
– . – : أفْضَلِيَّة/ پەسەندکردن.
ارجوحة. مَرجوحة. رُجّاحَة: مُطَوَّحَة/ جۆلانە، دیلانە.
راجِح: غالب/ لاسەنگ، قورستر.
– : محتمل/ شیاو، گونجاو، ڕێ تێچو.
– . ارجح: مُفضل/ پەسەند، باشتر، پەسەندتر.
رجز:
رُجْز: دَنَس/ پیسی، ناپوختی.
– : عَذاب/ سزا.
– : عِبادَة الأوثان/ بت پەرستن.
– . رجز: الإثم و الذنب/ گوناە و تاوان.
رِجازَة: مايعلق بإحدى جانبی الحمل ليُعَدلَهُ/ پارسەنگ.
رَجَز: بَحْرٌ من ابحر الشَعر/ یەکێکە لە کێشەکانی مۆنراوە.
– : داء يصيب الإبل/ دەردێکە توشی وشتر ئەبێ.
رجس:
رَجُسَ. رَجِسَ: عمل عملاً قبيحاً/ کردەوەیەکی ناشیرنی لێ وەشایەوە.
رَجِس: دَنِسَ/ پیس، چەپەڵ، گڵاو.
رِجْس: العمل القبيح/ کردەوەی ناشیرن، نەنگی.
– . رَجَس: قَذَر/ پیسی، ناپوختی، چەپەڵی.
مرجاس: مِسبار الأعماق/ قول پێو، قوڵایی پێو.
رجع:
رَجَعَ: عادَ/ گەڕایەوە، هاتەوە، ڕۆیشتەوە.
– الی الأمر: إستانف الأمر. بدا ثانية/ تێ هەڵ چووەوە، دەستی پێکردەوە.
– اليه فی الأمر: إستعان به. التجأ اليه/ پەنای بردە بەر، راوێژی پێ کرد.
– عن الأمر: كَفَّ/ وازی لێ هێنا، دەستی لێ هەڵگرت.
– فی کلامه: تراجَعَ/ پاش گەز بووەوە.
– عليه: طالَبَهُ/ داوای لێ کردەوە.
رَجَّعَ. ارْجَعَ: رَدَّ/ گەڕانیەوە، دایەوە.
راجَعَ: فَحَصَ/ پشکنی.
– الحسابات: تَحَقَّقَ صحتها/ پیاچووەوە، راستیەکەی دەرکەوت.
– ه فی الأمر: طلب رایه/ پرسی پێ کرد، راوێژی پێ کرد.
– الطبيبَ مثلاً/ چوە لای پزیشك.
– : كَرَّرَ/ پیاچووەوە، دوبارەی کردەوە.
تَراجَعَ: إرْتَدَّ/ پاش گەز بووەوە.
– : ضد تَقَدَّمَ/ کشایەوە، گەڕایەوە.
إسترجع: إسْتَرَدَّ/ دەستی کەوتەوە، سەندیەوە، وەری گرتەوە.
– : سحب/ کێشانەوە.
– الشيء: طلب رَدَّه/ گێڕایەوە، داوای کردەوە.
– الأمر: الغاه/ هەڵی وەشانەوە، بەتاڵی کردەوە.
– ماضاع: وَجَدَه/ دۆزیەوە.
– عافيته: شَفَی/ چاك بووەوە.
رَجْع. رجوع: عَوْد/ گەڕانەوە، هاتنەوە.
– الصَدَی: رَدّ الصوت/ دەنگ دانەوە.
– : المطر بعد المطر/ باران بەدوای باراندا، بارانی پاش باران.

ر

كرجع البصر: كإرتداد الطرف/ وهك تروكەی چاو، لە چاوتروكانێكدا.
رَجْعَة: عَوْدَة/ گەڕانەوە، هاتنەوە.
استرجاع: سَحْب/ كێشانەوە، گێڕانەوە.
– : استعادة/ سەندنەوە، ساندنەوە، وەرگرتنەوە، دەست كەوتنەوە، چاك بونەوە.
تَراجُع: إرتداد/ كشانە دواوە، گەڕانەوە، پاشگەز بونەوە، پێچ دانەوە.
مُتراجع: متقهقر/ كشاوە، گەڕاوە، شكاو، پاشگەز.
مَرجع: مكان الرجوع/ سەرشار، شوێن گەڕانەوە.
– : كتاب يُرجع اليه/ سەرچاوە، چاووگ.
– : ملجا/ پەنا، پەناگە، پاڵ پشت.
الـ – الأخير/ دوامین سەرچاوەو پەنا.
مُراجع: فاحص/ پشكنەر.
– الحسابات/ پشكنیار، وردكار.
– : من له أعمال يراجعها/ خاوەن كار.
مُراجَعة: إعادة. تكرار/ دوبارەكردنەوە.
– : إعادَة النظر/ پیاچونەوە، چاوپیاخشانەوە.
رَجعي: متمسك بالقديم/ كۆنەپەرست.
– : للوراء/ بەرەو دوا.
راجع: مُراجع: المراة يموت زوجها و ترجع الى اهلها/ باوەخۆن.
رجيع: روث/ تەرس، تەرسەقول.
رُجعه: وصل. مستند/ وەرگرتن نامە، بەڵگەنامە.
رجف:
رَجَفَ: هَزَّ. حَرَّك شديداً/ لەرزانی، لەرانیەوە، شڵەقانی.
– . إرتجف: إرْتَعَدَ/ لەرزی، لەریەوە.
ارجف: نَشَرَ اخباراً مُرْعِجة/ هەواڵی ناخۆشی بلاوكردەوە، ئاژاوەی نایەوە.
رَجْفَة: رَعْدَة. هَزَّة/ لەرزە، لەرزین، لەرینەوە، موچرك.
اراجيف: اخبار مُهيِّجَة/ هەواڵی (ناخۆش، خراپ، درۆ).
رجل:
رَجِلَ: سار على رجلَيه/ بەپێ ڕۆیی، بەپیادەیی ڕۆی.
تَرَجَّلَ: نزل عن رُكوبَتِهِ فَمَشى/ دابەزی و بەپێ ڕۆیی.
– ت المراة: صارت كالرجل/ لاسایی پیاوی كردەوە، ڕەفتاری پیاوانەی كرد، وەك پیاوی لێ هات.
ارتجل الكلامَ: تكلم من غير ان يهيئه/ سەرپێی (دوا وتاری دا، قسەی كرد).
– العمل/ بێ لێك دانەوە كرداری كرد.
– برايه : إنفرد/ هەر بە قسەی خۆی كرد، بە قسەی كەسی نەكرد.
– : طبخ في المرجل/ لەمەنجەلا كوڵانی.
رِجل: قَدَم/ پێ.
– : ساق/ لاق.
– : طائفة. قطعه/ كۆمەڵ، پەڵە.
– من الجراد/ قطعة عظيمة/ پەڵەیەك كوللە.
– الحمام: نبات/ گۆزروان، مژمژۆك.
– الغراب: نبات/ گوڵە بەهارە.
يُقَدِمُ رجلاً و يؤخر اخرى: يَتَرَدَّد/ دودڵە، ڕارایە.
رَجِل. راجِل: من يمشى على رجليه/ پیادە.
رَجْلَ. رَجَل. رَجِل: الشعر بين الجعودة و الاسترسال/ قژ نە خاو بێ نەلول.
مِرجَل: مشط/ شانە، شە.
– : قدر/ مەنجەڵ، قازان.
– : آلة بُخاريَّة/ بۆیلەر، كوڵ هێن، كوڵێنەر.
رَجلُ: إنسان/ مرۆڤ، مرۆ، مەردم.
– : خلاف المراة/ پیاو.
– الرجال: كامل الرجولة/ كەڵەپیاو.
رُجولة. رجوليَّة. كمال الرَجُل/ نێرێتی، پیاوێتی.
– – : شَجاعَة. صفة الرجل الكامل/ پیاوەتی.
إرتجال/ خۆوت، خۆوتن، قسەكردن یا ئیش كردن بەبێ خۆ ئامادەكردن، یەكسەر، سەرپێی.
إرتجالى. مُرْتَجِل/ خۆوت، یەكسەری، بەبێ ئامادەكردن، دەمەكی، لەبەر وتن.
مُسترجلة: وَرِشَة/ نێرەكوڕكە، كوڕانی.
رجم:
رَجَمَ: رَمَى بالحجارة/ بەردی هاویشت، بەردی هەڵ دا، بەردبارانی كرد، بەردی تێ‌گرت.
– : شَتَمَ/ جنێوی دا.
– : لَعَنَ/ لەعنەتی كرد، نەفرەتی كرد، نەفرینی كرد، ئەفەرۆزی كرد.

— . رَجَّمَ: تكلم بالظَنّ/ لەخۆیەوە وتی، نوقلانەی لێ دا.
— . — القَبْرَ: وضع علیه الرُجمَة/ کێلی بۆ دانا.
تَرجَمَ: فَسَّرَ بلسان آخر/ گۆڕی، وەری گێڕا لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی تر.
— : فَسَّر. شَرَحَ/ لێکی دایەوە.
رَجم: رَمْی بالحجارة/ بەرد (هاویشتن، هەڵ دان، تێ گرتن، باران کردن).
— بالغیب: تَكَلُّم بالظَنّ/ نوقلانە، لەبەریورە وتن.
— . مایُرجم به: قذیفَة/ گوللە تۆپ، موشەك.
رجیم. مرجوم/ بەرد تێگیراو، بەردباران کراو.
— : لعین/ مەلعون، نەفرەت کراو، نەفرین کراو، ئەفەرۆز کراو.
رُجمَة. رُجْم: حِجارَة تنصب علی القبر/ کێل.
— . رِجام: مرجاس. حجر یربط به خیط یُلقی فی الماء لمعرفة عُمقه/ قوڵ پێو.
ترجمة: نقل من لغة الی اخری/ گۆڕین، وەرگێڕان.
— : تفسیر/ لێك دانەوە.
— إنسان: تاریخ حیاته/ مێژوی ژیان، ژیان نامە، ژین نامە.
— حرفیَّة/ وشەگۆڕین، گۆڕینەوەی وشە، دەق گۆڕین.
— تفسیریَة/ گۆڕین بە لێك دانەوەوە.
تَرجُمان. مترجم/ وەرگێڕ.
رجا:
رَجَا: ضد یَئس/ کۆڵی نەدا، هیوای نەبڕی.
— . تَرَجَّی. إرتجی الشیء: أمَّلَ فیه/ بەهیوای بو، چاوەڕوانی بو.
— . — : تَوَسَّلَ/ پاڕایەوە، لالایەوە، تکای کرد، نزای کرد.
ارجی. ارجَأَ: اخَّرَ/ دوای خست.
رَجاء. رَجا (جمع ارجاء): ناحیَة/ لا، ناوچە.
— . رَجاة. مَرجاة: امل/ هیوا، ئاوات، هومێد، ئومێد، داخوازی، خواست.
— . تَرَجٍّ: تَوَسُّل/ تکا، پاڕانەوە، لالانەوە.
قطع الـ — : یأس/ هیوابڕین، نائومێدی، پرزەبڕین.
راجٍ: آمِل/ ئاواتەخواز، بەهیوا، هومێدەوار، ئومێدەوار.
مَرجو. یُرجی منه/ لێی ئەوەشێتەوە، لەوانەیە، جێی هیوایە.
تَرَجِّی. إرتقاب شیء لا وثوق فی حصوله/ هیواداری، هومێدەواری.
رح:
رَحَّة: الحَیَّة إذا انطوت/ ماری (پەپکە بەستو، لول).
ارَح. رُحّ: مَن لا اخمص لقدمه/ بن پێ تەخت، پێ تەخت، ئەوەی بنی پێی قوڵ نەبێ.
رحب:
رَحُبَ. رَحِبَ. ارحَبَ المکانُ: إتَّسَعَ/ فراوان بو.
رَحَّبَ. ارحب المکانَ: وَسَّعَهُ/ فراوانی کرد.
— . تَرَحَّبَ به: احسن وَفْدَه/ پێشوازی کرد، خۆش هاتنی کرد.
رَحْب. رَحیب: واسع/ فراوان، پان، بەرین، وەڕاق.
— . — الباع: سَخِّی/ دەست بلاو، بەخشندە.
— . — الصدر: کریم/ میهرەبان، پیاوچاك.
— . — الفهم: متسع العقل/ تێگەیشتو، زرنگ.
رحَبَه: الارض الواسِعَة/ زەوی پان و بەرین.
— : فجوة بین البیوت/ کولان، کەلەبەر.
— الدار: ساحتها/ حەوشە.
— السیارات: موقف السیارات/ وێستگەی ئوتومبیل.
تَرحاب: حُسْن الملاقاة/ پێشوازی، چاك و چۆنی گەرم.
بِتَرحاب/ چاك و چۆنی بە گەرمیەوە.
مَرحَباً بك/ خۆش هاتی، ڕۆژباش.
رحض:
رَحَضَ: غَسَلَ. شَطَفَ/ شتی لە ئاوی هەڵ کێشا، تێی وەردا.
رَحیض: مغسول/ شۆرراو، لە ئاو هەڵ کێشراو.
مِرحاض: خَشَبَة یُضرَب بها الثوب عند غسله/ گەلا کوتك، تێلا کوتك.
— : بیت الأدب/ ئاودەستخانە، پێشاو.
رحق:
رُحاق: خَمر/ شەراب، مەی، بادە.
— : رحیق: ضربٌ من الطیب/ بۆنی خۆش، جۆرە بۆنێکی خۆشە.
رَحیق/ شیلە، رینگاو.
رحل:

رَحَلَ. إرْتَحَلَ عن المكان: تركه/ بەجێی هێشت، کۆچی کرد.
– . – الى المكان: إنتقل/ گواستیەوە..
– . – على الدابَّة: ركبه/ سواری بو.
– . – البلادَ: طافها/ پیاگەڕا، گەشتی کرد.
تَرَحَّل: تَنَقَّلَ/ گەڕا، گەشتی کرد، ئەم شوێنەو شوێنی کرد.
رَحَّلَ: صَيَّرَهُ يَرْحَل/ گوێزایەوە، دوری خستەوە، ناردی.
رَحْل: سَرج البعير/ کۆپانی وشتر.
– : أمتعة المسافر/ کەلوپەل، تفاق، شت و مەك.
– : المنزل و المأوى/ ماڵ، جێو ڕێ، ڕێو شوێن.
عاد المسافر الى – ـه: أي الى منزلـه/ هاتـەوە شوێنی خۆی، گەڕایەوە.
رِحْلَة. رُحْلَة: سَفْرَة/ گەشت.
– قصيرة للنزهَة/ سەیران.
رَحّال. رَحّالَة: كثير التنقل/ کۆچەر، رەوەند.
– . – : سـائح/ گەشـتیار، گـەڕۆك، گـەڕاڵ، گەڕیدە.
راحِل: ذاهِب/ کۆچ کردو، ڕۆییو، ڕۆیشتو.
– : نازح. مُهاجر/ کۆچ کردو.
رَحيل. إرْتِحال: ذهاب/ ڕۆیین، ڕۆیشتن.
– . – : مُهاجَرَة/ کۆچ کردن، رەو، رەوکردن.
تَرْحيل: نَقْل/ گواستنەوە، گوێزانەوە، دورخستنەوە.
– : تسفير/ خستنەڕێ، بەڕێ کردن.
مَرْحَلَة: مايقطعه المسافر في يومه/ قۆناغ.
– : مَسافَة/ ماوە، ماوەی دو شوێن.
رَحول: كثير الترحال/ گەڕۆك، گەشتەوان.

رحم:
رَحِمَ: رَقَّ له و شفق عليه و عطف و غفر له/ دڵی نەرم بو، بەزەیی پیا هاتەوە، لێی بورد، رەحمی پێ کرد.
رَحَّمَ و تَـرَحَّمَ علـى: قـال رَحِمَـهُ الله/ بـۆی پاڕایـەوە، داوایی بەخشینی لەخوا بۆ کرد.
استرحم: استعطف/ پاڕایەوە، داوای لێ بوردنی کرد.
رَحْمَـة. مَرحَمَـة: رِقَّـة القلـب/ دڵ نـەرمی، بـەزەیی، لێ بوردن.
– . – الله/ بەزەییو میهرەبانی خوا.
بِساط الـ – : يُبسَط على النَعْش/ سـەرتەرم، پۆشـاکی تەرم.
عَدَم – : قَساوَة/ دڵ رەقی، بێ بەزەیتی، زۆرداری.
عـديم الـ – : لايـرحم: لا يَـرأَف/ دڵ رەق، زۆردار، بـێ بەزەیی.
رحـوم. رحـيم: رؤوف. حنـان/ بـە بـەزەیی، دڵ نـەرم، بەرەحم، میهرەبان.
الرَحْمن. او الرحمن الرحيم: من الاسماء الحسنى/ ناوی خوای بەخشندە، میهرەبانی خوای گەورە.
مرحوم: مُتَوَفى/ مردو، خوالێخۆش بو.
رَحِم. رَحْـم: بيـت الولـد/ منداڵـدان، منداڵـدان، زارۆك، پزدان.
– : قَرابـة. قرابـة رَحْـم/ خزمایـەتی، خزمایـەتی لـە دایکەوە.
إختناق الـ –/ پڕکام.
مسلك الـ – : مَهْبَل/ گولنك.

رحا:
رحا. رَحَى: ترحَّت الحَيَّة: إستدارت/ لول بو، پەپکەی بەست، گرمۆڵە بو.
– الرَحى: أدارها. ادار الرحَى/ دەستاڕی کرد.
رَحى. رَحايَة: جاروشَة/ دەستاڕ.
– . ضِرس/ خرێ.

رخ:
رَخَّ. رَخّاهُ: حَلَّ/ خاوی کردەوە، شلی کردەوە.
– الشرابَ: مَزَجَه بالماء/ ئاوی تێ کرد، رونی کردەوە، خاوی کردەوە.
– العجينُ: كثر ماءُهُ/ شل بو، ئاوی زۆر بو.
– السماءُ: رَشَّت/ رشێنەی کرد، نمەیەك باری.
أرَخَّ العجينَ: كَثَّرَ ماءُهُ/ شلی کردەوە.
إرتَخَّ الرجُلُ: إسترخى/ لەشـی خـاوبوەوە، نـەرم بـو، دامێزرا.
– . إسـترخى: اضـطرب/ شـپرزە بـو، شـێوا، خاوبوەوە.
رَخّ. رَخَّة مَطَر: نَخَّة/ نمەباران، رشێنە.
رَخاخ: هنيء/ ئاسودە.
رُخّ: طائر خرافي/ سیمرخ.
– في الشطرنج/ قەڵا، داشی شەترەنج.

رخص:
رَخُصَ: ضد غَلا/ هەرزان بو.
– : لان و طرى/ نەرم بو.
رَخَّصَ. أرْخَص: جعله رخيصاً/ هەرزانى كرد.
– له بكذا: اجاز/ رێی دا، دەسەلآتی دايە.
– له: أعطاء رُخْصَةً/ رێدان نامەی دايە.
إسْتَرْخَصَ. ارْخَصَ. إرْتَخَصَ: عَدَّه رخيصاً/ بە هەرزانى زانى.
– : طلب الرُخْصَةَ/ داوای رێ دانی کرد.
رَخيص: ضد غالى/ هەرزان.
رُخْصَة: إذن/ رێ دان.
رَخْص. رَخيص: لَيِّن/ نەرم، شل، نیان.
رخم:
رَخَمَ. رَخُمَ الصوتُ: رَقَّ ولان/ دەنگى نەرم بو، باريكى کردەوە.
– ت. لرخمت الدجاجة على البيض: حَضَنَتْهُ/ لەسەرى (هەلّ نيشت، كركەوت).
رَخَّمَ الصوتَ: صَيَّرَهُ رَخيماً/ دەنگەكەی خۆش کرد.
– الارض: فرشها بالرُخام/ مەرمەڕ ڕێژی کرد.
رَخيم. رَخِم: عَذْب/ بەسۆز، خۆش ئاواز، ئاوازی خۆش.
راخِم. ورَخِم. ورَخِمَة: حاضِنَة/ مريشكى كر كەوتو.
رَخْم. إرخام البيض: حَضن و فَقْس البيض/ لە سەرمێلکە هەلّ نيشتن، كركەوتن.
رُخام: حجر معروف/ مەرمەڕ.
لرخم من الخيل: ماكان راسه ابيض و جسمه اسود/ سەری سپی و لەشی رەش.
رخو:
رَخُوَ. رَخِيَ. تَرَخْرَخَ: لان و سهل/ خاوبوەوە، شل بوەوە، لەق بو.
– . رَخا العَيْشُ: إتَّسَعَ/ گوزەران خۆش بو، خۆش گوزەران بو.
رَخى. لرخى: حَلَّ/ شلى كردەوە، خاوى كردەوە، رەوانيەوە، لەقى كرد.
– . – الزمام: خلاف جذبه/ جڵەوی شل کرد.
– . – للحصان: اطلق العنان/ جڵەوی بەردا.
– . – اطلَقَ/ بەری دا، بەرەلآی کرد.
تَراخى: تَوانى/ كەمتەرخەمى كرد.
إرْتَخى. إسْتَرخى: صار رَخواً/ نەرم بو، شل بو، خاوبو، رەويەوە.
– . – : كَلَّ/ كۆڵى دا، ساردبوەوە، داهێزرا.
رَخو: لَيِّن/ مڵ، نەرم، شل، لەق، خاو، شل و شێواو، سستەك.
رَخاء: يُسر/ نەوا، خۆش گوزەرانى، هەرزانى، شت زۆرى.
ارتخاء: إسترخاء: إنحلال/ خاوبونەوە، ساردبونەوە، داهێزران.
– العظام: مرض الكساح/ ئێسكە نەرمە.
مُتَراخٍ. مُتَوانٍ/ كەمتەرخەم.
رد:
رَدَّ: ارجع. أعادَ/ گەڕانيەوە، هێنايەوە، برديەوە.
– : دَفَعَ/ دەستى پێوەنا، پاڵى پێوەنا، گەڕانيەوە.
– على: اجاب/ وەڵامى دايەوە، پاسوخى دايەوە.
– الدينَ: سَدَّدَ/ دايەوە، قەرزەكەى دايەوە.
– الشيءَ الى مكانه/ گەڕانيەوە جێی خۆی، خستيەوە شوێنی خۆی.
– الشيء الى صاحبه/ دايەوە بە خاوەنەكەی.
– الزيارة: أعادها/ چوەوە بۆ لای.
– النور او الحرارة: عكس/ دايەوە، روناكى يا گەرمى دايەوە.
– على القول: فَنَّدَ. نَقَضَ/ بەدرۆی خستەوە، بەرپەرچی دايەوە.
– : قاوم. صَدَّ/ بەرگرى كرد، بەرهەڵستى كرد.
– الباب: اطبقَهُ/ جوتی کرد، پێوەی دا.
– الإعتبار: أعاد حُقوقَه/ مافى دايەوە.
– اليه حياته: افاق/ هۆشى پياهاتەوە، ژيايەوە، بوژايەوە، ئافى تێ گەڕا.
مايَرُدَّ هذا عليك شيئاً: لاينفعك/ كەڵكت ناگرێ، سودى نيە بۆت.
رَدَّدَ: كَرَّرَ/ دوبارەی کردەوە، وتيەوە.
تَرَدَّدَ في الجواب: تَوَقَّفَ قليلاً/ لە وەڵام دو دڵ بو، بۆی وەستا.
– في الأمر: إرتاب فيه/ شڵەژا، شپرزەبو، رارابو.
– في الكلام: تلجلج/ زمانى (تێكەڵ و پێكەڵ بو، پێكامات).

– الی المکان: کَرَّرَ الزِیارة/ زۆر بۆی چو، ئامشوی زۆری کرد، سەری تێ کرد.
إرْتَدَّ: رَجَعَ. تَقَهْقَرَ/ شکا، کشایەوە، هاتەدواوە، گەڕایەوە.
– عن: تَرَكَ/ وازی هێنا.
إستَرَدَّ: إسترجَعَ/ گەڕانیەوە، دەستی کەوتەوە.
– الخسارة: استعاضها/ هێنایەوە.
– هُ الشيءَ: ساله أن يَرُدَّهُ/ داوای لێ کردەوە.
رَدّ: إرجاع/ گێڕانەوە، هێنانەوە.
– : إجابَة. جواب/ وەڵام، وەڵام دانەوە، پاسوخ، پاسوخ دانەوە.
– : إنعكاس/ دانەوە، روناکی دانەوە.
– : دَفع. صَدّ/ بەرهەڵست کردن، بەرگری.
– الاعتبار أو الشرف/ ماف و ئابڕو وەرگرتنەوە.
– الفعل أو تأثيره/ کاردانەوە.
– أ علی/ لە وەڵامی.
رِدَّة: صَدَی الصوت/ زایەڵە، دەنگ دانەوە.
– : الإرتداد الی الاصل/ گەڕانەوە بۆ سەرچاوەو بنەڕەت.
– : رَبْع/ دەستکەوت، قازانج، سود، کەڵك.
إرتداد: تراجع/ کشانەوە، هاتنەدواوە، بەزین.
– : رجوع/ گەڕانەوە، پاش گەزبونەوە.
– عن العقيدة أو الدين: خروج/ وازهێنان، لە ئاین لادان.
إسترداد: إسترجاع/ گێڕانەوە، وەرگرتنەوە، هێنانەوە.
– : سَحب/ کێشانەوە.
– : طلب الرَدّ/ داواکردنەوە.
تَرَدُّد: توقف لِرِيبَة/ دودڵی، گیرخواردن، بەگیروەستان.
– : إهتزاز/ لەرە، لەرەلەر، لەرینەوە.
تَرْداد: تِكرار/ دوبارەکردنەوە، وتنەوە.
– : تِكرار الزيارة/ زۆر چون، سەرتێکردن، سەردان.
مُرَدِّد: مُكرِّر/ دوبارەکار.
مُـرَدِّدون: مُـساعِدو المغنـي/ ئەوانـەی گـۆرانی ئەسەننەوە.
مَردود: رَبع/ دەسکەت، قازانج.
– : منقوض. مرفوض/ نەویستراو.
مُرْتَدّ: متقهقر/ شکاو، کشاوە.
– عن الدين: خارج/ لاداو، لە ئاین (لاداو، بەدەر).
مُتَرَدِّد: مُرَدِّد: حائر/ دودڵ، ڕارا.
رادّة. مَرَدّة: فائدة/ سود، کەڵك.

ردأ:
رَدأ: دَعَمَ/ پشتگیری کرد، پاڵ پشتی گرت.
– الرُجلَ: اعانه/ یارمەتی دا.
رَدُوَ: فَسُدَ/ خراپ بو.
لَرْدَأ: فعل فِعلاً رديئاً/ خراپەی کرد.
رَدِيء: ضد جَيِّد/ خراپ.
– : شِرِّير/ نەگریس، بەد، شەڕانی، چەپخون.
– : خبيث/ پیس.
– التربية/ خراپ پەروەردەکراو، بەدخو، بەدڕەوشت.
– الطبع/ بەدسروشت.
أردأ/ خراپ تر.
رَداءَة: ضد جَودَة/ خراپی.
– : شَرّ/ نەگریشی، بەدی، شەڕانێتی.

ردب:
ردْب: طريق رِدْب: لايَنفُذ/ ڕێگە یا کوڵانێ کە دەرناچێ.

ردح:
رَدَحَ: تَمَكَّنَ و ثَبتَ/ توانی و جێ گیر بو.
– . رَدَّحَ: بَسَطَهُ بالارض/ پانی کردەوە، پلیشانیەوە.
– له: وَبَّخَهُ/ سەرزەنشتی کرد.
رَدَح: مُدّة طويلة/ ماوەیەکی درێژ.
رَدْح: وَجَع خفيف/ ئیش و ئازارێکی کەم.
– : تعنيف/ سەرزەنشت، سەرزەنشت کردن.

ردس:
رَدَسَ الارض: دَكَّها/ کوتایەوە، زەویەکەی کوتایەوە.
مِردَس: مندالة/ زەوی کوت.
مِرداس: آلة الرَدْس/ مەکینەی زەوی کوت.

ردع:
رَدَعَ: كَبَحَ/ دای مرکانەوە، دابینی کرد.
– . إرتدع: كَفَّ و إرْتَدَّ/ هەڵ سڵەمیەوە، وازی هێنا.
رادِع: ضابط. مانع/ دامرکێن، دابین کەر.

ردغ:
رَدْغَة. رِداغ: وَحَل شديد اللزوجَة/ قوڕاو، لیتە.

ردف:

رَدَفَ. رَدِفَ: تَتَبَّعَ/ دواكەوت، شوێنی كەوت، بەدوایا هات.

— — . تَرَدَّفَ: رَكِب وراءَهُ/ لە پشتیەوە، لە دوایەوە سورا بو.

اردفَ: توالی/ بەدوایا هات.

ترادَفَ: ركب الواحد خلف الآخر/ یەك لە دوای یەك سوار بون.

— ت الكلمات: تَشابَهت فی المعنی/ هاو واتا بون.

ترادفوا: تتابعوا/ بەدوای یەكەوە بون، یەك لە دوای یەك بون.

رِدف: تابِع/ هاوەڵ، پیاو، لەدوایەوە، لەگەڵ، لە شوێن.

— . رَدیف: الراكب خلف الراكب/ ئەوەی لە پشت سوارەوە سوار ئەبێ.

— : خَلف. وراء/ دوا، دواوە.

— . رِداف الدابَّة: كَفَل/ سمت و كەفەڵ، تەپڕیزە.

رِدفان: اللیل و النهار/ شەوو رۆژ.

رَدیف فی الجیش: إحتیاطی/ یەدەگ.

ترادُف الكلام: تشابه المعنی/ هاو واتایی.

— : تَتابُع/ یەك لە دوای یەك، بەدوای یەكدا هاتن.

مُترادِف: متشابه المعنی/ هاو واتا.

ردم:

رَدَمَ الحُفْرَةَ: ملأها/ پڕی كردەوە.

— البابَ: سَدَّه/ پێوەی دا، جوتی كرد.

— ت. لرْدَمَتَ الحُمَّی: دامَت و لم تفارقه/ تاكەی لە كۆڵ نەبوەوە، درێژەی كێشا.

رَدَّم الثوبَ: رَقَّعَهُ/ پینەی كرد.

رَدْم: ضد حفر/ پڕكردنەوە.

— : أنقاض الهدم/ چڵ و پێو، داروپەردو.

مُتَرَدَّم: الموضع الذی یُرَقَّع/ ئەو شوێنەی پینە ئەكرێ، پینەكراو.

ردن:

رَدَنَ: غَزَّلَ علی المِرْدَن/ تەشی رست، بە تەشی رستی.

رَدَّن. لرْدَن القمیصَ جعل له رُدناً/ قۆڵی بۆ كرد.

رَدْن: غَزْل/ رستن.

مِرْدَن: مِغزَل/ تەشی.

رُدْن: كُمّ/ قۆڵ.

رده:

رَدْهَة الدار: أوْسَع محل فیها/ هۆڵ.

ردی:

رَدَی. رَدِیَ: سقط أو هلك/ كەوت، لەناوچو.

رَدَّی. أردی: صَرَعَ/ خستی، كوتای بەزەویدا.

— . — : قَتَلَ/ كوشتی.

— . — الخمسین: زاد. تجاوز/ لە پەنجا تێپەڕی.

رَدی. مَوت. مَنیَّة/ مەرگ، مردن، نەمان، گیان دەرچون.

تَرَدَّی. إرتدی: لَبَسَ/ لەبەری كرد، كردیەبەری.

— فی كذا: سَقَطَ/ كەوتە ناوی.

رِداء: عَباءَة/ بالاپۆش، عەبا.

— : ثَوْب/ كراس.

— الشمس: نورها/ تیشك و روناكی رۆژ.

— الشاب: حُسنَهُ و غَضارَته/ هەرەتی لاوی و هەرزەكاری، سێرەی گەنجی.

غَمْر الـ —: كثیر المعروف/ بەخشندە، خێرەومەند، دەست بڵاو.

خفیف الـ — : قلیل الدَیْن و العیال/ كەم قەرزار، كەم خێزان.

رذ:

رَذَّت. لرْذت السماءُ: إمطرت الرذاذ/ نمەیەك باری، رشێنەی كرد.

— القِربَة: سال منها/ لێی چو، دەلانی، لێی تكا (مەشكە).

رذاذ: مطر خفیف/ نمەباران، رشێنە، پریشك، گوڵ نم، پرژێن، پرژێتە.

رذل:

رَذُلَ. رَذِلَ: كان رذیلا/ رسوابو، سوك بو.

لرْذَلَ: فَعَلَ فعلاً قبیحاً/ كارێكی ناپەسەندی كرد.

— ـه: جعله رذیلاً/ رسوای كرد، سوكی كرد.

— . رَذَل: رَفَضَ/ نەی ویست.

رَذَلَ. إسترذل: إحتقر/ بێزی لێ كردەوە، بەسوك تەماشای كرد.

— . — . رَذَّل: اهان/ شكانی، ئابڕوی برد، قسەی ناشیرینی پێ وت، سەرزەنشتی كرد.

رَذْل. رَذیل: سافِل/ رسوا، سوك، پێ ئابڕو.

— : رَفْض/ نەویستن.

ر

رَذالَة: سَفالة/ رسوایی، سوکی، بێ ئابڕوویی.

رذيلة: عكس فضيلة/ خراپە، کرداری ناشیرن و بێ جێ.

رُذال: ما أُنتقِيَ جيده و بَقِي رَديئه/ گەنگە، خراپەکەی دوای هەڵ بژاردن.

رز:

رَزَّت. لرزّت الجرادة: غرزت ذنبها في الارض لتبيض/ گەرای نا (کولله).

رَزَّ: صَقَل/ سافی کرد، لوسی کرد.

رَزّة: حديدة يدخل فيها القفل/ ئەڵقەرێز.

– : مسمار بحلقة/ سنگ یا بزماری ئەڵقەبەسەر.

رُزّ . أرُزّ/ چەڵتوك، برنج.

– بِلَبَن/ دۆکوڵیو.

– دَفين/ پڵاو، چێشتی برنج.

– مطبوخ/ قوبوڵی، چێشتی برنج.

مَرَزَّة: مَنْبَت الرُزّ/ مەرەزە.

رزأ:

رُزءٌ. رزيئة. رزِيَّة: مُصيبة/ بەڵا، کارەسات، چورتم.

رزح:

رَزَحَ الحيوانُ: سقط و لم يستطع النهوض هزالاً و تعباً/ کەوت لەبەر لاوازیو کفتی.

– الرجل: ضعف. ذهب ما بيده/ پەکی کەوت، هیچی نەما.

رُزَّح. رُزحى. رزاحى. روازح: الهزيل الضعيف/ لەڕولاواز، پەك کەوتو.

مرزاح، مِرزَحَة: العود المستعمل لرفع الكرم عن الارض/ دەستەك، کوڵەکە، ئەو دارەی ئەدرێتە بەر مێو بۆ وەستانی.

رزق:

رَزَقَ: أوصَل الرزق الى/ رزقی دا، رزقی بۆ نارد، دایە.

– ـه الله/ خوا رزقی دا، خوا (گوزەرانی باش کرد، دەرامەتی دا).

رُزِقَ: نال الرزق/ رزقی بۆهات، پێی گەیشت.

إرتَزَقَ. إسترزق: طلب الرزق منه/ داوای رزقی لێ کرد.

رزق: كل ما تنتفع به/ رزق، گوزەران، تفاقی ژیان، رۆزی.

– : حَظّ أو خَيْر/ بەخت، شانس، پیت، سامان، بوم.

– : ماهِيَّة/ موچە، هۆی ژیان، دەرامەت.

– موروث: إرث/ میراتی.

رَزّاق: الله/ خوای بەخشندە.

مَرزوق: حَسَن الحَظّ/ بەختیار، بەختەوەر، شانسیار، کامەران.

مُرتَزِقة: مُنتَفِعون/ چڵکاوخۆر، کاسەلێس.

مُسترزِقة. جنود مأجورون/ بەکرێ گیراو.

رزم:

رَزَم: حَزَمَ/ پێچایەوە، بەستی، گورزەی کرد.

رِزمَة: حُزمَة/ پێچراو، بەستراو، گورزە.

– كبيرة: بالة/ فەردە، بالە.

– ورق/ بەستە کاغەز، بەند.

رزن:

رَزُن. ترزَّنَ: وَقُرَ/ ئاغر بوەوە، هێمن بوەوە، لەسەرخۆبوەوە.

رَزَنَ الشيءَ: قَدَّر و زنه/ هەڵی سەنگان.

– بالمكان: اقام/ جێگیر بو، نیشتەجێ بو.

رَزين: وَقور/ ئاغر، هێمن، لەسەرخۆ، سەنگین، مەند، مەنگ.

– . رزين الرای: ثقيل/ بیرکار.

رَزان: إمرأة رزينة/ ئاغر، هێمن، لەسەرخۆ/ بۆ ئافرەت.

أرزَن: شجر صلب العود. خشب صلب/ داری سەخت، دار سەخت، کەووت.

رسب:

رَسَبَ. ترَسَّبَ: سقط الى الأسفل/ نیشت، کەوتە بنی.

– في الإمتحان: لم يَنْجَح. خَفَقَ/ دەرنەچو، کەوت.

رَسَّبَ/ نوقمی کرد، خستیە بنی، دەری نەچوان.

راسِب. رُسوب: ثُفل/ خڵتە، ملتە، نیشتو، پەگر.

– : خافِق/ دەرنەچو، کەوتو.

ترسيب/ نیشتاندن، نیشتواندن.

رواسِب. رسوبيات. المواد الرسوبية/ نیشتوەکان.

رسخ:

رَسَخَ. تَرَسَّخَ: ثَبَتَ/ جێگیربو، چەسپی.

– : تَأصَّلَ/ بنی داکوتا.

لرَسَّخَ. رَسَّخَ: اثبَتَ/ جێگیری کرد، چەسپانی، راگیری کرد.

– في الذهن/ خستیە مێشکیەوە.

رُسوخ: ثبات/ جێگیر بون، چەسپان، بن داکوتان.

راسِخ: ثابت/ جێگیر، چەسپیو، قایم، دامەزراو.

– : مُتاصِّل/ بن داکوتاو.

– فی کذا/ بەتوانا، دانا.

– فی العلم/ زانیار، تێگەیشتو، دانا.

رسغ:

رَسغ. رَسَّغَ الصَبیَّ: شَدَّ فی یده او رجله خرزاً لدفع العین/ پەت و موروری چاوەزاری کردە دەست و پێ.

رِساغَة: عَذبَة/ گولنگە، پلپلە، گێزو گولنك، مەنگولە.

رسغ:

رُسْغ: مابین الساعد و الکف أو الساق و القدم. سنط/ خرکە، خرتکە.

– الرجل/ قولەپێ.

– الید/ مەچەك.

التواء الـ – / لە خرکەچون.

رسل:

رَسِلَ. إستَرْسَلَ الشعْرُ و أمثالە: صار سبطاً و تدَلّی/ داهات، خاو بوەوە، پەخشان بو، هاتە خوارەوە.

راسَلَ. تَراسَلَ: بعث الیه رسالَة/ نامەی بۆ نارد.

ارْسَلَ الشيء: بَعَثَ/ ناردی.

– الیه/ بۆی نارد.

– مَعَهُ/ لەگەڵی نارد.

– فی طلبه/ ناردی بە شوێنیا.

تَرَسَّلَ: تَمَهَّلَ و ترفق/ لەسەرخۆ بو، شێنەیی کرد، لەسەرخۆو بە شێنەیی (جولایەوە، کرداری کرد).

إستَرْسل فی الکلام: إتسع و إنبسط: تکلم بطلاقة/ بەرەوانی دوا، بەزمان پاراوی دواو قسەی کرد.

رَسْل. سَهْل/ ئاسان، زمان رەوانی.

– من الشعر: مُستَرْسَل/ پرچ یا قژی خاو، پەخشان.

رسالة: خطاب/ نامە، پەیام.

– : کُرّاسَة. کتیب/ نامیلکە.

– : إرسالیَة: شيءٌ مُرْسَل/ نێرراو.

رَسول. مِرْسال/ نامەبەر، پەیام بەر.

– . مُرسَل: مبعوث/ نێراو، نوێنەر، پەیك.

– . نَذیر/ مژدەهێن.

مُرسَل للتبشیر بالدین/ پەیام بەر، پەیام هێن.

– إلیه/ بۆ نێرراو.

مُرْسِل. راسِل: الذی یُرْسِل/ نێرەر، پەیام نێر.

مُراسِل: خادم/ بەردەست، تەتەر.

مُراسَلَة: مُکاتبَة/ نامەنێری، نامەناردن.

رسم:

رَسَمَ: صَوَّرَ/ وێنەی کێشا.

– بالالوان: نَقَشَ/ نەخشەی کێشا، نیگاری دروست کرد.

– الشيءَ: صَنَعَ صورته/ وێنەی دروست کرد.

– : وَصَفَ/ باسی کرد.

– له کذا: أمَرَهُ به/ فەرمانی پێدا، بۆی دانا کە بیکا.

إرتَسَمَ الأمْرَ: إمتثله/ فەرمانی بەجێ هێنا، کردی.

رَسْمٌ: صورة/ وێنە، نیگار.

– : تَصویر/ وێنە (دروست کردن، کێشان).

– : وَصْف/ باس کردن.

– : أثر/ شوێن، نیشانە.

– : ضَریبة/ باج، میرانە.

رَسْمی: ذو صفه رسمیة أو حکومیه/ میری.

– : أصولی. قانونی/ یاسایی، رێك و پێك.

ثوب – / بەرگی تایبەتی، بەرگی تەواو.

شُبْه – / نیوە میری.

غَیْر – / نامیری.

إجراء – / کرداری یاسایی.

رَسّام: مُصَوِّر/ وێنەگر، نیگارکێش.

– : واضع الرسوم الهندسیة/ وێنەکێش، نەخشەکێش.

مَرْسَم/ وێنەگا، ستودیۆ، نیگارگە.

مَرسوم: مُصَوَّر/ دروستکراو، وێنەکراو.

– بقانون: أمر عال/ فەرمان.

– جمهوری/ فەرمانی کۆماری.

مراسیم المناسبات/ نەریت.

رسن:

رَسَنَ. أرْسَنَ الدابَّةَ: جعل فی راسها الرَسَن/ رەشمەی کرد، رەشمەی کردە ملی.

رَسَن. حَبلٌ خاص/ رەشمە.

رسا:

رَسا: ثَبُتَ و رَسَخَ/ جێگیر بو، چەسپی.

– المركبُ: رَمى الأنجَر/ لەنگەری (هاویشت، فڕێدا) (کەشتی).
– المركَبُ: وَقَف في المرسى/ وەستا، کەشتیەکە لە بەندەر وەستا.
– المزاد أو العطاء/ هەراج یا مەزادەکە وەستاو کۆتایی پێهات.
أرسى السَفينَة/ کەشتیەکەی وەستان، دابینی کرد.
راسٍ: واقف في المرسى/ وەستاو، راوەستاو لە بەندەر.
– : ثابت/ جێگیر، چەسپیو.
– . رواسٍ: جبل/ شاخ، چیا، قوچکە.
رَسو/ لەنگەرگرتن.
مرساة المركب/ لەنگەر.
مرسىَ السفن: مَرفَأ/ شوێن وەستانی پاپۆڕو کەشتی، بەندەر.
رش:
رَشَّ الماء و غيره: نَفَضَهُ و فَرَّقَهُ/ رشتی، رژانی.
– الارضَ بالماء/ ئاوپشێنی کرد.
– الحائط بالجص/ تەڕاوی دا، گەچ کاری کرد.
– الشجر بالماء/ ئاوی پیاکرد، ئاوی پیاپرژان.
– دقيقاً أو سكراً أو ملحاً على/ (ئارد، شەکر، خوێ)ی پێوە کرد.
– ت . أرَشَّت السماء: جاءت بالرَشّ/ باران باری، رشێنەی کرد.
رَشّ: طَشّ/ رشتن، رژاندن، ئاوپشێن کردن.
– . رِشاش. رَشَّة مطر: المطر القليل/ نمەباران، رشێنە.
رَشّاشَة. مِرشَّة: اداة مُثَقَّبه للرَشّ/ ئاوپرژێن.
– الرصاص: بندقية آلية/ گوللە هاوێژ، رەشاش.
– الروائح العطرية/ گولاوپرژێن.
رشح:
رَشَحَ. إرتَشَح الماءُ: تَحَلَّب/ دەلی، پالێورا.
– . – الإناءُ: نَضَحَ/ لێی تکا، دەلانی، پالاوتی، ئاوی دزی.
– . – الجَسَدُ: عَرَقَ/ ئارەقی کردەوە، ئارەقی دەردا.
رَشَّحَ الماءَ: قَطَّرَهُ/ پالاوتی، ئاوەکەی پالاوت.
– الرجل لمنصب: ذَكَر إسمه/ ناوی هێنا، پالاوتی بۆ کارێك.
– : أهَّلَ لأمر ما/ ئامادەکرا، پەروەردە کرا، سازکرا، گونجێنرا.
– : زُكِمَ/ سەرمای بو، توشی هەلامەت بو.
تَرَشَّحَ الماء: تَحَلَّبَ/ پالاوت، پالێورا.
– لمنصب: ذُكِرَ إسْمَه/ ناوهێنرا، پالێورا بۆ کارێك.
– لأمر: تَأَهَّلَ لَه/ ئامادەبو، پەروەردەبو، سازبو، گونجا.
رَشْحٌ. ترشيح: تَحَلُّب/ پالاوتن.
– . – : نَضْح/ لێ تکان، دەلاندن، ئاودزکردن.
– . رشيح: عَرَق/ ئارەق.
تَرْشيح لمنصب/ ناوهێنان، پالاوتن بۆ کارێك، دەست نیشان کردن.
مُرَشَّح لمنصب/ ناونراو، پالێوراو بۆ کارێك، دەست نیشان کرا.
مُرَشِّح الماء. راشِح: راووق/ فلتر، پالێوك، ئاوپالێو، دەلێنەر.
رشد:
رَشَدَ. رَشِدَ: إهتدى و إستقام/ رێی راستی گرت.
– : افاق/ هۆشی هاتەوە، فامی کردەوە، هەستی جولا، بەخۆی زانی.
– : بَلَغَ رُشْدَهُ او سِنّ الرُشد/ بلوق بو، چوە تەمەنی هەرزەکاریەوە.
أرْشَدَ: عَلَّمَ/ فێری کرد.
– . رَشَّدَ: دَلّ و هدى/ رابەری کرد، رێی راستی نیشان دا.
إستَرْشَدَ: طَلَبَ الرُشد/ پرسی، راوێژی کرد، ویستی تێبگا.
– لأمره: إهتدى لَه/ پەیرەوی کرد، رێی راستی زانی، تێگەیی.
رُشد: عَقل: صَواب/ هۆش، ژیری، هەست، فام.
– . رَشد. رَشاد: يَقْظَة/ بیرکردنەوە، هەست جولان، رێی راست گرتن.
بَلَغَ رُشْدَهُ/ بلوق بو، فامی کردەوە.
فقد رُشدَهُ/ هۆشی نەما.

سِنّ الرُشْد: بلوغ/ فام كردنەوە، هەرزەكاری، سێرەی (پێگەیین، بلۆق بون).

راشِد. رشيد. لرشد: يَقِظ. صاحٍ/ هۆشيار، هەستيار، بەخەبەر.

— . — : عاقل/ ژیر، زرنگ.

— . — : مُهْتَدٍ/ رابەر.

— : بالغ، ضد قاصر/ هەرزەكار.

لرُشْدِيَّة: بلوغ الرُشد/ گەیشتنە سێرەی هەرزەكاری.

إرشاد: دَلالَة/ رابەری، رێ نمایی، رەهبەری.

— : تعليم/ فێركردن، رێنمایی. رێنما.

— : مَشورة/ راوێژ كردن، ئامۆژگاری.

ترشيد/ راوێژ، راوێژكردن.

مُرشِد: دليل/ رابەر، ئامۆژگار، رەهبەر، رێبەر.

— : معلم/ مامۆستا، فێركار.

رَشاد: نبات/ تەرەتیزە.

رشف:

رَشَفَ. رَشَفَ: إرتشف الماءَ: مَصَّهُ بشفتيه/ مژی، بەلێو خواردیەوە، هەڵێ لوشی.

— الإناءَ: شَرِبَ مافيه/ هەموی خواردەوە.

مرشَف: مايمتص به الماء/ ئاومژە.

مراشِف: شِفاه/ لێو، لچ.

رشق:

رَشَقَ. بَحجَرَ: رَمى/ بەردی هەڵ دا، بەردی هاویشت.

— ـه ببصره: أحَدَّ النظر اليه/ چاوی تێبری، چاوی لێ زیت كردەوە.

— ـه بلسانه: طعن عليه/ قسەی پێ وت، قسەی ناشیرینی پێ وت.

— : كان حَسَنَ القَدّ: لطيفَهُ/ شۆخ بو، شۆخ و شەنگ بو.

— : خَفَّ في عمله/ چابوك بو، گورج و گۆل بو.

رَشيق القوام: لطيف/ شۆخ، شۆخ و شەنگ، قەشەنگ، شوش، خەرامان.

— الحركة: نشناش. خفيف/ سوكەڵە، گورج و گۆڵ، چابوك.

رشاقة القوام/ قەشەنگی، شۆخی، بالانەمامی.

— : سُرعه و خِفّة/ سوكەڵەیی، گورج و گۆڵی.

رشا:

رَشا: أعطى الرَشوَة/ بەرتیلی دا.

إرتَشى: اخذ الرشوة/ بەرتیلی وەرگرت.

إستَرشى: طلب الرشوة/ داوای بەرتیلی كرد.

رَشْوَة. رِشْوَة. رُشْوَة/ بەرتیل، دەم چەوركردن.

رَشْو: إرشاء/ بەرتیل دان، دەم چەوركردن.

راشٍ: مُقَدِم الرشوَة/ بەرتیل دەر.

مُرتَشٍ: قابل الرشوَة/ بەرتیل خۆر.

رص:

رَصَّ. رَصَّصَ الشيءَ: كَبَسَ و دَكَّ/ كردی بە ناویەكدا، تێكی ئاخنی، پەستایەوە.

— . — : دَكَّ/ كوتایەوە.

— : رَتَّبَ/ رێكی خست.

رَصَّصَ: طلاه بالرصاص/ قورقوشمی تێ گرت، روكەشی كرد بە قورقوشم.

تَرَصَّصَ. إرتَصَّ: تلاصَقَ/ پێكەوە نوسا، چوەیەك، پەسترایەوە.

تَراصَّ القومُ: تضامَنوا و تلاصقوا/ یەكیان گرت.

مَرصوص. رصيص: مكبوس،/ پتەو، پەستراو، سفت.

رصاص: معدن معروف/ قورقوشم، سرب.

قلم — : قلم عادی/ قەڵەمی رەش.

رصاصَة البندقية: طلقه/ گولله، فیشەك.

رصاصي: من الرصاص/ قورقوشمین، لە قورقوشم دروست كراوە.

— اللون/ خۆڵەمێشی، قورقوشمی.

رصد:

رَصَدَ. تَرَصَّدَهُ. إرتصده. راصَدَهُ: تَرَقَّبَهُ. راقبه/ تێبینی كرد، چاوی لێوەبو، شوێنی كەوت.

— . — لـه: قَعَدَ لـه علی طريقه/ بۆی دانیشت، خۆی بۆ نایەوە.

لرصَدَ. رَصَّدَ الحساب: وزنه و قَفَلَهُ/ حسابەكەی ترازو كرد.

— له شيئاً: اعَدَّهُ/ بوی تەرخان كرد، تەرخانی كرد.

رَصْد: مُراقَبَة/ تێبینی كردن، چاودێری كردن، شوێن كەوتن، ئاگاداركردن.

رَصَدٌ. مِرصاد: الطريق/ رێگە، روانگە.

— . — : كَمين/ بۆسە، نانەوە.

راصِد: رَقيب/ چاودێری كەر، پاسەوان.

– : الذی يَقْعُد بالمرصاد/ له بۆسەدابون، ئەوەی ئەچێتە بۆسەوە.

مَرصد. مرصاد: مَرقب/ روانگە.

رصيد الحِساب: باقِيَهُ/ ئەوەی ماوەتەوە، پشتیوانە.

– البضائع: الموجود منها/ ئەوەی کە هەیە، ئەوەی ماوەتەوە.

رصع:

رَصَعَ: ضَرَبَ/ لێی دا.

– . إرْتَصَعَ الحَبَّ: دَقَّهُ بين حجرين/ هاڕی، بەدەستاڕ هاڕی.

– بالمكان: اقام/ مایەوە، گلی خواردەوە.

رَصِعَ بالشيء. إرتصع به: لصق به/ پێوەی نوسا.

رَصَّعَ: نَظَمَ/ ڕێکی خست، هۆنیەوە.

– : نَسَّجَ/ سفتی کرد، هێنایەوەیەك.

– الذَهَبَ بالجواهِر: انزلها فيه/ تێی کرد، زێڕو مرواری پێکەوە هۆنیەوە.

مُرصَّع بكذا. تاجٌ مرصَّع/ نەخشێنراو.

رَصيعَة: حُلْيَة وسطانيه/ مەدالیۆن، کەڵەمورووی ملوانکە.

مِرصاع: دَوّامَة/ مزراح.

رصف:

رَصَفَ الطريق: رَصَفَهُ بالحجارة/ بەردڕێژی کرد.

رَصِفَت. رُصِفَت اسنانه: إنتظمت/ دانی (ڕێك بو، سفت بو).

تَرَصَّفَ. تَراصَفَ. إرتصفت الحجارة. إنْظَمَ بعضها الى بعض بانتظام/ چونە پاڵ یەك، یەکیان گرت.

– . – . – القومُ في الصَفِّ: تراصوا/ ریزبون، چونە پاڵ یەك، بەریز وەستان.

رَصْفُ الطُرق/ بەدرێژ، بەردڕێژ کردن.

رَصَف. رَصيف: الطريق المرصوف/ بەردڕێژ، چەوڕێژ.

– . – : مَمْشى/ شۆسە.

– . – المحطة و غيرها/ شۆسەی نیستگە.

رصيف: مُحْكَم/ سفت، پتەو، قایم.

رَصافه: إحكام/ سفتی، پتەوی، قایمی.

رصن:

رَصَنَ الأمرَ: أتَمَّهُ و اتقنه/ تەواوی کرد بەڕێك و پێکی.

رَصُنَ: استحكم و ثبت/ قایم بو، پتەو بو.

رصانه: ثبات: حزم/ قایمی، پتەوی، هێمنی.

رصين: ثابت. حازم/ قایم، پتەو، هێمن.

رض:

رَضَّ. رَضْرَضَ: جَرَشَ/ هاڕی، وردی کرد، تێکی شکان.

– العُضو: كَدَمَ/ کوترا.

إرْتَضَّ الشيءُ: تَكَسَّرَ/ تێك شکا، وردبو هاڕا.

رَضيض: مرضوض: مُكَسَّر/ تێك شکاو.

– . – : كادم/ کوتراو.

رَضراض: الرجل كثير اللحم/ گۆشتن، تێك سمڕاو، قەڵەو، خپشە، شیشمان.

رضب:

رُضاب: لُعاب. ريق/ لیك، لیکاو، تف.

– : بَرَد/ تەرزە.

ماء – : عَذب/ ئاوی خۆش، شیرین.

رضخ:

رَضَخ: كَسَرَ/ شکانی.

– : أذعَنَ/ خۆی دایە دەستەوە، ملی دا، سەری شۆڕکرد.

– : لانَ/ نەرم بو.

– له من مالة: أرْضَخَ له: أعطاه قليلاً من كثير/ کەمی دایە.

تَرَضَّخَ: تَكَسَّرَ/ شکا، تێك شکا.

رَضْخ. رَضيخَة: العطاء القليل/ کەمەك بەخشندەیی، کەم دانێك.

رُضوخ: إذعان/ خۆ بەدەستەوە دان، مل دان، سەرشۆڕکردن، قایلی.

مِرضخ: كَسّارَة الجوز واللوز/ گوێز شکێن.

رضع:

رَضِعَ. إرْتَضَعَ: إمْتَصَّ الثدى/ مەمکی مژی، شیری خوارد.

أرْضَعَ. رَضَّعَ/ شیری دایە، مەمکی دا.

راضَعَهُ. رَضَعَ مَعَهُ/ پێکەوە شیریان خوارد.

مُرضِع: الأم لها ولد تُرْضِعه/ شیردەر، منداڵبەر.

– : مُرضِعَة: المراة ترضع بأَجْر/ دایەن.

رَضع. رَضاع. رَضاعَة. رِضاعَة/ شیردان.

رَضاعة: إمتصاص الثدى/ مەمك مژین.

رضاعَة: زجاجة الارضاع الصناعي/ مەمكە شوشە.
رَضيع. مازال يَرضَع/ شیرەخۆرە، مەمكەخۆرە، بەرمەمكە.
— : طفل/ ساوا، كۆرپە.
— . اخ في الرضاعَة/ برای شیری.
رضف:
رَضْف. رَضيف: الحجارَة المحماة/ بەردی گەرم كراو.
رَضْفَة الركبَة: صابونة الركبة/ كلاوەی ئەژنۆ.
رضا:
رضى: ارضى الرَجُلَ: جعله يَرضى/ قايلی كرد، رازی كرد.
رَضى الرَجُلَ: أعطاه مايُرضيه/ ئەوەندەی دایە قایل ببێ.
رَضِيَ. إرتَضى الشيءَ و به و فيه: قَبِلَهُ/ وەری گرت، قایل بو، رازی بو.
— . — الشيءَ: قنع به/ پێی قایل بو، پێی رازی بو.
— عنه و عليه: ضد سَخَطَ/لێی رازی بو.
— عنه و عليه: استحسنه/ پەسەندی كرد.
— الله عنه/ دروودی خوای لێ بێ، خوا بێبەخشێ، خوای لێ رازی بێ.
راضى. تَرَضّى. إستَرضى: طلب رضاه و توَخاه/ رەزامەندی ویست، داوای قایل بونی لێ كرد، ئاشتی كردەوە.
رِضىً. رُضىً. رِضاء. رِضوان. مَرضاة: قَبول: قَناعة/ قایلی، قایل بون، رازی بون.
— — — : سُرور/ خۆشی، شادی، دڵ ئاو خواردنەوە.
راضٍ: قابل و قانع/ قایل.
عَيشَةٌ راضِيَة: يرضى بها صاحبها/ ژیانێكی قایلانە.
ترضِيَة: تعويض/ قایل كردن، رازی كردن، بژاردن، دڵ (راگرتن، ئەوایی كردن).
تَراضٍ: تبادل المراضاة/ لەیەك قایل بون.
مُرضٍ: مُقنع/ قایل كەر، سەلمێنەر.
— : سارٌ/ دڵ خۆش كەر، شادی بەخش.
رطب:
رَطِبَ. تَرَطَّبَ: نَدِيَ. إبتَلَّ/ تەربو، شێی هێنایەوە.
رَطَّبَ. ارْطَبَ: نَدّى. بَلَّلَ/ تەڕی كرد.
— البَلَحُ: صار رُطباً/ خورماكە پێگەیی.
رَطِب. رطْب. رَطيب: نَديان/ شێدار، نمدار.
— . — . — : بليل. بارد/ تەڕ، سارد، پاراو.
— . — . — : ضد يابس/ نەرم، شل، نەرم و شل.
غلام رَطبٌ: فيه لين النساء/ جوانكیلە، ژنانی، نەرم و نۆڵ و ژنانی.
عَيش رَطب: هَنِّي/ خۆش گوزەرانی.
رُطوبَة: ضد جَفاف/ شێ، تەڕی.
مانع الـ —/ دژە شێ، شێدژ.
مُرَطِّب: مُنعِش/ خۆش، فێنك، ساز، سارد.
مُرطِّبات: مَشروبات مُنْعِشَه/ ساردەمەنی.
رُطَب: بلح ناضج/ خورما، خورمای پێگەییو.
مرطاب: جهاز قياس الرطوبَة/ شێ پێو.
رطم:
رَطَمَ: أوقعه في الوحل أو في أمر متيسر الخروج منه/ خستیە قوڕەوە، توشی بەڵای كرد.
— المَركِبَ/ دای بە رۆخدا.
إرْتَطَمَ: سَقَط في الوحل أو في الرُطمَة/ كەوتە قوڕەوە، توشی بەڵا بو.
— المركبُ/ بەر رۆخ كەوت، خۆی دا بە بەندەردا (پ‌ڕۆپ).
رُطمَة: الأمر العسير المُعَقَد/ بەڵا، بەڵای ناگەهان، كاری ئاڵۆز.
مَرطِم: رصيف الأمواج/ بەستی ناو دەریا، رۆخ.
رُطام: إحتباس البطن/ گرفت، سك دەرنەچون، قەبزی، باكردن.
رطن:
رَطَنَ: تكلم بلُغَةٍ غَريبَة/ بە زمانێكی نامۆ دوا.
رِطانه: لغه غريبة/ زمانی بیانی.
رُطَيْنى: كلام غير مفهوم/ وڕێنە.
رع:
رَعَّ الريحُ: سكنت/ باوەستا، كپی كرد.
رَعاع: سَفَلَة الناس/ هەرچی و پەرچی ، ئەلەوجەلە.
رَعْرَعَ: نَشَأَ و شَبَّ/ پێگەیی، گەشەی كرد، گەورە بو.
رَعْراع: القَصَب الطويل/ قامیشی درێژ، داری واوەیلا.

رعب:
رَعَبَ. إرْتَعَبَ: خافَ. فَزِعَ/ ترسا، تۆقی، سامی لێ نیشت.
– . رَعَّبَ. لرْعَبَ. خَوَّفَ/ ترسانی، تۆقانی.
رُعْب. رُعُب. فَزَع/ ترس، تۆقین، سام، مەترسی، سڵ کردنەوە، سڵەمینە.
مُرعِب: مخيف/ ترسناك، بەسام، سامناك، ئەرژەنگ، بەمەترسی.
مَرعوب: خائف/ ترساو.
رعد:
رَعَدَ السحابُ: اسْمَعَ الرَعْدَ/ هەور گرمانی.
– له: تَهَدَّدَهُ/ هەڕەشەی لێ کرد.
لرْعَدَ: صيَّرَهُ يَرْتَعِدُ/ لەرزانی، خستیە لەرزین.
إرتعد: إضطرب و إهْتَزَّ/ شپرزەبو، پەشۆکا، لەرزی، راچڵەکی، راتەکی.
– خوفاً او غضباً/ لە ترسا یا لە تورەییدا هەمو گیانی هاتە لەرزین.
رَعْد: صوت السحاب/ گرمەی هەور.
رَعّاد: سَحابَة كثيرة الرعد/ هەوری بە گرمە.
– : كثير الكلام/ زۆربڵێ، چەنەباز.
– : سَمَكَة نرعد مَن مسَّها/ ماسیە لەرزە.
رَعْدَة. رِعْدَة: الإضطراب من الفزع و غيره/ شپرزەبون، پەشۆکان، موچرکە، لەرزین، راتەکین، راچڵەکین.
رعديد: جبان/ ترسنۆك.
رعش:
رَعَشَ. إرْتَعَشَ: إرتجف/ لەرزی.
– . – برداً او خوفاً/ لە سەرمانا لە ترسانا هەمو گیانی هاتە لەرزین.
رَعَّشَ. لرْعَشَ: جعله يرتجف/ هێنایە لەرزین.
رَعْش. رَعَش. إرتعاش: إرتجاف/ لەرزین.
إرتعاش شيخوخي/ لەرزۆکی.
رُعْشَة الحُمَّى. رُعاش/ موچرك، لەرز.
رَعِش. رعشيش: جبان/ ترسنۆك.
– . – : السَريع الى القتال و المعروف/ مەڵەشە.
رِعْشَة: عَجَلَة/ مەڵەشەیی.
رعص:
رَعَصَ. لرْعَصَ: حَرَّكَ و هَزَّ/ لەقانی، جولانی، لەرزانی.
تَرَعَّصَ إرْتَعَصَ: تَلَوَّى/ کێنگڵەی دا، تلایەوە، ئەم دیو ئەودیوی کرد.
رعف:
رَعَفَ. رَعِفَ أنْفُهُ: خرج الدم منه/ خوێنی لوتی بەربو، لوتی خوێنی لێ هات.
رُعاف: فَصْدُ الانف/ لوت پژان، خوێنی لوت بەربون.
– : مطر كثير/ بارانی زۆر، رەهێڵە، لێزمە.
راعوف: صَخرة عند راس البئر/ بەردی سەربیر.
راعِف: طرف لرنبة الانف/ سەری لوت.
رعل:
رَعِلَ: حَمُقَ/ کەربو، خۆی کەرکرد.
– النبات: تَهَدَّلت اغصانه/ لق و پۆپی شۆڕبووەوە.
لرْعَلَ: احْمَقُ/ کەر، گێل، گەوج، کەودەن.
– : ما تَهَدَّلَ من النبات/ لق و پۆپی شۆڕەوەبو.
رَعيل: المتقدمة من الخيل و الرجال و الطيور/ پێشەنگ، سەرگەلە.
– من الجنود: صَفّ من الجنود يوضع خلف صَفّ آخر ليدعمه/ پاڵ پشت، پشتگیر، پشتیوان.
رعم:
رَعَمَ. رَعُمَ. لرْعَمَت الشاة: إشتدّ هزالها فسال رعامها/ ئاوی لوتی داهات، چڵم و پیسی بە لوتیا هاتە خوارێ (بەهۆی لەربوونەوە).
رُعام: مُخاط/ چڵم.
– : مَرَض يصيب الخيل/ مرخە، سەقاو.
رعن:
رَعَنَ. رَعِنَ. رَعُنَ: حَمُقَ/ خۆی کەرکرد، حۆل بو.
– . – . – : إسترخى/ لەشی خاوبووەوە.
رَعَنَتْهُ الشمس/ خۆر بردی.
رُعُونَة: طيش و نزق/ مەڵەشەیی، کەرێتی.
ارعن: طائش. نزِق/ مەڵەشە، کەر، پەتەیی، پەتیارە، حۆل، کەلەڕەق.
رَعْن: ضَرْبَة شمس/ خۆربردن.
رعا:
رَعِي. إرعوى: رجع عن جهله/ گەڕایەوە، فامی کردەوە.
إرعوى: كف و رجع عن قبيح/ دەست بەرداری خراپە بو، پەشیمان بوەوە، لە کرداری خراپە گەڕایەوە.

رَعوى: الرجوع عن الجهل/ پەشیمان بونەوە، گەڕانەوە، دەستبەرداری خراپە بون..

**رعى: رعى. إرتعى. لرعى: كلأ/** لەوەڕانی.

— : **ساسَ و دَبَّرَ شانَه/** سەرەو کاری کرد، بەڕێوەی برد.

— . **راعى: راقَبَ/** چاودێری کرد.

— . — **الأمر: حافظ عليه/** پاراستی.

— . — **الأمر: عمل حسابَهُ/** حسابی بۆ کرد.

— **الجلد و الرأس: حَكَّهُ/** خورانی.

**راعى الرجل: التفت اليه/** ئاوڕی لێ دایەوە، یارمەتی دا، گوێی دایە.

— **الخواطر/** ڕێزی گرت، ڕێزی لێ نا.

— . **ارعى سمعه/** گوێی بۆ شل کرد، گوێی لێ گرت.

**إسترعى الالتفات: طلب أن يَصغى اليه/** داوای گوێ لێ گرتنی کرد.

**رِعايَة. مُراعاة: إلتفات/** ئاوڕ لێ دانەوە، ڕێزگرتن، ئاگاداری کردن، چاودێری کردن، سایە.

— . — : **حِفظ/** پاراستن.

— : **تعضيد/** یارمەتی دان، پشتگیری کردن.

**تحت رِعايَة. فى رِعايَة/** لەژێر چاودێری.

**رَعَوِيَّة: تَبَعِيَّة. جنسية/** ڕەگەز، نەوە، ڕەگەزنامە، نەژاد.

**رَعِيَّة: قطيع عليه راع/** ڕەوە، ران، ڕەوگ.

— : **القوم عليهم حاكم. عامَّة الناس/** میللەت، گەل.

**راعٍ: الذى يَرعى الغنم/** شوان.

**راعى القطعان/** ڕەوەوان، ڕەوگەوان.

— **الغَنَم/** شوان.

— **البقر/** گاوان.

— **النعاج/** مێ گەلەوان.

— : **كل مَن وَلِّى امر قوم/** بەڕێوەبەر، چاودێری، سەرگەورە، ئەرخە.

**مَرعى: كلأ/** لەوەڕ، پاوە، چایەر، پاوەن، پاوان، بژوێن.

**مَرْتع: موضع الرعى/** لەوەڕگا.

**مَرْعِى: مُلتَفَت اليه او معمول به/** باو.

**عادَة مَرعِيَّة/** خو یا کرداری باو، نەریت، مۆدە.

**مُراعى المواعيد: محافظ عليها/** بەڵێن ڕاست.

**مُراعات: مُحاباة. تَمْييز/** ڕێزلێنان، ڕێزگرتن، بەتەنگەوە هاتن، چاودێری.

**رغب:**

**رَغِبَ: اراد/** ویستی، ئارەزوی کرد، داخوازی کرد، مۆزەمۆزی بو.

— **عنه: اعرض عنه و تركه/** وازی لێ هێنا، خۆی لێ لادا، خۆی لێ پاراست.

— **به عن غيره: فَضَّلَهُ على غيره/** پەسەندی کرد.

— **اليه: إبْتَهَلَ/** پاڕایەوە، نزای کرد، لالایەوە، تکای کرد.

**رَغَّبَ. ارغب: جعله يَرغب/** هانی دا، پێی پەسەند کرد، پێی سەلمان.

— . — : **شَهَّى. اغرى/** ئارەزوی جولان.

**رَغْبَة: شَوق/** ئارەزو، ویستن، خواستن، داخوازی، هەوەس، مۆزەمۆز، خولیا، دل پێوەبون.

**رغائب: أمانى/** هیوا، ئاوات، ئامانج، داخوازی.

**راغِب: مُتَشَوِّق/** ئارەزومەند.

**مُرَغِّب: يحمل على الرِغْبَة/** فریودەر، پەسەندکەر.

**مَرغوب. رَغيبَة: مطلوب/** پەسەند، ویستراو، ئەویستێ.

— **فيه: رائج/** باو.

**رغث:**

**رَغَثَ الولد أمَّهُ: رَضَعَ/** شیری دایکی خوارد، مەمکی دایکی مژی.

**أرْغَثَ المراةُ ولدها: ارْضَعَتْهُ/** شیری دا بە کوڕیەکەی.

**رَغوث: رضيع/** شیرەخۆرە، ساوا.

**رغد:**

**رَغَدَ. رَغُدَ العَيْش: طاب و إتَّسَع/** گوزەران باش بو.

**رَغَد. رَغْد. رَغيد. رَغادَة العيش/** ئاسودەیی خۆش گوزەرانی.

**رَغف:**

**رَغَفَ العَجينَ: قَرَّصَهُ. جمعه و كَتَّلَهُ/** گونکی گرت، کردی بە گونك.

**رَغيف: الكتله من العَجين/** گونك.

— : **مارُقِّقَ و خبز من العجين/** کولێرە، لەواشە، ئەستورك، نان، نانی هەورامی، پەنجەکێش.

**رغم:**

**رَغَمَ. ارْغَمَ: قَهَّرَ/** زۆری لێ کرد، ناچاری کرد.

رَغْم. إرغام: إجبار. قَسر/ زۆر لێ کردن، ناچارکردن.
على الرغم من. رَغْما عَن/ لەگەڵ ئەوەشدا، سەرەڕای ئەوە، ئەگەرچی.
رَغْماً عن انفه/ بیەوێ یا نەیەوێ، بەتوپزی، بەزۆر، بە کوێرایی چاوی.
رُغام: مُخاط/ چڵم.
رَغام: تُراب/ خۆڵ، خاك.
رغا:
رَغا. رَغّى. ارغى: أزْبَدَ/ کەفی کرد.
رَغّى. ارغى: ضَجَّ و تَهَدَّدَ/ تورە بو، نەڕانی، کردی بە گرمەگرم.
رَغْوَة. رُغْوَة. رَغاوَة من اللبن: ما عليه من الزبد/ توێژ، سەرتوێژ.
— . — . — الطبخ/ کەف.
— . — الصابون/ کەفەسابون، سەرکەف.
— . — المعادن/ پەگر.
مرغاة: ماتُؤْخَذ به الرَغْوَة/ کەف گیر، کەوگیر.
رَغْي، كلام مُرغي: هَذْرَمَة/ چەنەبازی، زۆربلێیی، بزرکاندن، قسەی (قۆرو بێ مانا، هەلەق و مەلەق).
رَغّاء: ثرثار/ چەنەباز، زۆربلێ.
رغيف (في رغف)
رف:
رَفَّ القَلْبُ: خَفَقَ/ دڵ پرتەپرتی کرد، دڵەکوتێی کرد.
— الجنينُ في البطن: إرتكض/ کۆرپەلە جولا.
— ت العينُ: إختَلَجَت/ چاوفری.
رَفّ: خفقان القلب/ دڵەکوتێ، پرتەپرت.
— : إختلاج/ چاوفرین.
— . رَفيف: قشعريره/ موچرك.
— : صُفَّة/ رەفە.
رَفْرَفَ الطائرُ: حَرَّك جناحيه/ بالی (راوەشان، بڵاوکردەوە).
رفأ:
رَفَأَ الثوبَ: لأم خِرقَهُ و خاطَه/ چنیەوە، درویەوە.
رَفَّأَ هَنَّأَ بالزواج قائلاً (بالرفاه و البنين)/ پیرۆزبایی لێ کرد، پێی وت، بەخۆشیو وەچە خستنەوە.
رفاء: إتفاق و وفاق/ رێکی و خۆشی، گونجان، پێك هاتن.

رَفّاء: رَتّاق/ بەرگ چاکەر، پینەچی.
مَرْفأ: مَرْسى المراكب/ بەندەر، وێستگەی پاپۆرو کەشتی.
رفت:
رَفَتَ: دَقَّ و كَسَرَ/ شکانی، وردی کرد، لەتی کرد.
— . تَرَفَّتَ: إنْكَسَرَ و إنْدَقَّ/ شکا، ورد بو، لەت بو.
رُفات: حُطام/ پاش ماوە، چڵ وچێو.
— : جُثَّه/ تەرم، کەلاك.
رفد:
رَفَدَ: دَعَمَ. أعانَ/ یارمەتی دا، پشتگیری کرد.
— الحائط: أسْنَدَهُ/ رای گرت، کۆڵەکەی دایەبەر.
رِفد. رافِدَة: مَعونَة/ یارمەتی، باربو، پشتگیری.
— . — : دِعامَة/ کۆڵەکە.
رِفادَة: عُصابَة الجرح/ برین پێچ.
رافد: فرع من نهر/ زێ، چەم.
رفس:
رَفَسَ: ضَرَبَ في الصدر/ کێشای بە سنگیا.
— : لَبَطَ: دَفَعَ بالرجل في الصدر/ جوتەی وەشان، لەقەی لێدا، لەقەی ماویشت، لەقەی وەشان.
رَفْسَة: ضَرْبَة بالرجل في الصدر. لَبْطَة/ جوتە، لەقە.
— السلاح الناري: تَراجُع/ تەکانی چەك بۆ دواوە لەکاتی تەقاندنیا، بەپاشاماتن.
رَفوس: من شأنه الضرب بالرجل/ جوتەوەشێن، لەقەهاوێژ.
رفاس: حبل تُربَط به يد الحيوان/ دەس (بەست، بەند)، پەتی دەست بەست، پابەند.
رفش:
رَفْش: كَرَك/ خاکەناز.
ارْفَش: عريض الأذن/ گوێ پان، گوێ ڕەپ.
رفض:
رَفَضَ: ضد قَبِلَ/ نەی ویست، وەری نەگرت.
إرْفَضَّ الناسُ: تفرقوا و ذهبوا/ بڵاوەیان لێ کرد.
— الوَجَعُ: زال/ ئێش نەما، لاچو.
— المجلس: إنصرف/ هەڵ سان، بڵاوەیان لێ کرد.
رَفْض: ضد قبول/ نەویستن، وەرنەگرتن، دەست بە رووەوە نان.
مَرفوض. رَفيض: ضد مقبول/ نەویستراو، ناپەسەند.

تَرَفَّضَ: تَعَصَّبَ/ دەمارگرتی.
رَفضی: متعصب/ دەمارگیر، شێت گیر.
— . رافضی: مُرْتَدّ عن الدین و غیره/ گرمڕا، لەڕێی راست لاداو.
تَرَفُّض: تَعَصُّب/ دەمارگیری، شێت گیری.
رفع:
رَفَعَ: ضد وَضَعَ/ بەرزی کردەوە، سەری خست، بڵندی کردەوە.
— : اقام. شَیَّدَ/ هەڵی سان، دروستی کرد، دای مەزران.
— . لزال/ لای برد، هەڵی گرت.
— السعر: غَلا/ نرخی بەرزکردەوە، گرانی کرد.
— العَلَم: نَشَرَهُ/ ئالای هەڵ گرت.
— الی: عَرَضَ علی/ بۆی نوسی، تێی گەیاند، خستیە بەردەستی، سکالانامەی دایە.
— عنه: خَفَّفَ: حەوانیەوە، باری سوك کرد.
— الکلمة: الحقها علامَة الرفع/ بۆری بۆ کرد.
— الدعوی علی/ شکاتی لێ کرد، سکالای لە دەست کرد.
— الغطاء: کشف/ سەری لابرد.
تَرَفَّعَ عن کذا: تعالی/ بێزی نەهات.
— عنهم: تَکَبَّر/ لوتی بەرزکردەوە، خۆی بە بەرز زانی.
تَرافَعَ المحامی أمام المحکمة: دافَعَ/ بەرگری کرد.
إرتفع: طلع. صَعَدَ/ بەرزبوەوە، دەرهات، سەرکەوت، بڵند بوەوە.
— : زاد/ زۆربو، زیادی کرد.
— : زال/ لاچو، هەڵ گیرا.
رَفْع: ضد وَضع/ بەرزکردنەوە، سەرخستن، بڵندبونەوە، لابردن.
علامَة الـ —/ بۆر.
رِفعَة المقام: إرتفاع القَدر و المَنزِلَة/ پایەبەرزی، شکۆ، بڵندی.
رفیع. مرتفع: عالٍ/ بەرز، بڵند.
— القدر: سام/ پایەبەرز، شکۆدار، بڵند.
— ضد غلیظ/ باریك.
— الصوت: شَریف/ پیاوماقوڵ.
رافعَة: عَتَلَة/ نوێڵ.
آلَة — . / کرێن، بەرزکەرەوە، بەرزکار، هەڵ بڕ، بڵندەك.

إرتفاع: صُعود/ سەرکەوتن.
— : إزدیاد/ بەرزبونەوە، زۆر کردن، زۆربون.
— : علو/ بەرزی، بەرزایی.
تَرَفُّع: استکبار/ بێزنەهاتن، لوت بەرزی.
مَرفوع/ بەرزکراو، سەرخراو، بەرز.
— الرأس/ سەربەرز.
— فی النحو/ بۆردار.
مُرافَعَة المحامی: دفاع/ بەرگری.
قانون المرافعات/ یاسای بەرگری.
مُرتَفع: عال/ بەرز، بڵند، بەرزایی، پاسك.
— : سام/ شکۆدار، پایەبەرز.
مُتَرَفِّع: مُستَکبِر/ لوت بەرز، خۆزل.
ترفیع/ پلە پێدان، بالاکردن.
رفق:
رَفَقَ. ارْفَقَ: نَفَعَ و افادَ/ سودی بەخشی.
— . رَفُقَ. رَفِقَ بە و لە و علیە. تَرَفَّقَ بە: عاملَة بلطف/ بەزەیی پیاهاتەوە، رەفتاری باشی لەگەڵ کرد.
رافَقَ: صاحَبَ و عاشر/ هاوەڵی لەگەڵ کرد.
— : سارمع/ لەگەڵی رۆیشت، کەوتە تەکی.
ارْفَقَ بکذا: الحق/ خستیە پاڵ.
إرْتَفَقَ: إستعان/ پەنای بردەبەر.
— بە: إستفاد/ سودی وەرگرت.
ارتفق: إتکأ علی مرفقە/ ئانیشکی دادا.
رِفْق: لین/ نەرمی، بەزەیی، میهرەبانی.
رِفقَة. رُفقَة: صُحبَة/ هاوەڵی، هاوڕێیەتی، ئەوانەی لەگەڵن.
رفیق: ذو رِفق. لطیف/ بەبەزەیی، میهرەبان، نەرم.
— : مُصاحِب/ هاوەڵ، هاوڕێ، دەستەبرا.
— : شریك/ برابەش.
— : عشیق/ خۆشەویست، یار، دۆست.
رفیقَة: عشیقَة/ خۆشەویست، دۆست.
مُرافِق/ یاوەر، وێڵاش، هاودەنگ، هاوەڵ.
إرتفاق. إنتفاع/ سود، سودکردن.
مرفَق. مَرفِق: کوع/ ئانیشك، مرك.
مَرفق الدار: منافعها/ شوێنەکانی کارتیاکردن لە ماڵدا، حەمام و ئاودەست.
— عامَّة/ ئاودەستی گشتی.

مُرفَق بكذا: مُلحق به/ لەگەڵیا.

رفل:

رَفَلَ: جَرّ ذَيْلَهُ و تَبَخْتَرَ/ خۆی باندا، کەش و فشی کرد.

تَرَفَّلَ: تَبَخْتَرَ كبراً/ ترۆفیزی نواند، لارولەنجەی کرد.

رَفِل. رَفِلَة: مُتبختر/ بەترۆفیز، لارولەنجەکەر.

رِفَل: طويل الذيل من الناس/ بەرگ شۆڕ، شەپ و شۆڕ.

– : طويل الذنب: كلك درێژ.

– : كثير اللحم/ گۆشتن.

– : واسع من الثياب/ بەرگی فش، دەڵب، پان و پۆڕ.

رِفْل: ذِيل/ كلك، دامێن، دامان.

رفه:

رَفَهَ. تَرَفَّهَ. إستَرْفَهَ: لان عَيْشَهُ و طاب/ گوزەرانی باش بو.

رَفَّهَ: عَوَّد على الرفاه/ راهاتوە بە رابواردنی باش.

– عن نفسه: مَتَّعَها/ باش رای بوارد، بای باڵی خۆی دا.

رَفاه. رَفاهَة. رَفاهِيَّة: رَغد العَيْش،. نعيم/ خۆش گوزەرانی، باش رابواردن.

ترفيه عن النفس: تَمَتُّع. تسلية/ بۆ دڵی خۆنەکردن، باش رابواردن، بای باڵێ خۆدان.

مُرَفَّه. مُتَرَفِّه. مُتْرَف: مُتَنَعِّم/ ساماندار، بوە، خۆش گوزەران.

رفا (في رَفَأ)

رق:

رَقَّ: ضد غَلُظَ و ثَخُنَ/ تەنك بو، باریك بو.

– . تَرَقَّقَ له: عطف عليه/ بەزەیی پیاهاتەوە، دڵی بۆ نەرم بو.

– : إستحيا/ شەرمی کرد.

– . أرَقَّ حاله: ساءَت حاله و قَلَّ ماله/ تێ شکا، کەم دەست بو.

– العبد: صارَ او بَقِيَ رقيقاً/ بو بەکۆیلە، بەکۆیلەیی مایەوە.

رَقَّقَ. أرَقَّ: جعله رقيقاً/ تەنکی کردەوە، باریکی کردەوە.

– . – قِوام الشيء: خَفَّفَهُ/ (شل، خاو، رون)ی کردەوە.

– . – اللفظ: إستعمل الفاظاً سهلة/ وشەی سوك و ئاسنی بەکارهێنا.

– . رَقَّ العجين و امثاله/ پانی کردەوە، تەنگی کردەوە.

ارَقَّ. إستَرَقَّ العبدُ. مَلَكَهُ/ کردی بە (کۆیلەی خۆی، بەندی خۆی).

رِقَّة: ضد غِلَظ او ثخانة او كثافَة/ تەنکی، باریکی، شلی.

– العيش: سعته و نعمته/ خۆش گوزەرانی.

– الجسم: نحول/ لاوازی.

– الجانب: لُطف: لين/ نەرم و نیانی.

– الطبع: دَماثة الخلق/ ناسکی، رەوشت و خو بەرزی، روخۆشی.

– الشعور و الاحساس: حَسّاسِيَّة/ هەست نیانی.

– القلب: حَنو/ بەزەیی، دڵ نەرمی.

رقيق: ضد ثخين او كثيف/ تەنك، باریك، شل.

– الجانب: لطف/ نیان، نەرم و نیان.

– الجسم: نحيل/ لاواز.

– الحال: قليل المال/ کەم دەست.

– الشعور: حَسّاس/ هەست نیان.

– الطبع: دمث الخلق/ ناسك، خو بەرز، روخۆش.

– القلب: حَنون/ دڵ نەرم، بەبەزەیی.

– . رِقّ: عَبد/ کۆیلە.

– ابيض/ کۆیلەی پێست سپی.

تاجر الـ – : نَخّاس/ بازرگانی کۆیلە، کۆیلەفرۆش.

تجارة الـ – : نخاسَة/ بازرگانیی کۆیلە، کۆیلە فرۆشی.

رقيقة: صَفيحَة/ تەنەکە.

– : قشرة/ توێژاڵ.

رُقاق: خبز رقيق/ نانی تیری.

مرقاق العجين: شَوْبك/ تیرۆك.

مَرقوق: بقلاوا/ پاقلاوە.

رِقّ. استرقاق: عبودية/ کۆیلەیەتی، بەندی، بەندەگی، بەندەیەتی.

– . رَقّ: جلد يكتب عليه/ پێستەی تیانوسین.

– التصوير الشمس/ فلیم.

— : عَبد/ کۆیلە.
رَقّ: سلحفاة البحر/ کیسەڵ، رەقە.
رَقرَقَ الخمرَ: مزجها بالماء/ ئاوی تێ کرد، ڕونی کردەوە.
ترَقرَقَت العينُ: دَمَعَت/ چاوفرمێسکی کرد، فرمێسکی تێزڕا.
— : تلألأ/ درەوشایەوە، شەوقی دایەوە.
رقراق: ما تلألأ/ درەوشەدار، شەوق دار، بریسکەدار.
رقارِق: غیر عمیق/ بوار، تەنکاو، بڕ، دڕ.
رقأ:
رَقَأَ الدمْعُ أو الدَمُ: جَفَّ و إنقطع/ وشکی کرد، وەستا.
— في الدَرَجَة: صَعَدَ/ سەرکەوت، بڵندبوەوە.
أرْقَأَ الدمعَ أو الدمَ: سکنه و حقنه/ وەستانی، وشکی پێ کرد.
رَقوء: مایوضع علی الدم لحقنه/ خوێن وەستێن.
مرقأة: ضاغطة الشرایین/ (خوێن، دەمار) بەست.
رقب:
رَقَبَ النَجمَ و غیره: رَصَدَه/ چاوی تێ بڕی.
— : حاذَرَ/ خۆی لێ پاراست.
— . راقَبَ: حَرَسَ/ پاسی کرد، ئێشکی گرت، ئاگاداری کرد.
— . — الله: خافَه/ لە خوا ترسا.
— . — العمل: ناظره/ سەرەوکاری کرد، چاودێری کرد، بەڕێوەی برد.
— . تَرَقَّبَ. إرتقب: إنتظر/ چاوەڕوانی کرد، چاوەڕێی کرد.
— . — : تَرَبَّصَ/ خۆی نایەوە، چاوی تێ بڕی، چاوەچاوی کرد.
رَقابة. مُراقَبة/ چاودێری کردن، سەرەوکاری کردن، بەڕێوەبردن، سەرپەرشتی کردن، چاوتێ بڕین.
تَرَقُّب. رُقوب: إنتظار/ چاوەڕوان کردن، چاوەڕێ کردن، چاوەچاوکردن.
رَقیب. مُراقِب: حارس/ چاودێر، پاسەوان، ئێشك گر.
— . — : راصِد/ چاوتێبڕ، تێبینیار.
رِقبَة: حراسَة/ پاس کردن، ئێشك گرتن.
— : تَحَفُّظ/ پاراستن، ئاگاداری کردن.
مُراقِب: مُشرِف/ چاودێر، سەرپاڵە.
مُتَرَقَّب. مُنتَظَر/ چاوەڕێ کراو.
مَرقَب: مَرصَد/ ڕوانگە، دەسگای ئەستێرە ناسی.
مرقب فلکی/ تەلەسکۆپ.
رَقَبَة. عُنُق/ مل، گەردن، ئەستۆ، خەن.
لحم الـ — / گەردەمل.
رباط الـ — / بۆینباخ.
رقد:
رَقَدَ: نام/ نوست، خەوت.
— : مات/ مرد، گیانی دەرچو.
— : إضطَجَع/ پاڵ کەوت، شانی دادا.
— الحَرّ أو الریح: سَکَنَ/ وەستا، هێواش بوەوە.
— لمرض اصابَه: لازَمَ الفِراش/ بۆی کەوت، کەوت لە جێگادا.
— ت السوق: کسدت/ بازاڕوەستا.
— ت الدجاجة علی بیضها: حَضَنَتهُ/ مەڵ نیشت، کڕکەوت.
رَقَّدَ. ارقد: جعله یَنام/ نوانی، خەوانی.
— . — : جعله یرقد/ پاڵی خست.
— النباتَ في الزراعَة/ لقی کرد بە ژێر گڵەوە، لقی ڕاکشان.
أرْقَدَ: انام/ نوانی، خەوانی.
— بالمکان: اقام به/ تیامایەوە.
إسترقد: غلبه الرقاد/ خەوبردیەوە.
رَقود: دائم الرقاد/ زۆر ئەنوێ، هەر پاڵ ئەکەوێ.
ترقید النبات/ تول کێش کردن، توشەکردن، لقی ڕوەك کردن بەژێر گڵەوە، ڕاکشان.
— البیض: وضعه تحت الدجاجَة/ مێلکە (خستنە ژێر مریشك، نانەوە).
رُقاد. رُقود: نوم/ نوستن، خەوتن.
— . — : إضطجاع/ پاڵ کەوتن.
وقت الـ — / کاتی خەو.
راقِد: نائم/ نوستو، خەوتو.
— : مُضطَجِع/ پاڵ کەوتو.
مَرقَد: مَضجع/ خەوگە، جێگەی خەوتن.
مُرَقِّد. مُرقِد: دواء مُنَوِّم/ خەو لێ خەر.
رقش:

رَقَشَ. رَقَّشَ: نَقَشَ/ نەخشانی، بۆیەی کرد، پەلاوی کرد.
- . - : زَيَّنَ/ رازاندیەوە، ئارایشتیدا.
ارْقَش: لرْقَط. مُنَقَّط/ بەلەك، خال خال، رەش و سپی، کونج.
رقص:
رَقَصَ: تَحَرَّك على إيقاع موسيقى/ هەل پەری، سەمای کرد، سوری دا.
- فرحاً أو طرباً/ له خۆشیا پێی نەئەکەوتە زەوی، هەلئەپەری.
رَقَّصَ. لرْقَصَ: حمله على الرقص/ هێنایە سەما، هەلی پەران.
راقَصَ. رَاقَصَ مع/ لە گەلی سەمای کرد، چوە دەستیەوە، لە شانیەوە هەل پەری.
تَرَقَّصَ: تَذَبذَبَ. إرتفع و إنخفض بسرعة/ لەریەوە، قونەقونی کرد، هەل پەری، هەل قونی.
رَقْص/ سەما، هەل پەرین، سوردان، هەل پەرکێ.
ابو الـ - : قرلی. طائر مائي/ ماسی گرە.
قاعَة الـ - / مۆلی سەما، مۆلی هەل پەرین.
رَقّاص: الذي يَرقُص/ هەل پەرکێ کەر، سەماکەر، سوردەر.
- السّاعَة/ بەندۆل، پانتۆل.
مَرقص / شوێنی سەما و هەل پەرین، سورگە.
رقط:
رَقَطَ: رَقَّشَ/ پەلاوی کرد، خال خالێ کرد، پەلەپەلەی کرد.
ارْقَط: مُنَقَّط/ خالاوی، خال خال، بەلەك، کونج، رەش و سپی.
- . نمر ارقط/ جۆرێکی پلنگی پێست خالاویە.
رقع:
رَقَعَ. رَقَّعَ. خَرَق: اصْلَحَ بالرِقاع/ پینەی کرد.
- : ضَرَبَ/ لێی دا.
- الباب: طرقه بقُوَّة/ توند لە دەرگای دا.
رَقُعَ الرجل: حَمُقَ/ بێ ئابرویی کرد، کەرێتی نواند.
رُقْعَة: مايُرقع به/ پینە.
- الداما و الشطرنج/ تەختەی دامەو شەترەنج.
- أرض: قطعه منها/ پەلە زەوی.

خط - / نوسینی روقعە.
مُرَقَّع/ پینەکراو، پیناوی.
ترقيع/ پینەکردن.
رقيع: قليل الحياء/ بێ ئابرو.
- : احمق/ کەر، گەوج، هەرزە.
رَقاعَة: قِلّة حياء/ بێ ئابرویی، کەرێتی.
رقم:
رَقَمَ: كَتَبَ/ نوسی.
- : رَقَّمَ الكِتاب: بَيَّنَهُ بوضع النقط و الحركات/ سەروبۆری بۆ کرد.
- . - الحِصان: كَواهُ و وسمه/ داخی کرد.
رَقْم: عَدَد/ ژمارە، رەنوس، خال بەند.
- قياسي/ پلەی هەرەبەرز، بەرزترین پلە، شا پلە.
رقيم: كِتاب/ نامە، نوسراو، پەراو.
مِرقَم: آلة رَقم الاعداد/ ژمارەنوس.
- : قَلَم/ پێنوس، خامە.
ترقيم / ژمارەدانان، ژمارە لەسەر دانان، نیشان کرد، رەنوس کردن، خال بەندی، خال بەندکردن.
رقن:
رَقَنَ. رَقَّنَ. ارْقَنَ: خَضَّبَت بالحنّاء/ خەنەی تێ گرت.
- . - الكِتابَ: زَيَّنَهُ و حَسَّنَهُ/ جوانی کرد، رازاندیەوە.
- . - الكِتابَ: قارَب بين سطوره/ وردنوسی، پرنوسی، دێری بەجێ نەهێشت.
- قَيَّدَه: مَسَحَهُ/ ناوی کوژاندەوە.
رِقان. رَقون. إرقان: حِنّاء/ خەنە.
ترقين. ترقين قَيد/ ناوکوژاندنەوە، سرینەوە.
رقي:
رَقِيَ. إرْتَقى. تَرَقّى: صَعَدَ/ سەرکەوت، هەل زنا.
- . - . - : تَقَدَّم/ پێش کەوت، بەرزبوەوە.
رَقّى: قَدَّم و رَفَعَ/ بەرزی کردەوە، سەری خست، پێشی خست.
- : حَسَّنَ و اصلح/ چاکی کرد، باشی کرد.
- : هَذَّبَ/ تەمێی کرد، رەوشت و خوی باش کرد.
- : إستعمل الرُقيَة/ جادو تەلیسمی بەکارهێنا، نوشتەی کرد.
- : طرد الارواح الشريرة/ نوشتەی بەکارهێنا.

رُقّي: تَقَدّم/ پێش کەوتن، سەرکەوتن.
إرتقاء: صعود/ سەرکەوتن، بەرزبونەوە.
– : تَرَقّي: تقدم. نجاح/ سەرکەوتن، پێش کەوتن، بەرزبونەوە.
تَرقِيَة: ترفيع/ بەرزکردنەوە، پێش خستن.
مِرقاة: سُلَّم/ پەیژە، ئەردەوان.
راقٍ: عالٍ. سام/ بالا، بەرز، مەزن، شکودار، زۆرچاك.
– : مُرتَقٍ: مُهذَّب/ پەروەردە کراو، پێش کەوتوو.
– . رَقّاءٌ: الذي يَرقي/ جادوگەر.
رُقيَة: تعويذه/ جادو، نوشتە.
ترقوة: لوح الكتف/ دەفەی شان.
رُقّي/ شوتی.
رك:
رَكَّ: ضَعُفَ و رَقَّ/ لاواز بو، بێ‌هێز بو، تەنك بو.
– الرجل: قَلّ عقله او علمه/ بێ ئەقڵ بو، هەمو شتی بیرچووەوە.
– الامرَ في عُنقه: الزمه إيّاه/ خستیە ئەستۆی.
– الشيءَ: طرح بعضه على بعض/ دای بەسەریەکدا.
رَكيك. رُكاك: غير قوي. ضَعيف/ لاواز، بێ هێز، زەبون، لەق، ناقایم.
– : ضعيف في رأيه او عقله/ کەم ئەقڵ، نەفام.
كلام – : سخيف الالفاظ و المعاني/ قسەی قۆڕ، بێ‌جێ، ناتەواو.
نسيج – : ضعيف و رقيق/ عەمارەپۆ.
رَكاكە. رُكاكة/ لاوازی، بێ هێزی، لەقی، ناقایمی.
رَكّة: مايُرصف من الحجارة بعضها فوق بعض/ وشکەکەڵەك.
ركب:
رَكِبَ الدابَّةَ و على الدابّة: عَلاها. إمتطى/ سواربو.
– السفينةَ: سافر عليها/ بە کەشتی رۆی، سواری کەشتی بو.
– الطريقَ: مشى عليها/ بەرێگا رۆیشت.
– اثره: تبعه/ شوێنی کەوت، شوێن پێی هەڵ گرت.
– البَحْر: سافر فيه/ بەرێی دەریادا رۆیی.
– الهواء: طار/ فڕی.
– راسه: مضى على وجهه بِغيرِ رَوِيَّة/ سەری خۆی هەڵ گرت.
– هواه: إنقاد له/ شوێن خەیاڵ و ئارەزوی خۆی کەوت.
– الاهوال: القى نفسه فيه/ خۆی خستە مەترسیەوە.
– هُ الدين: صار مَديوناً/ قەرزار بو، وام دارکەوت.
– وارتكب الذنب: اقترفه/ تاوانی کرد.
– و – الفحشاء. عمله/ گوناهی کرد، خراپەی کرد.
رَكَّبَ. أركب: جعله يركب/ سواری کرد.
– : ضد فَكَّكَ. وضع بعضه على بعض/ بەستیەوە، خستیەوە جێی خۆی، چاکی کردەوە، کۆی کردەوە.
– الفَصّ في الخاتم/ نقێمی تێ خست.
– الداء: حَضَرَها/ گرتیەوە.
إرْتَكَبَ الأمر: إقتَحَمَهُ. إفتحمه/ کردی.
تَرَكَّبَ من كذا: اشتمل على/ پێك هاتوە لە.
راكِب: خلاف الماشي/ سوار.
– : مُسافِر/ گەشتیار، رەوتەنی.
ركوب: إمتطاء/ سواربون.
مَركُوب: مُمتطى/ سوارکراو، سوار لەسەر.
– : حذاء/ پێڵاو.
مَركِب: سفينة/ کەشتی.
– شراعي/ کەشتی چارۆکەدار.
مَركَبَة: عَرَبَة/ گالیسکە، ئوتومبیلی کرێ، گەڕێن.
– الجليد/ خلیسکە.
مَركبات: عجلات مختلفة الاشكال/ سوارگە.
رُكْبَة: ما بين الفخذ و الساق/ ئەژنۆ، چۆك.
باطن الـ – / رەفیسك.
رَكب. رُكبان: قافلَة/ کاروان.
رَكّاب الخيل/ سوار، ئەسپ سوار.
رِكاب السَرج/ ئاوزەنگی.
العظم الركابي: من عظام الأذن/ ئێسکی گوێ.
تركيب: بناء/ دروست کردن، پێك هێنان، سازکردن، گرتنەوە، لێك دان.
إرتكاب: اقتحام. إقتراف/ کردن، وەشاندنەوە، تاوان و گوناه کردن، خراپە کردن.
مُرْتَكِب: مُقْتَرِف/ تاوان کەر، گوناه کار.
مُرَكَّبٌ: ضد بسيط/ ئاوێتە.
– من كذا/ پێك هاتوە لە.
– على كذا/ لە سەری دانراو، لە سەر دامەزراو.

– النقص: شعور بالحطّة/ خۆکەمی.
ربح – / دەسکەوتی ئاوێتە.
عدد – / ژمارەی ئاوێتە.
کسر – / کەرتی ئاوێتە.
رُکبَة: ما بين الفخذ و الساق/ ئەژنۆ.
ابو – : کرنب لفتی/ شێلم.
رکد:
رَکَدَ: سَکَنَ/ وەستا، ئارامی گرت.
– الميزانَ: إستوى/ رێك وەستا، تەرازووەکە رێك وەستا.
– العَکْر و الثُفل: انحدر الى اسفل الأناء/ نیشت.
رُکود: سکون الحرکة/ وەستان، راوەستان، کزبون.
راکِد: ساکن الحرکة/ وەستاو، راوەستاو.
رکز:
رَکَزَ. رَکُزَ: غَرزَ في الارض/ چەقانی.
– . إرتکز: وقف قليلاً/ تاوێك وەستا، هەڵ وێستەیەکی بۆ کرد.
– . – على: إستند/ پاڵی دایە سەر، خۆی دا بەسەر.
– . – : استقر/ وەستا، لەجێی خۆی وەستا، چەقی.
تَمرکز في المکان: إتخذها مرکزاً/ دای کوتا، کردی بە بنکە.
رُکزة. وقفه قصيرة/ تاوێك وەستان، چوکڵە، وێرگول.
رکيزة. مرتکز/ پشتگیری، پاڵ پشت.
– . دعامَة/ کوڵەکە، راگرە، نیرگە.
رکائز: اعمدة/ ستون، کوڵەکە، نیرگە.
مرکز. محور. وسط الدائرة/ چەق.
– الثقل/ چەقی قورسایی.
– الجذب/ چەقی کێش.
– : منزلة. مقام/ پایە، بنە.
– : موضع/ شوێن، هەڵ وێست، جەرگە.
– الادارة/ بنکە.
مرکزی / ناوەندی.
لا – / ناناوەندی، ناوەند بەدەر.
القوة المرکزية الجاذبة/ هێزی ناوەندی کێش.
القوة المرکزية الطاردة/ هێزی ناوەندی فڕێدەر.

مُرَکز/ خەست، تونگ، توند، توندو تۆڵ.
ترکیز/ توندی، پەیت، خەست کردن، چەقاندن.
إرتکاز/ داکوتان، چەقاندن، راگرتن، پاڵ دانەوە.
مُرتکز/ راگرە.
رکض:
رَکَضَ: عَدا/ رای کرد، دایە غار.
– الفَرَسَ برجله: إستَحَثَّهُ/ ئاوزەنگی لێدا، تێوەی ژەند.
– ـه دفعه/ پاڵی پێوەنا.
– الارضَ: ضربها برجله/ پێیدا بەزەویدا.
– الطائر بجناحيه: حرکها مُسرعاً/ باڵی راوەشان.
– منه: هَرَبَ مُسرِعاً/ بۆی دەرچو، خۆی دەرباز کرد، لێی رایکرد.
راکَضَ: باری في الرکض/ راکردنی کرد.
إرتکض: تحرك و إضطرب/ جولا بە شپرزەیی، شپرزەبو.
– الجنين في البطن: تحرك/ کۆرپەلە جولا لە سکی دایکیا.
رَکْض: عدو/ راکردن، دەو.
رَکّاض. رَکوض: عَدّاء/ راکەر.
إرتکاض الجنين في البطن/ جولانی کۆرپە لە سکی دایکیا.
رَکوض: سريع/ خێرا، بەگوڕ.
رکع:
رَکَعَ. إنحنى إحتراماً/ چەمایەوە، کرنوشی برد، نوشتایەوە.
رَکَّعَ. ارْکَعَ: جَعَلَهُ يَرکَعُ/ چەمانیەوە، کرنوشی پێ برد، سەری پێ شۆڕکرد.
راکع: کل شيء يخفض راسه/ چەماو، سەرشۆڕ.
رُکوع: جَثو/ کرنوش بردن، چەمانەوە، دانەوینەوە، نوشتانەوە، چۆك دادان.
رَکعَة: المرَّة من رکع/ چەمانەوەیەك.
رکل:
رَکَلَ: ضَرَبَ برجل واحدة/ تێێ هەڵ دا، لەقەی لێدا.
– الفرسَ: ضربه بالرجل ليعدو/ تێوەی ژەند.
رَکْلَة: لبطة/ لەقە، شەق.
رَکَل: کُرّاث/ کەوەر.

رَكّال: بائع الكراث/ كەوەر فرۆش.

ركم:

رَكَمَ: جمع و كَوَّمَ/ كۆی كردەوە، كەڵەكەی كرد، كۆمـەڵی كرد.

تـراكَمَ. إرْتَكَـمَ: إجْتَمَـعَ بكثـرة وا زدحـام/ كەڵەكـەبو، كۆمەڵ بو، نیشتە سەریەك.

رُكام. رَكم. مُتراكم: مُكَوَّم/ كەڵەكە، كۆمەڵ.

رُكْمَة: كوم/ كۆمەڵ، تۆپەڵ.

– من الطين/ پێ خوێ، پێ خوێ یەك قوڕ.

تراكم/ كەڵەكەبون، كۆمەڵ بون، نیشتنە سەریەك.

مِركَم كهربائی: جهاز خزن الطاقة الكهربائية/ ئـامێری كارەبا پەسیسەكردن.

ركن:

رَكَنَ و لِرَكَنَ اليه: وَثق به و إستامنه/ بـڕوای پـێ كرد، باوەڕی پێ كرد، لێی دڵنیابو.

– و – اليـه عَـوَّلَ او إعتمـد عليـه/ پـشتی پـێ بەست.

لِرْكَنَ الى الفِرار: هَرَب. فَرَّ/ رای كرد، بۆی دەرچو.

– و ارتكن على: مال. إستـنـد/ پـاڵی دایـەوە، خـۆی دایە سەر.

– و – على: لجأ الى/ پەنای بردە بەر.

يُرْكَن اليه : يُعَوَّل عليـه/ باوەڕی پێ ئەكرێ، پـشتی پـێ ئەبەسترێ.

رُكن: زاوِيَة. ظِلْر/ گۆشە، قوژبن، پەنا، سوچ.

– : سَنَد. مايقوی به/ پشتگیر، پاڵ پشت، كۆڵەكە.

– من الشيء: جزء منه/ بەش.

– : دراسة عسكرية عليا/ پلەیەكی بەرزی ئەفسەری، روكن.

رُكون. إركان: وثوق/ باوەڕ پێ كردن، پشت پێ بەستن.

لِركان حرب: جماعَة القواد/ كارگێڕی سەربازی.

ركين: ثابت/ جێگیر، قایم.

– : رَزين. وَقور/ قورس، ئاغز، هێمن، لەسەرخۆ.

مِركن: طشت الغسيل/ سوێنە، تەشت.

ركيك (فی رك) رماد (فی رمد) رمان (فی رمن)

رم:

رَمَ. رَمَّمَ: اصلح/ چاكی كردەوە، دەستكاری كرد.

– . لِرَمّ العَظْمُ: بَلیَ/ پوا، رزی (ئێسقان).

تَرَمَّمَ: تم اصلاحه/ چاك كرایەوە.

– العظمَ: نزع ما عليه من اللحم/ گۆشتەكەی داماڵی.

رَمٌ. ترميم. مَرَمَّة: إصلاح/ چاك كردنەوە، تازەكردنەوە، دەست كاری كردن.

رِمّة. رُمَّة: قطعة بالية من العظام/ ئیسقانی پواو، رزیو.

– . – : جيفَة/ كەلاك، لاك، لاشە.

بِرُمَّتـه: بجملتـه/ هـەموی، بـە تـەواوی، سـەراپا، تێكڕا، رەبەق.

رَميم. رُمام: بالٍ/ پواو، رزیو.

رمث:

رَمَثَ: اصلح/ چاكی كردەوە.

رَمَث: طَوف/ كەڵەك، مور.

– . رُمْثَة: بَقِيَّة اللبن فی الضرع/ ئـەو شـیرەی لـەناو گوانا ئەمێنێتەوە.

رمح:

رَمَحَ: طعن بالرُمح/ رمی وەشان، رمی پیاكرد، بـەر رمـی دا.

– : عَدا. ركض/ رای كرد.

رُمح: عود طويل في راسه حَرْبَة/ رم، نێزە.

رماح: صانع الرُمح/ رم دروستكەر.

– : حامل الرُمح/ رم هەڵ گر.

رمد:

رَمِدَ. لِرْمدَ الرَجُل: هاجت عينـه/ چـاوی دامـات، گلـی كرد.

رَمِدَت. إرمَدَّت العَيْنُ: هاجت/ چـاوداهات، گلـی كـرد، هاتە ئێش، ژانی كرد.

رَمَّـد الـشيءَ: و ضـعه فـی الرمـاد/ كـردی بـەژێر خۆڵەمێشەوە.

– النار: غَطّاها بالرماد/ بەخۆڵەمێش دای پۆشی.

– الجُثَّة: أحرقها/ سوتانی.

رَمَدُ العين: هيجان العين/ چاوئێشە، گل كـردن، چـاو داماتن، وەردێنە، بۆخۆیی.

رماد: تُراب النار/ خۆڵەمێش، سوتو.

– حار/ ژیلەمۆ.

ماء الـ – / خۆلاو، خۆڵەمێشاو.

رمادی: بلون الرماد/ خۆڵەمێشی، بۆر.

مُرَمَّد: الشوّاء فی الجمر/ پیشاو.

رمز:
رمَزَ الى: اشار و أومأ/ ئامـاژی کـرد، هێمـای بـۆ کـرد، دەست نیشانی کرد.
– : کنّی/ هێمای کرد.
رَمْز. رُمز. رَمَز: إشارة/ نیشانە، نیشان، هێما، دروشم.
– : کِنایَة/ هێما، تروپ.
رَمزی: کِنائی/ هێمائی، نیشان کاری.
راموز: نموذج/ نمونە.
رمس:
رَمَسَ. لرْمَسَ: دَفَنَ/ ناشتی.
– الخبرَ: کَتَمَهُ/ شاردیەوە.
إرْتَمَسَ فی الماء: إنْغَمَسَ/ نقوم بو.
رَمْس. رامُوس: قَبْر/ گۆڕ، گلکۆ.
رمش:
رَمَشَ: تناول الشیء باطراف الاصابع/ بەسەری پەنجە هەڵی گرت.
– ـه بیده: لَمَسَهُ/ دەستی لێ خست، دەستی پیاهێنا.
– العینُ: رَفَّت/ چاوتروکا، چاوفڕی.
رَمَشٌ: التهاب الجِفن/ پێڵو هەوکردن، چاوئاوکردن، هەو کردنی پێڵو، سوتەمەرۆیی.
رَمْشُ العین: جِفْنُها/ پێڵو.
رِمش: هُدْب العین/ برژانگ.
مِرماش: من یُحَرِّك عینه کثیراً/ چاوچەقەنە، چاوزۆر ئەتروکێنێ.
رمص:
رَمِصَت عَیْنُهُ: سال منها الرَمَص/ چاوی ریپۆقی کرد.
رَمَص: عُماص. وسخ ابیض فی مجری الدمع/ ریپۆق.
رمض:
رَمَضَ. رَمَّضَ. ارْمَضَ الغنم. رعاها فی الرمضاء/ بە گەرما لەوەڕانی.
رَمضاء: شِدَّة الحَرّ/ قرچەی گەرما.
رَمضان/ مانگی نۆیەمی کۆچی دوای شەعبان و پێش شەوال، مانگی (رەمەزان، رۆژو).
رمق:
رَمَقَ: لحظ لحظاً خفیفاً/ چاوێکی پیاخشان، سەیرێکی کرد.
– : لاحَظَ/ سەیری کرد، تەماشای کرد.
– . رَمَّقَ الیه: اطال النظر/ چاوی تێ بڕی.
رامَقَهُ: تَتَبَّعَهُ بنظره و راقبَهُ/ چاوی لێ نەتروکان.
إرْمَقَّ الشیءُ: ضَعُفَ/ لاواز بو.
– الرجل: هلك هزالاً/ بە لاوازی مرد، توایەوە.
رَمَّقَ. رامَقَ العملَ: عمله ولم یتقنه/ ئیشەکەی بە قەڵبی و ناشیانە کرد.
رِماق: النظر شزراً. نَظَر العَداوَة/ چاو (زیت کردنەوە، مۆڕکردنەوە).
یرموق: ضعیف النظر/ چاوکز.
رَمَق: بَقِیَّة الحیاة/ ئەو ژیانەی کە ماوە.
– من العیش: القلیل یمسك الرمق/ ژیانی مەمرەو مەژی.
الرَمَق الأخیر/ سەرەمەرگ، گیانەڵان.
علی آخر رَمَق من الحیاة/ گیان ئەدا، لەگیانەڵادایە.
سَدَّ رَمَقَ الجائع: اطعمه و انقذه من الموت/ خواردنی دایەو لە مردن رزگاری کرد.
عَیش رَمِق و رِماق: ضَیِّق/ کولەمەرگی.
رَجُلٌ رُمَّق: ضعیف/ لاواز.
رامِق. رَموق: فقیر/ هەژار.
رمل:
رَمَّلَ: رَشَّ علیه الرمل/ خۆڵێ پێوەکرد.
لرْمَلَ. تَرَمَّلَ الرجل: ماتت زوجته/ بێوە پیاو کەوت، ژنەکەی مرد.
– ت . – ت المراة: مات عنها زوجها/ بێوەژن کەوت، مێردەکەی مرد.
رَمْل/ لم، خۆڵ، ریخ، ریك، قوم.
– اسود/ ریخە شینکە.
رَمْلی. مُرْمِل: کثیر الرمل/ لماوی، لمین، ریخەڵان، ریکەڵان، قومین.
رَمّال: بائع الرمل/ لم فرۆش.
لرْمَل: أیِّم: ماتت زوجته/ بێوەپیاو، ژن مردو.
– . ارمَلَة: أیِّم. مات عنها زوجها/ بێوەژن، مێرد مردو.
تَرَمُّل الزوجة: اَیْوَمَة/ بێوەژن کەوتن، پیاومردن، بێوەژن کوشی.
رمن:
رُمّان: شجر و ثمر/ هەنار.

زهر الـ – / گولنار، گوڵ هەنار.

رُمَّانَة: قَذيفَة تُلقى باليد/ نارنجۆك.

رمى:

رَمى الشيءَ او بالشيءَ: القى، طَرَحَ/ فڕێی دا، هەڵیدا، توڕی هەڵ دا.

– : نَبَذَ/ نەی ویست، ئافەرۆزی کرد.

– القذيفَةَ/ تەقانی، هاویشتی.

– بكلامه الى كذا/ قسەی تێ گرت، توانجی تێ گرت.

– بينهم: القى الشِقاق/ دوبەرەکی و ناکوکی تێ خستن، بە شەڕی دان، کردنی بەگژ یەکدا.

– عنه: نَفَضَ/ تەکانی.

رَماهُ بكذا: إتهمه به/ تاوان باری کرد، گوناهباری کرد.

– بكذا: عابَهُ به/ توانجی تێ گرت.

إرتمى على الارض: طَرَحَ نفسه ارضاً/ خۆی دا بە زەویدا.

– على قدمي فلان/ خۆی دا بەسەر پێیدا.

رَمية: طَرْحَة/ هەڵ دان، فڕێدان، هاویشتن، توڕهەڵ دان.

رام: ماهِر في الرِماية/ دەست راست، نیشانەچی.

مَرْمى: مكان الرَمي/ شوێن نیشانە نانەوە.

– : مَدى الرمي/ بوار، ماوە.

– النظر: مَدى البصر/ ئەوەندەی چاو بڕکا.

– : قصد. غرض: هَدَف/ ئامانج، مەبەست، گوڵ.

رِمايَة: تصويب/ نیشانە نانەوە.

رن:

رَنَّ: طَنَّ/ دەنگی دایەوە، زرنگایەوە.

رَنَّة. رنين: طنين/ دەنگ دانەوە، زایەڵە، زرنگانەوە، لەرینەوە.

رَنّان: طَنّان. داوٍ/ زرنگەدار، زایەڵەدار.

الشوكة الرَنّانَة/ زرنگە چەتاڵ.

رنب:

أرْنَب بيتي/ کەروێشك.

– بَرّي/ کەروێشکی کێوی.

أرْنَبَة الأنف. طرف الأنف/ سەری لوت.

رنح:

رَنَّحَ: اضعف/ لاوازی کرد.

– : امال/ لاری کردەوە، چەمانیەوە.

تَرَنَّحَ: تمايَل/ بەم لاولادا کەوت، لەریەوە.

– و إرتَنَحَ: تمايل من السكر/ لەتری ئەدا، پاڵ پای ئەکرد.

مُتَرَنِّح: مُتمايل/ بەم لاولادا ئەکەوێ، لارولارو ئەکا، لەتر ئەدا، ئەلەرێتەوە، لەسەر شان بۆی ئەڕوات، پاڵ پائەکات.

مِرنَحَة السفينة: مَقْدمها/ لوتی کەشتی، پێشەکەی.

رنق:

رَنَقَ. تَرَنَّقَ الماءُ: كَدَرَ/ لێڵ بو، لیخن بو.

رَنَّقَ. أرْنَقَ الماءَ: كَدَّرَهُ/ لێڵی کرد، لیخنی کرد.

– الماءَ: صفّاه/ رونی کردەوە.

– النظر اليه: أطاله/ چاوی تێ بڕی.

رَنَق: تُراب في الماء/ خۆڵی ناو ئاو، لیخن، لێڵی، خۆڵ لە ئاودا.

رَنْقَة ماء إختلط فيه الطين/ لێل ئاو، ئاوی لێڵ، قوڕاو.

رَونَق: الطلاوَة و الحُسْن و الاشراق/ باق و بریق، بریسك و هوڕ، شەوق.

رنم:

رَنَم. تَرَنَّمَ: غَنَّى/ گورانی وت، چریکانی، ویردی خوێند.

ترنيمه: اغنية. ترتيله/ گۆرانی، ویرد، سرودی ئاینی، سۆزکردن.

رنا:

رَنا. أرنى. تَرَنّى اليه و له: أدام النظر اليه/ چاوی تێ بڕی.

رَنَّى الحُسْنُ فلاناً: اعْجَبَهُ و حمله على الرُنو/ وای لێ کرد هەر سەیری بکا، چاوی لێ نەتروکێنێ.

رنا: مايُرنى اليه طويلاً لحسنه/ ئەمێنێ هەر سەیر بکرێ، چاوی لێ نەتروکێنرێ.

– : جمال/ جوانی.

رُنو: نَظَر. مُشاهَدَة/ سەیرکردن، چاوتێبڕین.

رهب:

رَهِبَ: خافَ/ ترسا، تۆقی.

أرْهَبَ. رَهَّبَ. إسترهب: خَوَّفَ/ ترسانی، تۆقانی.

تَرَهَّبَ: تَوَعَّدَ/ هەڕەشەی کرد.

– الرجل. تَرَهْبَنَ: صار راهِباً/ وازی لە دنیا هێنا، بو بە (قەشە، رەبەن) (پیاو).

– ت المرأة: صارت راهِبَةً/ وازی لە دنیا هێنا بو بە پەرستار (ئافرەت).

ر

رَهْبَة. رُهْبى. رَهباء. خَوْف/ ترس، مەترسی، تۆقین.
رَهیب: مخیف/ ترسێنەر، تۆقێنەر.
راهِب: خائف/ ترساو، تۆقیو، ئەترسێ.
– : ناسك. نـاذر العِفّة/ قەشـە، کەشـیش، زەوار، رەبەن، ئەوانەی واز لە دنیا ئەهێنن.
– ةَ نـاذرة العِفّة/ قەشـە ژن، ئـافرەتی رەبـەن، پەرستار.
رَهْبَنَــة. تَرَهُّــب. رَهبانِیَّــة: نُـسك/ پۆســت نـشین، خواپەرستی، رەبەن گەری.
إرهاب: تخویف. فزع/ مەترسی، تۆقانـدن، زۆرو سـتەم، ترساندن، تەریەگەری.
إرهـابی: تهدیـدی/ تیرۆریـست، ترسێنەر- مەرەشـەکەر، بەلەسە، تەریە
الحکم الا – : الحکم المعتمد علی الارهـاب و العنـف/ دەسەلات داری بە مەترسی و زۆرو ستەمەوە.
رهج:
رَهِج. لَرْهَجَ: اثار الغُبار/ کردی بە تەپ و تۆز.
– بیـن القـوم: هَـیَّجَ بعضهم علـی بعـض/ ئـاژاوەی نایەوە، ئاشوبی گێرا، کردنی بەگژ یەکدا.
رَهَجْ. رَهَج: غُبار/ تەپ و تۆز.
– : فِتْنَة/ ئاژاوە، ئاشوب.
رهد:
رَهْدَنَ: اِبطأ/ کەمتەرخەمی کرد.
رَهْدَن. رُهْدَن. رِهْدَن: جَبان/ ترسنۆك، کەلۆر.
– . – . – : احمق/ گێل، کەمژە.
رَهدون: کَذّاب/ درۆزن.
رهص:
رَهَصَ: عثر. تَعَثَّرَ/ هەڵ نونا، هەڵەنگوت.
رَهَص. رَهصة/ عَثْر/ هەڵ نوتان، هەڵەنگوتن، نوچ (دان، بردن).
رهط:
رَهَط اللُقْمَة: اکلها عظیمَة/ پاروی زل گلان.
إرتَهَطَ القوم: إجتمعوا/ کۆبونەوە.
رَهْط. رَهَط. جماعَة/ کۆمەڵ، پۆل، رەوە.
– . – :نطاق البکارَة/ کچێنی، بنی کچ.
رهف:
رَهَفَ. لَرْهَفَ: رَقَّقَ/ تەنکی کردەوە.
– . – السیفَ: رَقَّقَ حَدَّه/ تیژی کردەوە.
لَرْهَفَ اذنیه: نصبها للاستماع/ گوێی شل کرد.
رَهُفَ: رَقَّ/ تەنك بو.
رَهیف: رَقیق/ تەنك.
– : نحیل/ لاواز، باریکەلە.
– . مُرهَف: مُحَدَّد/ تیژ.
رهق:
رَهَقَ. لَرْهَقَ: ظَلَمَ و فَعَل القبائح/ زۆرداری کرد، کـاری نابەجێ و ناشیرنی کرد.
لَرْهَقَهُ: حَمَلَـهُ علـی مـالا یطیـق/ بـاری گـران کـرد، کەشەنگی کرد.
– ظلماً: الحقه به/ سزای پێگەیاند، سزای دا، زۆری لێ کرد.
– إثماً: حَمَّلَهُ إیّاه/ گوناهی دایە پاڵ.
راهَقَ الغلام: قارب الحلم ای بلغ حَدَّ الرجال/ کـاتی شـەیتانی بـونێتی، بـو بـە هـەرزەکار، چـوە تەمـەنی هەرزەکاریەوە.
رَهَق: الاثم و التهمة/ گوناه و تاوان.
– : حَمْل المرء علی مالا یطیق/ بارگران کردن، ماندو کردن.
مُرهَـق: مُـضیَّق علیـه/ بـارگران، کەشـەنگ، شـەکەت، میلاك.
مُراهِق: بالغ حَدَّ الرجال/ هەرزەکار.
مُراهَقَة: بلوغ سِنّ الرجال/ هەرزەکاری.
إرهاق/ شەکەتی، خۆماندوکردن، ماندویەتی.
رهل:
رَهِلَ. تَرَهَّلَ: إسترخی/ خاویوەوە، لەشی خاویوەوە.
رَهِلْ. مُتَرَهِّل: رَخو/ خاو.
– . – : مَـن کـان هَـشّ اللحـم/ گۆشـت شـل، پێچەوانەی تونگ و تۆڵ.
رهم:
لَرْهَمَت السماء: أَتَتْ بالرهْمَة/ بـارانێکی وردو لەسەرخۆ باری، کەوەری باری.
رِهْمَة: المطـر الخفیـف الـدائم/ بـارانی وردو لەسـەرخۆ، کەوەری.
مَرْهَم: مایُطلی به الجُرح/ مەڵحەم.
رهن:

رَهَنَ: دام و ثبت/ بەردەوام و جێگیر بو.
– بالمكان: اقام/ تیا مایەوەو گوزەرانی کرد.
– . ارْهَنَ المنقولات: أودعها كرهن/ بارمتەی کرد، رەهنی کرد.
– عقاراً/ خستیە رەهنەوە، بارمتەی کرد (خانو).
ارْهَنَ فلاناً: أسْلَفَهُ/ قەرزی دایە.
– الشيءَ: جعَلَهُ رَهْناً/ بە بارمتە دای نا.
إرْتَهَنَ الشيءَ: أخذَهُ رهناً/ بارمتەی لێ گل دایەوە.
– بالأمر: تقَيَّدَ/ دەست بەستەبو، بەستراوەبو.
راهَنَ: سابَقَ. خاطَرَ/ گرەوی کرد، مەرجی کرد.
إستَرْهَنَ: طلب منه رهناً/ داوای بارمتەی لێ کرد.
رَهْن. رَهينه: مايوضع تاميناً للدين/ بارمتە، رەهن.
– إشارتە/ ئامادەو چاوەڕێی ئیشارەتێتی.
رِهان. رِهان: مُخاطَرة/ گرەو، مەرج.
رَهينٌ بأعماله: مأخوذ بها/ بەرپرسیاری کردارێتی.
– . مَرهون. مُرْتَهَن/ رەهن کراو، لە رەهنایە.
راهِن: ثابت. دائم/ جێگیر، بەردەوام، هەمیشەیی.
– : مُودِّع الرهن/ بارمتەی داناوە، بارمتەدانەر.
– : حاضر. واقع/ ئەم کاتە، ئێستا، ئارا، ئەوەی هەیە.
الحالة الراهِنَة/ دۆخی ئێستا، ئەوەی هەیە، ئەم جۆرە.
مُرتَهَن: آخذ الرهن/ بارمتە وەرگر، ئەوەی رەهن کاری ئەکا.
– بالأمر: مقيد به/ بەستراو، پێوەبەستراو.
رها:
رَها. ارْهِي على نَفْسه: ارفق بها/ بە تەنگ خۆیەوە هات.
– الحصانُ: سار خفيفاً/ لەسەرخۆ رۆیی.
رَهو: السير السهل/ رەوت و رۆینی لەسەرخۆ.
– ورَهْوَة: المكان المنخفض/ نزمان.
– و – : المكان المرتفع/ بەرزی.
راهي من العيش: الطيب الساكن/ خۆش گوزەرانی، ژیانی بێ دەنگی.
رَهاء من المكان: واسع/ فراوان.
رَوَأ:
رَوَأَ في الأمر: نظر في الأمر و تَفَكرَ في عواقبه/ بیری لێ کردەوە، لێی کوڵیەوە، پاشەڕۆژی لێك دایەوە.
رَويئة: رَوِيَّة: التفكر و النظر في الأمر/ بیر لێکردنەوە، لێکۆڵینەوە، بیر لە پاشەڕۆژ کردنەوە.
راب:
رابَ اللبنُ: خثُرَ/ مەیی، بزرکا.
– الرجُل: تَحَيَّرَ/ سەری سوڕما، سەرسام ما.
روَّب. اراب: خثَّرَ/ مەیانی، کردی بە ماست.
رَوْب: لَبَن رائب او حامض/ شیری مەییو، بزرکاو، ماست.
رائب. مُرَوَّب: مُخثَّر/ مەییو، بزرکاو.
رُوْبَة: قوام العيش/ گوزەران.
– . رَوْبَة: خميرة/ هەوێن.
اَرْوَب: حَيران/ سەرسوڕماو، سەرسام.
– : فاتر النفس/ لەش خاو، داهێزراو.
راث:
راث الحيوان: تَغَوَّط/ پیسایی کرد، تەرسی کرد.
رَوث: سرجين الفرس و كل ذي حافر/ تەرس، شیاکە، پشقل، ریخ.
راج:
راج الأمر: إنتشر/ بڵاوبوەوە.
– ت السلعة: نفقت/ فرۆشرا، نەما، برەوی سەند.
– ت السوق/ بازاڕ گەرم بو، بازاڕ لەبرەوا بو.
روَّج الأمر و الخبر/ بڵاوی کردەوە.
– السلعة: جعلها تُرَوَّج/ بازاڕ گەرمی بۆ کرد، برەوی پێدا.
– الشيءَ و به: شَجَّعَهُ و قَدَّمَهُ/ هانی دا، هەڵی دا، پێشی خست.
رائج: مطلوب/ داوای لە سەرە، ئەویستریێ، داواکاری هەیە.
– : متداول/ باو، لە ئارادایە.
رَواج: كثرة لطلب/ بازاڕگەرمی، برەوسەندن، برەو.
– : تداول/ دەستاو دەست.
تَرويج: تدويل/ بازاڕگەرمی کردن، هان دان، برەو پێدان.
مُرَوِّج: وسيط بين البائع و المشتري/ دەلاڵ.
– : مُثير. مُحَرِّك/ هان دەر.
راح:
راح: ذَهَبَ. مَضى/ رۆی، رۆیشت، چو، تێپەری.

ر

– للمعروف: أسرع الى فعله فرحاً/ چاكەی كرد، روی كرده چاكەو پیاوەتی.
إرتاح للأمر و اليه: فَرِح به/ بەدڵی بو، پێی خۆش بو، پێی قایل بو.
– . إستراح. وجَدَ الراحَة/ پشوی دا، حەوایەوە، وچانی دا.
رَوَّحَ. اراحَ. رَيَّحَ/ حەوانیەوە، پشوی پێدا.
– النفس أو القلب: انعشه/ دڵی خۆی خۆش كرد، حەوایەوە، سرەوتی بەخۆیدا.
– . تَرَوَّحَ بالمروَحَة: اخذ الريح بها/ باوەشێنی خۆی كرد.
– : ذَهَبَ الى بيته/ رۆیشتەوە، گەڕایەوە بۆ ماڵ.
راوَحَ بين عملين: إشتغل بهذا مَرَّة و بالثاني مَرَّة/ نۆرەی كرد.
– بين رجليه: قام على كل منها مَرَّة/ بە نۆرە لەسەر قاچی وەستا.
أرْوَحَ. تَرَوَّحَ الماءُ: إنْتَنَّ/ بۆنی كرد، بۆگەنی كرد (ئاو).
رَوِحَ: إتَّسَعَ/ فراوان بو.
رائح: ذاهب/ رۆیو، رۆیشتو.
رَواح: ذِهاب/ رۆیین، رۆیشتن، چون.
رِيح: هواء متحرك/ با.
– . رائِحَة/ بۆن.
فَوْقَ الـ – : مقابل/ بەرەبا، روەوبا.
تحت الـ – : مع الريح/ پشتەو با، لەگەڵ با.
طاحون الـ – / ئاشی با.
طارد الـ – / باكێش.
دَوّارَة الـ – : دليل إتجاه الريح/ بانیشان.
اخْرَجَ – ـاً/ بای لێ بوەوە، بای بەردایەوە.
رِياح: هَواء/ با.
– غربية: دَبُور/ شەماڵ، بای (ماشەڵان، خۆرنشین).
– جنوبية غربية/ بای وەشت.
– شرقية: صَبا/ بای خۆرهەڵات.
– موسمية/ بای وەرز، وەرزەبا.
– السموم: هَبوب/ بای سەبون.
– شمالية شرقية/ بای وەرز.
ابو –: فَزّاعَة/ داهۆڵ.
رَيِّح: شَديد الريح/ بای مەیە، باكەی قایمە.

مِرْوَحَة: مِهواة/ باوەشێن، باگێڕ.
– كهربائية/ پانكە.
– : مِنفَس: كُوَّة التَّهْوِيَة/ باكێش.
إراحَة: ترويح: ضد إتعاب/ پشودان، حەوانەوە، سرەوتن، سرەوت گرتن.
إرتياح: رِضى/ قایلی، بەدڵ بون، پێخۆشحاڵی.
مُريح: ضد متعب/ ئاسودەكەر.
مُرتاح. مُستريح: ضد تعبان/ پشوداو، حەواوە.
– . – البال: مطمئن/ بێ خەم، ئاسودە، دڵخۆش، سەرسوك.
رائِحَة. رِيحَة: شذا. عبير/ بۆن.
– . – ذَكِيَّة/ بۆنی خۆش.
– . – خبيثة/ بۆگەن، بۆنی ناخۆش.
ذكي الـ –/ بۆن خۆش، بێنی خۆش.
خبيث الـ – / بۆگەن.
رديءَ الـ –/ بۆن ناخۆش، بێن ناخۆش.
عديم الـ – / بێ بۆن، بێ بێن.
رَيحان: كل نبات طيب الرائحة/ بۆن خۆش، بێن خۆش.
– : نبات/ رێحانە.
– برى/ چەدەنە.
راحَة. رواح: نقيض التعب/ پشو، حەوانەوە، سرەوتن.
– اليد: باطنها/ بەری لەپ، بەری دەست، شەپ.
بالـ – : بسهولة/ بە ئاسانی.
بالـ – : على هَون/ لەسەرخۆ، بە ئەسپایی.
إستراحَة. راحَة: سكون/ پشو، حەوانەوە، وچان.
دار – / شوێن پشو، پشوگە.
أرْيَحي: واسع الخُلُق/ روخۆش، بەتاقەت، دڵ فراوان.
أرْيَحِيَّة: حُبّ الافعال الحميدة و بذل العطايا/ دڵ فراوانی، رۆخۆشی، پیاوچاكی.
تَراويح. تَرْوِيحه: جلوس/ دانیشتن بۆ پشودان.
– : صلاة التراويح/ نوێژەكانی پاش نوێژی خەوتنان لە رەمەزانا، تەراویح.
ترويح: تَهوِيَة/ باگۆڕین.
– القلب أو النفس: تَسلِيَة. لَهو/ دڵ خۆش كردن، رابواردن، خەم بە بادان.
– الحيوان/ تاقەت كردن.

مُستراح: بيت الخلاء/ ئاودەست.
رُوح: نَفس/ گیان.
– : خُلاصَة/ پوختە، کرۆك.
– شرير/ نەگریس، پیاوخراپ.
خفيف الـ – / سوکەڵە، روخۆش.
استحضار و مُخاطبَة الارواح/ جادوگەری.
روحی. روحانی: غیر مادی/ گیانی، گیان پەرست.
– . – : دینی/ ئاینی.
مَشروبات روحِيَّة/ مەستکەر، مەستەمەنی، مەی، بادە.
راح: خَمر/ مەی، بادە.
راد:
رادَ البلاد: طافَها/ پیاگەڕا، گەشتی کرد.
– الشيءَ: طلبه/ داوای کرد، ویستی.
– ت الريحُ: تحركت تحركاً خفيفاً/ کزەی هات، بایەکی هێواشی هات.
راوَد: خادع/ فێڵی کرد.
– المرأة: خادعها: طلب منها المنكر/ دەورو خولی دا، مەڵێ خەڵەتان، ویستی دەستی لەگەڵ تێکەڵ کا.
اراد: شاءَ/ ویستی، خواستی.
– : إختار/ هەڵی بژارد.
– : قَصَد/ مەبەستی بو، نیازی وابو، ویستی.
– أو لم يَرد/ بیەوێ و نەیەوێ.
أرْوَدَ في السير: تَمَهَّلَ/ لەسەرخۆ رۆی.
رائد: كَشّاف/ دیدەوان، گەڕیدە، گەڕۆك، گەشتەوان.
– : رُتْبَة عسكرية/ رائد. سێ (نەجمە، ئەستێرە)ی سەرشان.
– : جاسوس/ سیخوڕ.
– : دليل/ پێشەنگ.
– : يدة الرحى/ دەسکی دەستاڕ.
إرادة: مشيئة. إختيار/ ویستن، ئارەزو.
– : رَغبَة. مَرام/ نیاز، خواستن، پەروا، باك.
بحسب الـ – : كما يُريد/ بە ئارەزوی خۆی.
بحسب – الله. بمشيئة الله/ فرمانی خوایە.
إرادي: إختياري/ هەوەسی، بە ئارەزو، خۆویست، خوایشت، ڤیانی، ئارەزوکاری.
لا – / خۆنەویست.
مُراد: قصد. نِيَّة/ مەبەست، نیاز، خۆزگە، ئاواتەخواز.

مِروَد: مِحْوَر/ تەوەرە.
– : حَديدة تدور في اللجام/ ئاستی لغاو، کرۆکی لغاو.
– العين: ميل الكحل/ کلچێوك، میل.
رَود: المشي على مهل/ رۆین لەسەرخۆ، هێواش.
– : إستكشاف/ گەڕان، پشکنین.
ريح– ورائدة: لَيِّنَة الهبوب/ بایەکی هێواش و لەسەرخۆ، کزە.
رُوَيداً: مهلا/ لەسەرخۆ، بە ئەسپایی، بە هێواشی، وردە وردە.
أرْوَد: المتمهل في عمله/ ئیشکەری لەسەرخۆ، خاوخلیچك، تەوەزەل، تەمەڵ.
راز:
رازَ الحَجَرَ: وَزَنَهُ ليعرف ثقله/ هەڵی سەنگاند.
– الرجل: جَرَّبَهُ و خَبَرَهُ/ تاقی کردەوە.
راز: رئيس البنائين/ باش وەستا، وەستاباشی.
ريازة: حِرفَة الراز/ بەنایی.
راض:
راضَ. رَوَّضَ المُهرَ: ذَلَّلَهُ و عَلَّمَهُ السير/ جوانوەکەی رامێنا، جەڵدی کرد، فێرە سواری کرد، مەشقی پێ کرد.
– . – الحيوانَ: طَبَّعَهُ/ ماڵی کرد، هۆگری کرد.
راوَضَ: خاتَل/ فێڵی لێ کرد، خافڵی کرد.
تراوَضَ الرجلان في البيع و الشراء: تساوَما/ سەوایان کرد، رێك کەوتن.
إرتاض المهرُ: صار مَروضاً/ رامات، جەڵدکرا، فێرە سواری کرا.
تَرَيَّضَ: تَنَزَّهَ/ گەشتی کرد.
رائض. مُرَوِّض الخيل/ رامێنەر، جەڵدکار.
مُرَوَّض/ رامێنراو.
مُراوَضَة: مُداجَنة/ نەوازشت، رامێنان، ماڵێ کردن، هۆگر کردن، جەڵدکردن، هێنانە ژێر بار.
رياضَة: تمرين/ مەشق.
– روحِيَّة: تهذيب الاخلاق النفسية/ مەشقی دەرونی.
– . رياضيات: العلوم الرياضِيَّة/ بیرکار، ماتماتیك.
– : العاب الرياضَة. لعَب/ وەرزش.
رياضي: مختص بالعلوم الرياضِيَّة/ بیرکار زان.

– : يُحبُ الالعاب الرياضيّة/ وەرزشكار.
رَوْضـة. رَوْض: أرض مُخْضَرَّة/ سـەوزەلان، مێـرگ، هەرێز، شەكار.
– : حَديقة/ باخچە، گوڵستان.
– الاطفال: حِضانَة/ باخچەی ساوایان.

راع:
راعَ. إرتاع منه: فَزِعَ/ ترسا، لێی ترسا.
– . رَوَّعَ. أراع: أفْزَعَ/ ترسانی، تۆقانی.
– . – . – : هَزَّ المشاعرَ/ هەستی جولان.
– . – . – : اعْجَبَ/ دڵی كردەوە، بەدڵیا چو.
إرتاع للخبر: إرتاح اليه/ بەدڵی بو، پێی خۆش بو.
رائع. رَوِع: خائف/ ترساو.
– : مُعْجِب/ پەسەند، بەدڵ، ناوازە
رائِعَة النهار: مُعْظَمة/ درێژایی رۆژ، رۆژی نیوەڕۆ.
فی – النهار/ بە رۆژی نیوەڕۆ.
مُرَوَّع: مَن خامَرَهُ الخوف/ ترساو، ترس چۆتە دڵیەوە، تۆقیو.
مُريع: مُخيف/ ترسێنەر، تۆقێنەر.
رَوْع. رَوْعَة: مَسْحَة من الجمال/ جوانی، بەدڵا ئەچێ.
– . – : رَهْبَة. فزع/ ترس، سڵ لێ كردنەوە.
سَكَنَ – ـه : طَمَّنَ/ هێمنـی كـردەوە، هـێمن بـوەوە، هاتەوە سەرخۆی.
خَطَرَ بـ – ـه: بَدالَهُ/ هات بە بیریا.

راغ:
راغَ: حاد مكراً و خَديعَة/ رێگەی پێچ و پـەنای گرت، دەستی كرد بە فێڵ و فەرەج، لە رێی راست لایدا، كەوتـە دەست برین.
راوغ: خادع/ فێڵی كرد، پشی پشی بۆ كرد.
– فی الكلام: قال كلاماً يحتمل معنيين/ قسەی بە توێكڵ و پێچ و پەنای كرد، بە ئاین و تۆین دوا.
مُراوِغ. رَوّاغ: خَدّاع و مَكّار/ فێڵ باز، بە پێچ و پەنا.
مُراوَغة: مُماطله. تَحايل/ فێڵ، پشی پشی، پێچ و پەنا، دەلەسە، گێرمەوكێشە، فاك و فیك، فەنگ، ئاین و تۆین.

راق:
راقَ: صَفا/ رون بوەوە.
– ـه الأمْرُ: اعْجَبَهُ و سَرَّهُ/ بەدڵی بـو، پێـی خـۆش بـو، پەسەندی كرد.
– ـه الأمْرُ: صادف هوى فى نفسه/ چو بەدڵیا، حەزی لێ كرد، هەستی جولان.
روَّق: صَفّى/ رونی كردەوە.
– : رَشَّح/ پالاوتی.
– البضاعَة: صفّاها/ فرۆشتی، دەستی پێوە ناو ساخی كردەوە.
اراق: سكب/ رژانی.
– دَمَهُ: سفكه/ خوێنی رژان، كوشتی.
تَرَوَّق: اكل اكلة الصباح/ ژەمی بەیانی خوارد.
رَوق: الحب الخالص/ خۆشەویستی راستی.
– : صافٍ/ رون، رونی.
– . رواق. رُواق: سـقف فـی مقـدم البيـت/ هـەیوان، تارمە.
راووق. مُرَوِّق: مُصَفٍّ/ رون كەرەوە.
– : مُرَشِّح/ پاڵێوەر.
رائق: صافٍ/ رون، پاڵێوراو، زرنگ.
ترويقه: فطور. اكلة الصباح/ ژەمی بەیانی.
إراقة الدماء: سفك الدماء/ خوێن رشتن، كوشتن.

رول:
رَوَّلَ الخُبْزَةَ: دلكها بالسمن/ نانی لە رۆن هـەڵ كێشا، چەوری كرد، تێی هەڵسو.
– : سال رواله/ لیكی كرد، لیك بەدەمیا هاتە خوارێ.
رُوال: لُعاب/ لیك، تف.
مِرْوَل: كثير اللعاب/ لیكن.

رام:
رامَ: أراد. إبتغى/ ویستی.
رَوَّمَ: جعله يَروم/ وای لێ كرد كە بیەوێ.
رَوْم. مَرام: بُغية/ ویستن، داوا، خواستن.
– . – : قصد/ مەبەست، ئامانج.
رُوم: شحمة الاذن/ نەرمەگۆشتی گوێ.
بحـر ال –: بحـر الابـيض المتوسـط/ دەریـای سـپی ناوەڕاست.
رومی. دجاج رومی/ قەلەمون، عەلی شیش.

ران:
رَوَند. رِوَند. راوَند: نبات/ رێواس.

روی:
رَوى: قصَّ. حَكى/ گێرایەوە، وتی.

– : نَقَل و ذكر عَنه/ لێوەی گێڕایەوە.
– . لرُوِيَ: كَسَرَ العطش/ تینوێتی شکان، ئاوی خواردەوە.
رَوِيَ. إرتوى. تَرَوّىَ الحقل: سُقِيَ/ ئاودرا، ئاوی خواردەوە.
– . – الانسان و الحیوان: شرب الماء/ ئاوی خواردەوە.
تَرَوّى: تَفَكَّر/ بیری کردەوە، تێبینی کرد، راما، تێراما.
روايَة: خَبَر: إشاعَة/ هەواڵ، قاو.
– : قصَّة. حكايَة/ چیرۆك، راز، داستان، رۆمان.
– : بَيان/ رون کردنەوە، دەرخستن، دەربڕین.
– بوليسية/ چیرۆکی پۆلیسی.
– تمثيلية/ چیرۆکی شانۆیی.
– خيالية/ چیرۆکی هەڵ بەست، رۆمان.
– مُحْزِنَة. مأساة/ ناسۆر، تراجیدی.
– هَزْلية/ گاڵتە چیرۆك بۆ پێکەنین.
تَروٍّ. رَوِيَّة: تَفَكُّر/ بیرکردنەوە، تێبینی، تێبینین، رامان، تێرامان.
بـ – : بتَفَكُّر/ لەسەرخۆ، بەهێمنی.
راوٍ. راوِيَة: حاكٍ/ چیرۆك بێژ، داستان بێژ، دەنگ بێژ.
رواء: ماء عَذب/ ئاوی شیرین، ئاوی ساز.
رَيّ. إرواء: سَقي/ ئاودان، ئاودێری.
رَيّان. مُرْتَوي: ضِد عطشان/ ئاودراو، پاراو.
– : غَضّ/ تەڕ، پاراو، تەڕو پاراو، تەڕو بڕ.
رُواء: حُسْن المنظر/ بەدیمەن، دیمەن جوانی، رۆکەشی.
رِئَة. رِئَة/ سی.
أَروِيَة. إرْوِيَة: ضأْن الجبل/ مەڕەکێوی.
رؤيا (فی رای) رويداً (فی رود) رياء (فی رای)
رياضه (فی روض) رايه (فی ری) ريان (فی روی)
راب:
رابَ. أرابَ: اوقَعَهُ فی الريب/ خستیە گومانەوە.
لراب: صار ذا ريب/ گومانی کرد، کەوتە گومانەوە.
إرتاب من الشيء: شَكَّ فيه/ گومانی لێ کرد، دڵی لێ پیس کرد.
– : رای منه ما يُريب/ لێی سڵەمیەوە، لێی کەوتە مەترسیەوە.
رَيب. رِيبَة: إرتياب و شَكّ/ گومان.
بلا – : بلا شَكّ/ بێگومان، هەڵبەت.
لا – فيه/ هیچ گومانی تیا نیە.
مُرتاب. مُريب: شاكّ/ بەگومان، گومانی، بێباوەڕ، دڵ پیس.
– فی عقيدة: مُلْحِد/ بێئایین.
راث:
راثَ. تَرَيَّثَ: تَمَهَّلَ/ شێنەیی کرد، لەسەرخۆ بو.
– . – : ابطأ/ خاوە خاوی کرد.
رَيْث: مُهْلَة/ شێنەیی.
رَيْثما: وقتما. طالما/ لە کاتێکدا، هەتاکو، تاکو.
رَيِّث: بَطيء/ خاو، شێنەیی، لەسەرخۆ.
راش:
راشَ. تَرَيَّشَ: جَمَعَ المال و الأثاث/ پارەو شتی کۆکردەوە، بوبە خاوەن سامان.
– . – الطائر: نبت ريشه/ پەڕی دەرکرد، پەڕو باڵی کرد.
– . – السهمَ: لزق عليه الريش/ پەڕی (پیا داکوتا، پێوە نوسان).
رَجُل راشٍ: ذو مال/ ساماندار.
رَيّاش: فاخر/ نایاب.
ريش: كساء الطائر/ پەڕ.
– . رِيش. رِياش: مفروشات/ کەل و پەلی ناوماڵ، رخەر.
ريشه: واحِدَة الريش/ پەڕێك.
– الكتابة: قلم/ پێنوس، خامە.
– – : طرفه القلم المعدنی/ نوکی ئوچ، نوکی پاندان، نوك.
– المصور: فرشاة/ فلّچە.
– الجراح: مِشرط/ نەشتەر.
– الطاحونه/ پەرەکە.
– المروحَة/ پەروانە.
وزن الـ – / پەڕسەنگ.
ريشي: كالريش، مصنوع من الريش/ پەڕین، لەپەڕ.
رِيّاش: ماكان فاخراً من الأثاث و الثياب/ نایەب.
راع:
راعَ: نماوزاد/ گەورەبو، گەشەی کرد، روا، پەرەی سەند، زۆربو.

رَبَّع. تَرَبَّعَ القومُ: تجمعوا/ كۆبونەوە.
رَبْع: غَلّة. محصول/ بەرهەم.
– : حصيلة/ دەستكەوت، قازانج.
– . رَيعان: اوّل وَ أفْضَل/ تۆبەرە، سەرەتا، تاف، هەرەت.
رَيعان الشباب/ تافی لاوی، هەرەتی لاوی.
ارضٌ مَرْيَعَة: مُخصبَة/ بە پیت.
ريعَة: جماعَة مُنضَمَّة/ کۆمەڵی کۆك.
ريع: مكانٌ مُرتفع/ شوێنی بەرز، شوێنێکی بەرز.
راف:
رافَ: تَرَيَّفَ: اتی الريف/ چو بۆ (گوند، لادێ).
ريف: أرض فيها زرع/ زەوی بە کشتوکاڵ.
– : قريَة/ لادێ، گوند.
ريفى: قَرَوِى/ لادێیی، گوندنشین.
راق:
راقَ: لمع/ بریسکایەوە، درەوشایەوە.
– . اراق: صَبَّ/ رژانی، رۆژی کرد.
رَيق: ماء/ ئاو.
ريق: لعاب/ لیك، تف.
على الـ –: لم ياكل/ بە سکی برسی، خورێنی.
على الـ –: قبل الاكل صباحاً/ بە ناشتا.
بَلَعَ – هُ: إستراح/ حەوایەوە، پشوی دا، تفی قوت دا.
رال:
رال. رَيَّل: سال لُعابَة/ دەمی ئاوی کرد، لیك بە دەمیا هاتە خوارێ.
ريال. ريالَة. روالَة/ لیك.
مَريول: وِزرَة/ بەروانکە، پێش (دامێن، کۆش)، بەرکۆش.
رام:
رام. رَيَّمَ بالمكان: أقام/ نیشتەجێ بو.
– المكانَ و منه: زال عنه و فارقه/ بەجێێ هێشت، چۆڵی کرد، گواستیەوە.
رِئم. ريم: غزال ابيض/ ئاسکی سپی.
– : قبر/ گۆڕ.
– : جبل صغير/ شاخ یا چیای نزم، زورگ.
ريى:
ريَّىَ الرايَة: عملها/ ئاڵای دروست کرد، بەیاخی دروست کرد.
ارْيَى الرايَة: رفعها/ ئاڵای هەڵ کرد، بەیاخی هەڵ کرد.
راية: علم/ ئاڵا، بەیاخ.

**زاب. زاب: شرب شُرباً شديداً** بینی پێوەنا.

**زئبر: مایظهر من درز الثوب** تەقەڵ، درومان، تیك، تەریب، هەڵ پێچ.

**زئبق: فرّار/** جیوە.

**زئبقی: کالزئبق/** جیوەیی، وەك جیوە.

**زأر:**

**زأر: زمُجر/** نەڕانی.

**زئیر: زمجرة** نەڕە، نەڕەنەڕ.

**زأم:**

**زأم: مات سریعاً** (دەم و دەست، گورج، کوت و پڕ، یەکسەر، دەست بەجێ) مرد،

**موت زُؤام: سریع/** مردنی (کوت و پڕ، یەکسەر، دەست بەجێ).

**موت – : کریه** مردنی (ناخۆش، ناڕەوا).

**زأن:**

**زُؤان. زوان: نبات/** مرۆر، زریزانە، داڕوجان.

**زاج (فی زوج) زاح (فی زوح) زاد (فی زود) زاد (فی زید) زار (فی زور) زاغ (فی زیغ) زاف (فی زیف) زال (فی زول) زام (فی زوم) زان (فی زین) زاه (فی زهو) زاول (فی زول) زاویه (فی زوی) زایل (فی زیل) زبال (فی زبل).**

**زب:**

**زبّ: کثر شعْرهُ/** توکن بو.

**زبّب. تزبّب: تکلم حتی زبد فمه** ئاوی کرد، کەف بەدەمیا هاتە خوارێ.

**– العنب: صیّرهُ زبیباً** کردی بە مێوژ.

**تزبّب الرجلُ: إمتلأ غیضا** رقی هەڵسا، پیشی خواردەوە.

**– العنبُ: صار زبیبا/** بو بە مێوژ.

**زبْبٌ: کثرة الشعر و طوله/** توکنی، قژن.

**أزبّ: کثیر الشعر** توکن، تیسکن، قژن، کولکن.

**زبیب: ماجُفف من العنب/** مێوژ.

**– بناتی.** کشمیش.

**– : السمّ فی فم الحیّة** ژاری ناودەمی مار.

**زبیبة: قرحة تخرج من الید/** مو، دومەڵی پەنجە.

**زبد:**

**زَبد اللبنَ: مخضهُ لیخرج زبده** ژەنی تا کەرەی لێ دەربێنێ، کەرەی لێ دەرهێنا.

زبّد اللبن: علاه الزبدة/ سەرتوێژی كرد.
أزْبد: اخْرج الزبد كەفی كرد.
— الرجل: فار غضبُه توڕە بو، هەڵ چو، رقی هەڵسا، دەمارگیر بو، تەنگەگرتی.
زُبْدة. زُبْد الحليب كەرە.
— الشيء: افضله باشەكەی، باشترین، چاكترین.
— الشيء: خلاصته پوختەكەی، پوختە.
— : لُباية كرۆك، ناوكرۆك.
زبدْ: رغوة/ كەف، سەركەف.
زبيدي: سمك تەنكەماسی.
زبر:
زبر البئر: بناها بالحجارة بیرەكەی بە بەرد هەڵ چنی.
— الكتاب: كتبه نوسیەوە.
زَبر: حجارة بەرد.
— : كتابة نوسین.
— : كلام ئاخاوتن، قسە.
— : قويّ/ بەهێز.
زبر: كتاب/ نوسراو، نامە.
— زَبور: مزامير النبي داود/ نامەی داود پێغەمبەر، زەبور
مزْبر: قلم/ پێنوس، خامە، قەڵەم.
زبط:
زبط البطّ: صاح قیرانی، مراوییەكە قیرانی.
زباطة. زباطّة: بطّة مراوی.
زبع:
تزبّع: ساء خلقه/ بەدخو بو.
— : تغيّظ و عربد توڕە بو، كردی بە هەرەشەو گورەشە.
زوْبعة: هيجان الريح رەشەبا،گێژە لوكە، شلێوە.
زبق:
زبق شعْرهُ: نتفهُ هەڵی كێشا، هەڵی گرت، دەسكەنەی كرد (قژ).
— . إنزبق: دخل خلْسةً/ خۆی پیاكرد بە دزیەوە، فرتەی كرد، قوت بوەوە.
— ت المراة بولدها: رمته فڕێی دا، لە باری چو.
زبل:
زبل زبّل الارض: سمّدها پەینی كرد، پەینی پێوەكرد.

زبل. زِبل. زِبْلة: سرجين پەین، خۆڵ.
— . — الحمام: زرق ریقنە.
زبّال: كنّاس خۆڵ ڕێژ، گەسك دەر.
زِبالة. زُبالة: كُناسة. قُمامة خۆڵ، گەسك دراو، پیسی
صندوق الزبالة/ تەنەكەی خۆڵ.
مزبلة: موضع الزبل سەرەنوێلك.
زنبيل. زنبيل. وعاء زەمیلە.
زبن:
زبن: دفع پاڵی نا، پاڵی پێوەنا.
— . أزْبن: نحّا لای برد، نەی هێشت.
زبُون: غبي گێل، گەوج، كەساس، كەودەن.
— . زُبون: عميل. مُشْتري كریار، مەعمیل، بسێن، ئاشنا.
حرْبٌ — : شديدة/ جەنگی گەرم.
زُباني. زبان: شوْكة چزو.
زُبانيا العقرب: قرناها شاخە دوپشك
زبانية جهنم كارگوزاری دۆزەخ، ئاگرخۆشكەر.
زج:
زجّ: رمى هاویشتی، فڕێی دا، تێی هاویشت، تێی خست، تێوەی گلان.
زجّج الحاجب: رفّعهُ برۆی باریك كردەوە.
= : حوّل الى زُجاج كردی بە شوشە.
زُجّ: حديدة في أسفل الرمح ئاسنی بن رم، بنكەرم.
— العصا: كعب حديدي ئاسنی بن داردەست، دەسك
— الشريط: طرفه المعدني ئەم سەرەوسەری قەیتان.
زُجاج: قزاز شوشە.
زُجاجة: قنّينة شوشە، قاپ، بوتڵ.
زجاجي: كالزجاج أو منْه شوشەیی.
— . زجّاج: بائع الزجاج شوشەفرۆش.
أوان زجاجية شوشەمەنی، چینی و فەخفوری، قاپی شوشە.
زجر:
زجر. إزْدجر. إنْزجر: منع و نهى قەدەغەی (كرد، خستەسەر)، نەی كرد.
— . — . — : طرده صائحاً بە توڕەیی دەری كرد.

— : إنتهر لێی تورەبو، پیامەڵ شاخا، تەریقی کردەوە، پیا مەڵ کالا.

زجْر: منْعٌ و نهْي قەدەغە کردن، داپین کردن.

— : إنتهار تورەبون، پیامەڵ شاخان، پیا هەڵ کالان، تەریق کردنەوە.

زاجر: مانع. رادع/ قەدەغەکەر، بەربەست، داپین کەر.

— : ضمیر. دەرون، ویژدان.

زجل:

زجل: رمى، فرێی دا، دەستی پێوەنا، دەست بەرداری بو.

— الحمام: ارسلها الى بعد/ کوترەکەی نارد بۆ شوێنی دور.

حمام الزاجل/ کوتری نامەبەر.

زجل: نوع من الشعر. جۆرێکە لە هۆنراوە.

زجا:

زجا. زجیّ. ازجی: إزدجی: ساق. لێی خوڕی، بردی بەرێوە، پاڵی پێوەنا.

ازجی الأمْر: اخّرهُ دوای خست، خستی بە قنگدا.

ترجّی بالشيء: إکتفی به پێی قایل بو، بەبەسی زانی، بەشی کرد.

زح:

زحّهُ. زحْزحهُ من مکانه: باعده. إزالهُ. حرّکهُ/ جولانی، لە جێی خۆی جولانی، لای برد، بزوانی، لەقانی، ترازانی.

تزحْزح عن مکانه: تحرّك جولا، بزوا، لەقی، ترازا.

زحر:

زحر: کان به زحیر سکەشۆرێی بو، زەحیری بو، بەلەفیرێی بو.

— : أخرج الصوت بأنین نقانی.

زُحر: اصابه الزُحار توشی (سکەشۆر، زەحیری، بەلەفیرێ) بو.

زُحار. زحیر: انین نقە، نقاندن.

— . — : إسهال مؤلم سکەشۆرێ، زەحیری، نیزانتری، بەلەفیرێ.

زحف:

زحف: دبّ خشا، کشا، لەسەر سنگ رۆی.

— : حبا گاگۆلکێی کرد.

— الجیش: سار کشا، چوە پێشەوە، پێشکەوت (لەشکر).

— الیه/ خۆی بۆ کشان، بۆی چو.

— الشيء: جرّهُ جرّاً خفیفاً/ رای کێشا.

— : أعیا/ هیلاك بو، کفت بو، شەکەت بو.

زاحف. زحّاف: دابّ/ خشۆك، خشەك.

زحْف: دبّ/ کشان، بۆچون، پەلاماردان، چونە پێشەوە، خشان

الجراد الزحّاف پڕکورە.

زحّافات. زواحف: الحیوانات التی تدب علی الارض/ خشۆکەکان.

زحّافة: دبّابة. خشۆك، خزنە، تاخورك.

زحْفا/ خشکەیی.

زحل:

زحل. تزحّل عن مکانه: تباعدّ و تنحّی/ لاچو، جولا، دورکەوتەوە.

زحّل. ازْحل نقل و أبْعد لای برد، جولانی، دوری خستەوە.

زُحل: اسم کوکب زوحەل، کەیوان (هەسارە).

زحْلق: دحْرج خل بوەوە.

— : جعله یزلق خزانی، خلیسکانی.

تزحْلق: تزلّق خلیسکا.

زحْلقة. تزحْلُق/ خلیسکە.

قبقاب الـ — / قابقابی خلیسکە.

زحم:

زحم. زاحم: ضایق. نافس تەنگی پێ هەڵ چنی، پێش برکێی کرد.

تزاحم. إزْدحم بکذا: إحتشد. پڕبو، بوبە جەنجاڵ، جمەی ئەهات.

— . — القوم: تضایقوا/ تەنگیان پێ هەڵ چنرا.

— . — القوم: تدافعوا کردیانە پاڵەپەستۆ.

زحْمة. زحام. إزدحام، جەنجاڵ، قەڵەبالغی، جمە، جمەهاتن.

مُزاحم: مُنافس: خصم بەرەکانی کار، تەنگ هەڵچن، پێش برکێ کار، هاوچاو.

مُزاحمة: منافسة/: بەریەرەکانی، پێش برکێ.

مُزدحم: ممتلیء پڕ، لێوان، قەڵەبالغ، جەنجال، چڕ.

زخ:

ز

زَخَّ الجمْرُ: برق شديداً درەوشایەوە، گەشایەوە، شەوقی دایەوە (پشکۆ).
– المطرُ: إنْصبَّ بِشدّة/ بەخوڕ دای کرد، کردی بە لێزمە.
زخيخ: بَريق شەوق، درەوشە، تیشك.
زَخّة: دفْعةٌ من المطر الشديدة تاو، تاوە بارانی قایم.
زخر:
زخر. تزخّرَ البحْرُ او الوادي: إمْتلأ. إرتفع/ هەڵ سا، پڕبو (چەم).
– النبات: طال/ بەرزبوەوە، هەڵ چو (روەك).
– القومُ: جاشوا لنفير او حرب هەڵ سان.
– : زاخر: فاخر/ خۆی هەڵ کێشا.
زاخر: ملآن. طافح. پڕ، لێوان لێو، هەڵ ساو.
– : كريم دەست بلاو.
زَخْرف: زوّق. زيَّن رازاندیەوە، نەخشانی، ئارایشتی دا.
– الكلام: موّه بالكذب فیشاڵ و درۆی کرد، پێوەی نا، زمان لوسی کرد.
زخْرفة. زينه نەخش، خشڵ، مت و مورو.
مُزخْرف. مُزركش رازاوە، نەخشین.
زُخْرُف: زينة/ نەخش، رازاندنەوە، خشڵ.
– الكلام: أباطيله المُموهَة/ درۆو دەلەسە، هەلات، زمان لوسی.
زخارف الدنيا: زهو. غُرور/ لە خۆبایی بون، خۆ هەڵ کێشان، رواڵەت.
زُخرفي: زينّي خشڵ فرۆش، نەخش دروستکەر.
زخم:
زخمَ: دَفع بِشدَّة توند پاڵی پێوەنا، بەقایم پاڵی پێوەنا.
زخِم اللحْمُ: إنْتنَّ/ بۆنی کرد، بۆگەن بو، بۆگەنی کرد.
زخْم. زحْم: القوّة و الشدّة.قُوَّة الدفع/ تەوژم، هێز.
زخْمة: رائحة كريهة/ بۆگەنی، بۆنی ناخۆش.
زخيم: القوّى الشديد. بەهێز، بە تەوژم، بە زەبرو زەنگ.
زخِمْ: اللحم الفاسد/ بۆگەن، بۆن کرتو.
زر:
زرّ القميص. زرّر: شدّ ازراره/ دوگمەی لێ نا، قۆپچەی لێنا.
– عيْنهُ: ضيَّقها/ چاوی (بچوک کردەوە، هێنایەوە یەك، تەسك کردەوە).

زرّ: ما يدْخُل في العُرْوة/ دوگمە، قۆپچە.
– : كُمّ القميص سەرقۆڵ.
– : جُمان بزمارو دەرزی سەرپان.
– الزهْرة: بُرْعُم/ خونچە.
– الطربوش و غيره: غذبة. شرابة گوڵونكە.
– الجرس الكهربائي دوگمەی زەنگ، سویچ.
– : فخْذ ران، شلكەی ران.
حذاء بأزرار پێلاوی بە قەیتان، قەیتانلی
زرْزر العصفورُ: صوّت جریوانی.
زُرْزور. زُرْزُر: من الطيور اكبر من العصفور ریشۆڵە.
زرب:
زرب المواشي: أدخلها في الزريبة ماڵاتەكەی خستە پشتیرەوە.
زرب الماءُ: سال رژا، رۆیی، تکا، دەڵی.
زريبَة. زرب: حظيرة المواشي پشتیر، گەوڕ، گەلەخان، تەویلە.
زرب: مسيل الماء/ ئاوەڕۆ، ئاوڕێژگە.
مزراب: ميزاب السطح پلوسك.
زرد:
زرد: خنق خنكانی.
– : عقد عُقْدةً يصْعُب حلّها گرێ كوێرەی لێدا.
زرد. إزْدرد. تزرّد اللقمة: بلعها پاروی قوت دا، خواردی، هەڵی لوشی، لوشی دا، لرفی دا.
زَرد: درع/ زرێ، قەڵغان.
– : حلْقة ئەڵقە.
حمارُ الـ – : حمار الوحش/ كەرەكێوی، زێبرا
مزرَد: الحلق و البلعوم گەرو، بین.
زرع:
زرع: طرح البذر في الارض چاندی، تۆوی کرد، تۆوی چاند.
– الارض: حرث كێڵای.
– النباتُ: انبت و نما روا، سەری دەرهێنا.
زرْع: زراعة النبات و الارض كێڵان، رواندن، چەقاندن، تۆوكردن، چاندن.
– : النبات المزروع روەك.
زراعة. فلاحة كشت و كاڵ.

وزارة الزراعة/ وەزارەتی کشت و کاڵ، شالیارێتی کشت و کاڵ.

زراعي: مُختصّ بالزراعة/ کشتیار.

خبیر - / پسپۆری کشت و کاڵ.

ارض- / زەوی کشت و کاڵ.

زرّاع. زارِع: من یزرع الارض/ جوتیار.

مُزارِع: فلاّح/ کشتیار، وەرزێر.

مزرعة: موضع الزرع/ کێلگە.

مزروع/ رواو.

زرف:

زرّف القوْم: فرّقهم فرقاً/ جیاجیای کردنەوە، بەش بەشی کردن.

زرافة. زرّافة: جماعة/ کۆمەڵ، بەش.

- . - : حیوان/ زەرافە.

زرافات و وحدانا/ کۆمەڵ کۆمەڵ و تاك تاك، کۆمەڵ و تاك، بە کۆمەڵ و یەکە یەکە.

زرق:

زرق الطائر: رمى بسلحه/ ریقنەی کرد.

زَرِقَ. إزْرَقّ: صار أزرق/ شین (بو، بوەوە، هەڵ گەرا).

زرق الطیور: سلحها/ ریقنە، ساق.

أزرق. زرقاء: شین، خومی، کەوە، خوم.

- سماوی/ ئاسمانی، شینی کاڵ.

عدوّ - : شدید العداوة/ دوشمنی خوێنەخۆر.

ماء - : صافٍ/ ئاوی ساف و روون.

القُبّة الزرقاء: السماء/ ئاسمان.

زرق. زُرْقة: لون كلون السماء/ شینی ئاسمانی.

مِزراق: رمح صغیر/ سونی، سونگی، رمی بچوك، نیزە.

زَوْرق/ بەلەم، کەشتی، گەمێ.

- بُخاري/ کەشتی هەڵم.

زُریق. ابو زُریق: طائر اكبر من العُصفور/ جقە.

زُریقاء/ ئاژەڵێکە لە پشیلە ئەچێ.

زرکش:

زَرْکش: زَخْرف/ نەخشانی، رازاندیەوە.

مُزرْکش: مُزَخرف/ رازاوە، نەخشین، نەخشاو.

زرن:

زرنیخ: عقار سام/ مەرگەموش، ژاری کوشندە.

زری:

زری. تزرّی: عاتب أوعاب/ سەرزەنشتی کرد، عەیب و خەوشی لێ دەرهێنا، گاڵتەی پێ کرد، گاڵتەی پێ هات.

ازری به: حقّره/ شکانی، پەنگی پێدا.

- بالأمر: إستخفّ/ گاڵتەی لێ هات.

إزْدری. إسْتزْری به: إسْتخفّ به/ گاڵتەی پێ کرد، پەنگی پێدا.

- - بالخطر: لم یهْمّ/ سڵی نەکردەوە، ایێی نەسڵەمیەوە، باکی نەبو.

زریّ: یسْتحق الازدراد: حقیر/ سوك، رسوا، بێئابرو.

ازدراد: إحتقار. إستخفاف/ سوك کردن، رسواکردن، گاڵتەپێکردن، پەنگ پێدان.

مُزدر: أنوف/ لوت بەرز، بێئابرو، گاڵتەچی، قەشمەر.

مُزرٍ: غیر لائق بالسُمعة/ ناشیرین، شورەیی.

مزراء: مَن یُزری على الناس/ گاڵتەچی، بێئابرویی، ئەوەی گاڵتە بە خەڵك ئەکا.

زع:

زعْزع: حرّك/ جولانی، بزوانی، لەقانی.

تزعْزع: تحرّك/ جولا، بزوا، لەقی.

زعْزعة: حرکة/ جوڵە، جولاندن، بزواندن، لەقەلەق.

زعْزعٌ. زعْزعان. ریح شدیدة/ بای قایم، گەردەلول، رەشەبا.

زُعْزُع: طویل الارْجُل/ لاق درێژ، لۆقن، شاقەلدار.

مُزعْزع. مُتزعْزع مُقلْقل/ لەق، شلۆق.

زعب:

زعب الاناء: ملأه/ پری کرد.

- الشيء: قطعه/ بری، کەرتی کرد، لێی داشکان.

-زعْبل: عظیم البطن دقیق العُنق/ گرگن، درگن، ورگن و ملباریك.

زعج:

زعج. أزعج. أقْلق/ (وەرس، جارس، بێزار، بۆژۆ، جەرگاوس)ی کرد.

إنْزعج: قلق/ (وەرس، بێزار، بۆژۆ، جەرگاوس) بو.

زعج. إنزعاج: قلق. وەرسی، بێزاری، وەرس بوون، بێزاربوون، جارسی، بۆژۆ بون، جەرگاوس بون.

إزعاج: إقلاق/ (وەرس، بێزار، جارس، بۆژۆ، جەرگاوس) کردن، هەراس پێ هەڵگرتن.

زعر:

زعِرَ شَعْرُهُ او ريشه: قلّ و خفّ/ روتايه‌وه، ته‌نك بو.
ازْعَرُ زعرٌ: خفيف الشعر/ توك ته‌نك، كوسته.
— : بلا ذَيل بێ كلك، كوڵ.
زُعْرور: سريع الغضب توره، توره‌و ترِۆ.
— : شجر گويژ.
زعارير: كتل تتلبد فى اطراف الصوف من الزبل/ كه‌مێڵ.
زعط:
زعط: خنق خنكانى.
موت زاعط: سريع/ مردنى كوت و پڕى.
زعف:
زعف. ازعف: قتله حالاً و فى مكانه/ هه‌ر له‌جێى خۆيا كوشتى.
— . — على الجريح: اجهز عليه و اماته برينداره‌كه‌ى كوشت، به برينداريش كوشتى. هه‌ڵى كوتايه سه‌رى و كوشتى.
سُمٌّ زُعاف او مُزعف: يقتل سريعاً ژارى بكوژ.
زَعْفران: نبات يستعمل لتطبيب و تلوين الاكل. زه‌عفه‌ران.
زعق:
زعق: صرخ قيژانى، هاوارى كرد.
— : دعر ترسا، ترسى لێ نيشت.
— . ازْعق القدْر: كثّر ملحها خوێى زۆر تێكرد. سوێرى كرد، كردى به تل و خوێ.
ازْعق: خوّف ترسانى.
زعْقة: صيْحَة/ هاوار، قيژه. قره.
زعيق. زعيق. صياح: صُراخ هاواركردن، قيژو هوڕ.
زعيق: مذعور ترساو.
زعق: الخائف بالليل شه‌وترسنۆك.
زُعاق. ماء زُعاق: مالح و مُرّ لا يشرب ئاوى سوێرو تاڵ ناخورێته‌وه، سوێر، سوێراو.
زعل:
زعلَ: ضَجر و إضطرب/ بێزاربو، شپرزه‌بو، وه‌ڕس بو.
— : تكدّر زويربو، دلگيربو، جاڕس بو.
ازْعل: ازعج و ضايق بێزارى كرد، شپرزه‌ى كرد، وه‌ڕسى كرد، جاڕسى كرد.
زعّل: كدّر/ زويرى كرد، دلگيرى كرد.
زعلٌ. زعلان: متضايق/ بێزار، وه‌ڕس، جاڕس.
— . — : متكدر زوير، دلگير، نيگه‌ران.
زعلٌ: ضجرٌ بێزارى، وه‌ڕس بون.
— : كدر. غضب دلگيرى، زويرى، توره‌يى، نيگه‌رانى.
زعم:
زعم: إدّعى/ واى وت، واى ده‌رخست، واى پيشان دا، واى راگه‌ياند.
— . تزعّم القوم: صار لهم زعيماً بو به‌سه‌رگه‌وره، سه‌ركردايه‌تى گرته ده‌ست
تزعّم: اتى بالأكاذيب/ فيشالى كرد، درۆى هه‌ڵ به‌ست.
زُعْمى: كذّاب درۆزن.
— : صادق راستگو.
زَعْم: إدِّعاء واوتن وا ده‌رخستن، واپيشاندان، وا راگه‌ياندن.
مُزعَمْ: أمر مُزْعَم: لايوثق به جێى باوه‌ڕ نيه.
زعيم: السيد و الرئيس سه‌ردار، سه‌رۆك، سه‌ركرده، پێشه‌وا، سالار.
زعامة: رئاسة سه‌ركردايه‌تى، پێشه‌وايى، رابه‌رى، سالارى.
زعن:
زعنفة. زعْنفة: اجنحة السمك په‌ڕه‌كه، باڵه‌ماسى، په‌ڕه‌كه‌ى ماسى.
— . — : القصير كورت، كورته بنه.
زعانف القوم: الرعاع هه‌رچى و په‌رچى.
زغب:
زغبٌ: صغار الريش او الشعر گه‌نگه‌مو، گه‌نگه‌په‌ڕ.
زغبٌ. ازْغب: له زغب/ گه‌نگه‌مويا گه‌نگه په‌ڕى هه‌يه، پروشى هه‌يه.
زغْبر. زُغبار: زغب گه‌نگه‌مو، كولك، په‌ره‌موچ.
زغل:
زغل. ازْغل: صبّ رۆى كرد، رژانى.
— : غشّ. زيّف گزى كرد.
زغل: غش گزى، گزى كردن.
زُغلى: غشّاش/ گزى كه‌ر.
زُغلول: طفل منداڵ، مناڵ.
— : فرخ الحمام به‌چكه كۆتر، زه‌رنه‌قوته‌ى كۆتر.
— : الخفيف السريع سوكه‌ڵه، بزێو، چابوك.

زف:
زفّ. ازفّ: اسْرَعَ پەلەی کرد، خێرایی کرد.
– . – العروس الى زوْجها: اهداها/ بردی بە بوکی، گوێزایانەوە.
– الطائرُ: بسط جناحيه/ بالّی کردەوە، باڵی فش کردەوە.
– البُشرى: اخْبرَ الخبر السار هەواڵی خۆشی گەیان، مژدەی (دایە، هێنا).
زفّة: موكِب شایی، ئاهەنگ، زەماوەند.
– : بُشرى/ مژدانە، مزگێنی.
– العروس: الطواف بها إظهاراً للسرور/ بوك گواستنەوە.
زفاف: عُرْس شایی، چونە پەردەوە.
زفت:
زفّت: طلى بالزفت قیری تێ گرت، لە قیری هەڵسو، قیرتاوی کرد.
زفت: قار قیر، زفت.
زفر:
زفر: ضد شهق. اخْرج نفسهُ/ هەناسەی دایەوە.
زفّر: وسَّخ بمادە دهنية چەوری کرد، هەنوی.
زفير: ضد شهيق/ هەناسەدانەوە.
زفر: زنخ/: بۆگەن، بۆچەوری، بۆدڕن.
– : وسخ/ پیس، پۆخڵ.
زفن:
زفن: رقصَ/ سەمای کرد، هەڵ پەڕی، سوڕی دا.
– : ضرب برجله لەقەی (وەشان، لێدا).
زافنة. زفون: عَرجاء شەل، گێڕ.
زفّان: رقّاص سەماکەر، هەڵ پەڕ، سوڕدەر.
زيزفون: إسم شجر زەیزەفون.
زق:
زقّ. زقْزقَ الطائرُ: رمى بسلْحه ریقنەی کرد.
– . – الطائر فرْخهُ: أطعمه بمنقاره/ خواردنی کرد بە دەنوکیەوە.
– الكبْش: سلخهُ/ گروی، پێستەکەی داماڵی.
زقّ: تغْذية بُغية التسمين دابەستن.
زقّ الماء: قربة/ کونە، کوندە، جەوەندە.
زُقّة. زُقق: اسم طائر مائي مەلێکی ئاویە، فیرنەگولە.

زُقاق: طريق ضيِّق كۆلان، باریکەڕێ، گوزەر، کوچە.
زقْزق الطائرُ: صوَّت/ جریوانی، جوکانی، خوێندی، قوقانی، گارانی، قرانی.
– الطفل: رقّصهُ هەڵی پەڕان.
زقْزقة: تغريد/ جریوە، جریوە جریو، جروکاندن، جروکەجروك، زاق و زیق.
زقزاق: طائر/ زیقاوڵە.
زقف:
زقف الشيء: تزقّفهُ: إختطفه بسرعة/ پڕی پیاکرد، رفاندی.
زقم:
زقم. إزدقَمَ: إبتلع قوتی دا، هەڵی لوشی.
زقم. إزقمَ: جعله يبلع. بلَّع پێی قوت دا، دەرخواردی دا، کردی بە قورگیا.
تزقّم: اكل الزقوم/ ژاری خوارد، کوژەری خوارد.
زقّوم: كلّ طعام يقتُل/ کوژەر، ژار، خواردنی کوشندە.
زكم:
زكمَ ازكم: ملأ/ پڕبو.
– : سبَّب له الزُكام توشی هەلامەتی کرد.
زُكمَ: اصابه الزُكام توشی هەلامەت بو، هەلامەتی گرت.
زُكام. زكمَة: رَشْح هەلامەت.
مزكوم: مُصاب بالزكام/ هەلامەتاوی.
زكن:
زكنَ الأمْرَ: فهمهُ/ تێی گەیشت، بۆی چو.
– . زكّنَ: ظنَّ/ گومانی کرد.
رجُلٌ زُكن. زكن: فطن. حسَن الذاكرة/ بیرتیژ، زیرەك.
زكانة زكانية: إصابة الظن و صدقه/ بۆچون، تێگەیشتن.
زكا:
زكابه. زكي: صلح له/ بۆی گونجا، پڕ بە پڕی بو.
– زَكي. تزكّي: نما و زاد/ گەشایەوە، بوژایەوە، پەرەی سەند.
هذا لايَزكويك: لايليق/ بۆت ناشێ، بۆ تۆ جوان نیە، شایانی تۆ نیە.
زكّي: برّر/ بیانوی هێنایەوە، پەڕانیەوە، بەرگری کرد.
– : طهّر/ پاکی کردەوە، خاوێنی کردەوە.
– نفسه: مدحه/ خۆی پەڕانەوە.

ز

– : اصلح/ گونجانی، لوانی.

– المالَ: ادّی عنه الزكاة/ لێی بەخشی، زەكاتی لێدا.

زكاة: طهارة/ خاوێنی.

– : صدَقة/ بەخشین، بەخشندەیی.

– المال: عُشور/ زەكات، دەیەك.

زكّی. بار. الطاهر من الذنوب/ بێگوناه، داوێن پاك.

– : الزائد الخَیْر و الفضل/ خێرەومەند، پیاوچاك.

تزكیة: وصف الشخص بأنه زكیٌّ/ بە باش ناوهێنان، بە باش دانان، بەرگری لێكردن.

زل:

زَلَّ: زلق وسقط/ هەل خلیسكا، كەوت، خلیسكا، ساتمەی كرد.

– عن الحقّ أو الصواب. إنحرف/ لای دا، لە ڕێی راست لایدا.

ازَلَّهُ: ازْلقهُ/ هەڵی خلیسكان، خستی.

– : حملهُ علی الزَلَلْ توشی كرد، توشی خراپەی كرد، بەسەهوی برد.

زلّة زَلْقه او هَفْوة/ هەڵ خلیسكان، ساتمەكردن، سەهو.

– : الخطیئة/ هەڵە، گوناه، زەللە.

زَلَلْ: إرتكاب الذُنوب گوناه كردن.

زُلال: ماء زُلال: عذبٌ صافٍ/ ئاوی پاك و خاوێن.

– البیض: بیاضه/ سپێنە، سپێنەی هێلكە.

زَلزل: هزّ/ لەرانیەوە، لەریەوە.

تزلْزلــت الارضُ: اضــطربت و ارتجفــت و إهتــزت/ لەریەوە، بومەلەرزەبو.

زلزلة. زلزال: ارتجاف الارض و اهتزازها/ بومەلەرزە.

زلج:

زلجَ. ازْلجَ الباب. اغْلقهُ بالمزلاج/ دەرگاكەی كلۆم دا.

زلج تزلّج: زلق خلیسكا، خزا.

– الكلامَ من فیه: إنفلت/ لە دەمی دەرچو، لە دەمی ترازا.

زلاج. مزلاج: سُقاطة الباب/ كلۆم، ئەڵقەڕێز، سورگی.

مزلج. زلاّجَة: قبقاب الزلج/ قاپقاپی خلیسكە.

مزلجة: مكان الزلج/ شوێن خلیسكە، خلیسكێنە، خزگە.

زلع:

زلِع. تزلّع: ذاقَ/ چێژتی، چێشتی.

– راسهُ: إصْلعَ سەری روتایەوە.

ازْلع: اصلع روتاوە، سەر ڕوتاوە.

زلَع. امْرٌ زَلع: باطل/ ناڕەوا، پوت.

زلف:

زلف. تزَلّفَ الیه" تملّقَ مـەرایی بۆ كرد، كلكەلـەقێی بۆ كرد، مامەحەمەیی بۆ كرد، قوزكەشـی بـۆ كـرد، كلكەلـەقێی كرد.

– : تقدم و تقرّبَ/ خۆی بردە پێشەوە.

زلْف. زُلفـی. تزلّـف: تملُّـق مـەرایی، مـەرایی كـردن، ڕواڵەت، مامەحەمەیی، قوزكەشی، كلكەلەقێ.

– – . – : قُربة/ خۆبردنە پێشەوە.

مُتزلّف. مُتملّق/ مەرایی كەر، ڕواڵەت باز.

زلق:

زلق: زلّ/ خلیسكا، خزا، كەوت.

زلَّقَ: زلّجَ/ خزانی، خستی.

زلق. زلج/ خز، خلیسك، لوس، خزگە.

زلْقة. زلّة. هەڵ خلیسكان.

إنزلاق تزلّج خلیسكان، خزان، خزێن.

– غُضرو فی بڕبڕەخزان.

مزْلق مزلَقة. مزْلقَة: مكان زلیق/ خلیسك، خز، شوێنی لوس.

زلاقه. زلق: ملاسة لوسی.

مزلاق. مزلاج: مغْلقة الباب/ كلۆم، ئەڵقەڕێز، سورگی.

زلم:

زلم: اخطأ خەتای كرد، هەڵەی كرد.

– : ملأ/ پڕی كرد.

– : قطع/ بڕی.

– : قلّل/ كەمی كردەوە.

ازْلم. مُزلّم: مقطوع طرف الأذن گوێ بڕاو، گوێ كەل.

زلْمة. زُلْمة. زلمة: هیئة وقدّ/ بالا، شێوە، ئێمەن، لەش و لار.

زلوَمة الأبریق بُلْبُل لولە، لولەی مەسینە.

زم:

زمّ: ربط و شدّ/ گرێی دا، بەستی، شەتەكی دا.

– . ازمّ النعْلَ: جعل لها الزمام قەیتانی بۆ كرد.

زمام: مقوَد/ جڵەو.

– : رباط/ قەیتان، بەنەك.

– الأمر/ جڵەوی كار، بەڕێوەبردن.

– القـوم: صـاحب الأمـر/ دەم راسـت، كـارگێڕ، جڵەوبەدەست.
زَمْزَم الشيء: سُمع صوته من بعيد/ دەنگی لە دورەوە بیسترا.
زَمْزَمَة: ضجيج الرعد/ گرمەگرمی هەور.
زَمْزَم: كثير زۆر فرە، مشە.
– بئر عند الكعبة بیرێکە لە پاڵ مەکەدا، بیری زەمزەم.
زَمْزَمِيَّة: إناء لحمل ماء الشرب. زەمزەمیە، مەتارە، جەوەندە، کوندە.
– : إناء لحفظ حرارة الماء/ ترمۆس. تەرمۆس.
زمت:
زمت زَمُت. تزمّت: كان جليلاً و قوراً/ سالارو سەنگین بو، بەڕێز بو.
زميت. زِمّيت: وقور رزين هێمن، سالار، سەنگین، ئاغر.
تزمُّت. تشدُّد في الدين و السلوك. بەتونگ گرتن.
زمج:
زمج: ملأ پڕی کرد.
زمِجَ: غضب/ تورە بو، هەڵ چو، گڕی گرت.
زُمّج: طيرمائی تیتلەکەناچە.
زمْجر: زار: اكثر الصياح و الصخب، قیژانی، نەڕانی، کردی بە (قاوو قییژ، هەرا).
زمْجرة: زمّارة/ مۆزیقە، زورنا.
– كل شيء: صوته/ دەنگ.
زمر:
زمر. زمَر: غنّى بالنفخ في القصب/ بلـوێری لێـدا، شمشاڵی لێدا، نای لێدا.
زمّر زمير. تزمير: النفخ في القصب/ بلوێر لێدان، شمشاڵ لێدان.
زَمّارة. مزمار: آلة موسيقية. شمشاڵ، بلوێر، نای.
مزمار: ماصول/ زورنا، مۆزیقە، کلارنێت، نای.
– القربة مەشکە زورنا.
زمّار زامر: المغنى بالقصب/ بلوێرژەن، نەی ژن.
زُمُرّد: حجر كريم/ زمروت.
زمع:
زمَع: ازْمع على: عزم/ بڕیاری دا، نیازی کرد.
مُزمع: عازم بڕیاردەر، نیازکار
– : قريب الحدوث/ چاوەڕوان کراو.
زمع زماع: المضاء في الأمر و العزم عليه. بڕیاردان بێ پەشیمانی.
زمعي. زمع: خسيّس. رُذّل الناس. خوێڕی، هەرچی و پەرچی، بێ ئابڕو، تڕۆ.
– : سريع الغضب تورە، زوهەڵ ئەچێ.
زمك:
زَمكهُ على: حَرّشهُ حتى إشتد غضبه/ سەری کردە سەر تا تورەی کرد.
زمك: الغضب الشديد/ تورەیی، تورەبون، رق، قین.
زَمكة: سريع الغضب/ تورەو تڕۆ.
– : أحمق/ کەر، گێل، گەوج، کەودەن.
– : رجل قصير/ کورتەباڵا.
زَمْك الثوب: تضييق/ جل تەسك کردنەوە، قارس کردن.
زمك. زِمكي: اصل ذيل الطائر/ قنگەجورە.
زمل:
زمل. زامل: رافق/ هاوڕێیەتی کـرد، هـاوەڵی کـرد، لەگـەڵی بو.
زَمّل الشيء: اخفاه: شاردیەوە.
– بثوبه أو في ثوبه: لفّهُ لە جلـەکانیا (پێـچایەوە، شاردیەوە).
زُمْلة: رفقة/ هاوڕێیەتی، هاوەڵی، برادەری، لەگەڵ بون.
زميل: رفيق. هاوڕێ، هاوەڵ، برادەر، وێڵاش.
– في صناعة أو منصب/ هاوپیشە، هاوشان.
– في المدرسة/ هاوڕێی قوتابخانە.
– الكأس/ هاوڕێی سەرمێز، هاوڕێی خواردنەوە.
زمالة: رفقة/ هاوڕێیەتی، هاوەڵی، برادەری، لەگەڵ بون.
مُزمّل. مُتزمّل: مُلفّف بثيابه/ پێچراو، خۆی پێچاوەتەوە.
– . – : المُقصِّر المتهاون کەمتەرخەم.
إزملْ: جبان/ ترسنۆك.
– . إزميل: ضعيف بێهێز، لاواز، زەبون.
إزميل: منْحت ئەسکەنە.
– المعادن: منقاش قەڵەمی ئاسن، سمۆ.
زمن:
زمـن: أصـابته عاهـة مُـستديمة گرفتـار بـو، گرفتـاری ناتەواوی لەش بو.

ز

إعترف بالأمر: اَقَرَّ/ دانی پیانا، پێی لێنا، درکانی، چووه ژێری.

— اليه: اخبره بشانه/ سكالای خۆی بۆ كرد، دەردی خۆی دەربڕی.

إستعرف الشيءَ: عَرَفَهُ/ ناسیەوە.

عارِف. معروف: مَشْهور/ زانا، تێ (گەییو، گەیشتو).

— صَبور/ بە ئارام.

مَعروف: معلوم/ زانراو.

— : مشهور/ ناسراو، بەناوبانگ.

— : إحسان/ چاکە، پیاوەتی، خێر، بەخشین.

بالـ — : بالحُسنى/ بە شێنەیی، بە قسەی خۆش.

ناكر الـ — : جاحِد/ سپڵە، نمەك بەحەرام، پێنەزان.

مَعْرِفَة: عِلم. درايَة/ زانین، زانیاری، سەرلێدەرکردن، ڕێپێبردن.

— : واحد معارف الرجل/ ناسیاو، ناسیاوی.

مَعارف الرجل: اصحابه/ ناسیاوان، دۆست و برادەران.

— الوجه: تقاطيعه/ چرچ و لۆچ و شێوەی ڕو.

— الوجه بما يشتمل عليه/ روخسار، رو.

— : جمع مَعْرِفَة/ زانیاری.

وزارة الـ — / وەزارەتی زانیاری.

تَعريف: تحديد/ سنوردانان، باس کردن، لێدوان، ڕون کردنەوە.

— : إخبار. إعلام/ هەواڵ گەیاندن، راگەیاندن، تێگەیاندن، پێوتن.

— الرجل بغيره/ پێناسین، ناساندن، بەیەك ناساندن.

اداة الـ — الـ / كە، ئامێری ناسین، پێناسە.

تَعْرِيفَة: بيان الأسعار/ لیستە.

— الأثمان: قائمة الاسعار/ لیستەی نرخ.

عَرّاف: مُنَجِّم/ جوکی، ئەستێرە شوناس، فاڵ گرەوە، دەست گرەوە، جادوزان.

عِرافَة: عَمَل العَرّاف/ ئەستێرە شوناسی، فاڵ گرتنەوە، جادوگەری.

إعتراف: إقرار/ پێلێنان، دان پیانان، درکاندن.

إعترافاً بكذا: اقرار به/ پێزانین، هەست پێکردن، لە پاداشتی.

مُعْتَرِف: مَن إعْتَرَفَ/ درکێن، پێلێن، دەربڕ.

عَريف: العالم بالشيء/ زانیار، زانا.

— : رتبة عسكرية/ سێ خەت.

عِرْفان. عُرفان: إحسان/ بەخشین، چاکە، خێرکردن، پیاوەتی.

عُرف: ضد النكر. إقرار/ پێلێنان، دان پیانان، درکاندن.

— : الجود و المعروف/ بەخشین، چاکە، بەخشندەیی، پیاوەتی.

— : الصَبْر/ ئارام، ئۆقرە.

— الديك: لحمه على راس الديك/ پۆپنە، پۆپە.

— الديك: نبات/ قەیفە، گوڵەقەیفە، گوڵەپۆپنە.

— الفرس: الشعر النانت على الرقبَة/ یاڵ.

— : عادة مَرْعِيَّة/ نەریت.

الـ — التجاري: العادة المرعية في التجارة/ نەریتی بازرگانی.

الـ — السياسي: إتفاقية/ نەریتی رامیاری، پرۆتۆکۆڵ.

— الشرع: ما جَعَلَهُ علماء الشرع مبنى الأحكام/ نەریت و یاسای ئایینی.

عُرفي: مالوف. إعتيادي/ ئاسایی، نەریت.

حُكم — : عسكري/ یاساو فەرمان رەوایی سەربازی.

محكمة عرفيَّة/ دادگای سەربازی.

اَعْرَف: لە عُرْف/ پۆپنەدار، پۆپنەی هەیە، یاڵی درێژە.

عَرَفَة: جبل بالقرب من مَكّة/ شاخی عەرەفات.

يوم — : التاسع من ذی الحجة/ ڕۆژی نۆی مانگی ئاوجەژنان.

عَرْف: رائحة طيِّبَة/ بۆنی خۆش.

عرق:

عَرَق. تَعَرَّق العَظْم: اكل ما عليه من اللحم/ کرانیەوە، گۆشتی پێوە نەهێشت.

— في الارض: ذَهَبَ فيها/ چو بە ناخی زەویدا.

عَرِقَ: ترشَّحَ جلده/ ئارەقی (کردەوە، رشت، دەردا)، نیشتەسەر ئاو.

– الحائط (مثلاً): نَدِيَ/ شێی (هێنایەوە، هەڵ هێنا)، نەیدا.

عَرَّقَ: جعله يعرق/ ئارەقی (پێ کردەوە، پێ دەردا، پێ‌رشت).

– . اعْرَقَ. تَعَرَّقَ: تَأَصَّلَ/ بنجی داکوتا، رەگی داکوتا، رەگی کرد، ریشەی داکوتا.

– . – . – الخمرَ: مَزَجَهُ بالماء/ ئاوی تێکرد، رونی کردەوە.

عَرَقُ الجلد: رَشَحَ الجلد/ ئارەق، جواناو، ئاوڕەگ.

– : ندی/ شێ، نم.

– : المُسكِر الذی يُتَّخَذ بالتقطير/ ئەرەق، ئارەق.

– التمر: دبسه/ دۆشاوی خورما.

– . عَرَقَة: الصف من اللبن و الحجر فی الحائط/ ساف.

عرق: اصل. جِذر/ رەگ، ریشە، بنج، بێخ، بنەچە.

– من البدن: وَرِيد/ خوێن هێن. .

– ضارب: شريان نابض/ خوێن بەر، خوێن بەری لێدەر.

– النَسا: مَرض/ جۆرێکە لە باداری، دەردو ئێشێکە لە دامێنی پشتەوە تا پێ، کەژۆك، دەردەلاق.

– السوس: عرقوس/ رەگ بەلەك.

شراب – السوس/ شەربەتی رەگەبەلەك.

عريق: أصيل/ رەسەن.

– النسب: إبن اصل/ خانەدان. رەسەن، رەسەن زادە.

– : راسِخ/ قايم، رەگ و بنج داکوتاو، چەسپیو.

عِراق: شاطيء البحر/ (رۆخ، کوێ، کەنار)ی دەریا.

– الريشة: ساقها/ لاسکی پەڕ.

– الظُفر: ما أحاط به/ دەورو پشتی نینۆك.

– الدار: فناؤها/ حەوشە.

العِراقان: الكوفة و البصرة/ شارەکانی کوفەو بەسرە.

عُراق: المطر الغزير/ رەمێڵە، شەستە.

عَرقية. عَراقِيَّة: ما يُلبَس تحت العمامَة/ کڵاو، تەپلە.

عَرْقَبَ: قَطَعَ العُرقوب/ دەماری پێی بری.

– . تَعَرقب: إحتال/ فێڵی کرد، درۆو ساختەی کرد.

عُرقوب: عَصَب غليظ فوق العَقِب/ دەمارێکی ئەستورە لەسەر پاژنە.

– : رَجُلٌ يُضرَب به المثل فی الكذب و الخلف بالوعد/ درۆزن، بێ‌گفت.

– : حيلة/ فرۆفێڵ، ساختەو درۆو دەلەسە.

عَرقَلَ الأمرَ: صَعَّبَهُ/ کارەکەی گران کرد، قورسی کرد، تەگەرەی تێخست.

– : رَبَكَ/ ئاڵۆزانی، ئاڵۆزکانی، تێکی دا.

– : عاق/ تەگەرەی تێخست، کۆسپی خستەبەر.

تَعَرقَل الأمرُ: تَصَعَّبَ و تَشَوَّش/ ئاڵۆزکا ئاڵۆزا، گران بو، تێك چو.

عراقيل: دواهی/ بەلا، دەردو بەلا، چورتم.

– الأمور: صِعابها/ کۆسپ، ناڕەحەتی، تەگەرە، ئاڵۆزکان.

خالٍ من الـ – : خالٍ من الموانع و المحضورات/ رەوان، تەخت، بێ گرێ و کۆسپ.

عرك:

عَرَكَ: دَعَكَ/ سڕی، پێوەی نەهێشت.

– : دَلَكَ/ دەستی پیاهێنا، شێلای، هەنوی.

– ـهُ الدَهرُ: حَنَّكَهُ/ قاڵی کرد، ئاوەسوی کرد، خاراو بو، رای‌هێنا.

– الماشية النبات: اكلته كله/ لەوەڕی، گیای پێوە نەهێشت.

عارَكَ: قاتل/ جەنگی، شەڕی کرد.

تعارَكَ و إعْتَرَكَ القومُ: تقاتلوا/ جەنگین، شەڕیان کرد، تێك بەربون.

– الرجلان: تقاتلا/ چون بەگژ یەکدا، شەڕیان کرد.

عَرْك: إختبار/ خاراوبون، قاڵ بون، راهاتن.

عِراك. عِرْكة. مُعارَكَة: مُشاجَرَة/ جەنگین، شەڕکردن، بەگژ یەکدا چون.

مَعْرَكَة: قتال/ جەنگ، شەڕ.

مُعارِك: مُقاتِل/ جەنگاوەر، شەڕکەر.

مَعْرَك. مَعْرَكة: موضع العراك/ مەیدانی شەڕ.

– . – : قتال/ جەنگین، شەڕکردن.

مُعْتَرَك المنايا: ما بين الستين و السبعين من عمر الانسان/ تەمەنی پیری نێوان ٦٠–٧٠ ساڵی، ساڵانی پیری.

عريكه: خُلُق/ خو، رەوشت، ئارەزو.

لَيِّن الـ – : مُطيع/ گوێ رایەڵ.

ع

شديد الـ — : شديد النفس/ لاسار، قيرسچمه، توندوتیژ.
عرم:
عَرَمَ. تَعَرَّمَ العظم: نزع ما عليه من اللحم/ گۆشتەکەی لێ کردەوە، دای ماڵێ.
— . إعترم الصبي ثدي امه: مَصَّهُ/ مژی، مەمکی دایکی مژی.
— . عَرُمَ. عَرِمَ إشتَدَّ و خرج عن الحَدّ/ لاساربو، قیرسچمە بو، لەتامی کردە دەرەوە.
— ـهُ: اصابه بأذى/ ئازاری دا، زیانی پێگەیان.
عَرَّم: خَلَطَ/ تێکەڵی کرد.
— : كَوَّمَ/ کۆمەڵی کرد، کەڵەکەی کرد، هەڵی چنی.
عَرَمٌ. عُرْمَة. عَرَمَة: كَوْمٌ/ کۆمەڵ، کەڵەکە.
— . — . — : كَدَس من الحنطة جميع ليُذرّى/ خەرمانی گەنمی ئامادە بۆ شەن و کەو.
عارم: شرس المؤذي/ بەزیان، زیان بەخش، دڕ.
اعرم: متلون. ابرش/ بەڵەك، دێز، رەش و سپی.
عرماء: الحية الرفشاء/ ماری رەش بەڵەك.
عَرَمْرَم: شَدِيد/ توندوتیژ، بەهێز، لاسار.
— : مُتَدفِّق/ دەرپەڕیو.
— : جيش كبير/ لەشکری زۆرو بێ شومار، سوپایەکی گەورە.
عرن:
عَرين. عرينه: مأوى الأسد و الذئب و الضبع و الحية/ لانە، کون، ماڵ.
— : الانف/ کەپو، لوت.
— من كل شيء: أوله/ سەرەتا، پێش.
— : اللحم/ گۆشت.
— : فناء الدار/ حەوشە.
عِران: بُعْد/ دوری.
— . عَرَن. عُرنة: تشقق في ابدي و ارجل الدابة/ قڵیشاوی.
عِرناس: مِغزَل/ تەشی.
عَرنوس: عَرانيس الذرة: السنبلة التي عليها الحَبّ/ گلك، گلکی گەنمەشامی.
عرا:
عرا. إعترى فُلاناً امراً: الَمَّ او حلَّ به/ توشی بو، بەسەری هات.
— . — فلاناً: قَصَدَهُ طالبا مَعْروفَه/ چوە لای، دەستی یارمەتی بۆ درێژ کرد.
— القميصَ: جعل له عُرْوَة/ کونی قۆپچەی کرد.
عَرَتْهُ دَهْشَة: اصابته دَهْشَة/ سەرسام بو، سەری سوڕما، حەپەسا.
عُرْوة الزِرّ: ما يَدخل فيه الزر/ کونی قۆپچە.
— الحبل: انشوطة/ گرێ قوڵفە.
— الابريق و نحوه: اذنه او مقبضة/ قووڵف، دەسك.
— ما يوثق به او يُعَوَّل عليه/ پشتی پێ ئەبەسرێ، باوەڕی پێ ئەکرێ، پاڵپشت.
عری:
عَرِيَ. تَعَرّى من ثوبه: خَلَعَهُ/ دای کەند، خۆی روت کردەوە.
عَرّى: جَرَّ من الكساء/ روتی کردەوە، جلەکانی پێداکەند، لەبەری داکەند.
— : كَشَفَ/ سەری (هەڵدایەوە، لابرد، روت کرد).
— من: جَرَّدَ/ لێی کردەوە، دایماڵی، بێبەری کرد، روتاندیەوە.
اعرى الرجلَ الثوبَ و من الثوب: نزعه منه/ دایکەن، روتی کردەوە.
— فلاناً صديقه: تباعدته و لم ينصره/ پشتی تێکرد، لێکشایەوە.
عُرْي. عُرْيَة: التجرد من اللباس/ روت بونەوە، روت و قوتی.
— . — : التجرد من الغطاء/ سەرهەڵدانەوە، سەربەرەڵایی.
عُريان. عارٍ: عارِيَة. عُريانَة، عراة: لا كساء عليه/ روت، روت و قوت.
— . — : التجرد من الغطاء/ سەربەرەڵا.
عارٍ: مُجَرَّد/ روت، روت و قوتی.
— من كذا: مُجَرَّدٌ منه/ نیەتی، بێبەشە، بێبەری.
— من كذا: خالٍ منه/ تیانیە لەوەی تیانیە، لەوەی نیە.

– الراس: مكشوف/ سەرقوتین، سەر روت.
– القدم: حافی/ پەتی، پێیەتی.
عاریَّة: قَرضٌ بلا فائدَة/ قەرزی بێ سودو سەلەم.
– . مُستعار: غیر حقیقی. مصطنع/ دروستکراو، ناراست، درۆ، دەستخواز.
شَعْر – : مُستعار/ قژی خواستە، بارۆکە، کلاوقژ.
عراء: فَضاء/ چۆڵ، سارا، دەشت. دەر.
عَراة: ساحة الدار/ حەوشە.
– : شِدَّة البرد/ تەشقی سەرما.
عَری: بَرد/ سەرما، سۆڵە.
مُعَرّیَ: مجرد من الکساء/ روت و قوت.
– : مکشوف/ بەرەڵا، دانەپۆشراو.
– : مَعاری الجسم: ما لا یُستر من الجسم/ روت، ئەو ئەندامانەی داناپۆشرێ لە لەش، رو، دەست.
تَعْریَة: تآکل. تفتُّت/ دارمان، خۆرمان، داماڵین، روتانەوە، داروتان.
عریس (فی عرس) عریش (فی عرش) عریکة (فی عرك) عرین (فی عرن)
عزا. عزاء (فی عزو)
عز:
عَزَّ: صار عزیزاً/ خۆشەویست بو.
– : قَویَ/ بەهێزبو، گران بو.
– :قَلَّ وجوده/ کەم بوەوە، نازدار بو.
– علیه: کان محبوباً عنده/ لای خۆشەویست بو.
اعَزَّ: احَبَّ/ خۆشی ویست، بەدڵیا چو.
عَزَّزَ: نَصرَ. اعان/ یارمەتی دا، یاریدەی دا، پشتگیری کرد.
– : أَیَّدَ/ سەلماندی.
– : اثبت/ چەسپانی.
– : قَوّی/ بەهێز بو، قایم بو.
– : امَدَّ بقوة جدیدة/ بەهێزتری کرد، هی تری خستەپاڵ.
– : عَظَّمَ/ گەورەی کرد، ریزی لێنا.
– . اعَزَّ: صَیَّرَ قَویّاً/ قایمی کرد، بەهێزی کرد، چەسپانی.
– . – : احبه و اعتنی به/ خۆشی ویست، بەتەنگیەوە هات، چاودێری کرد.
– . – : جعله او عَدَّهُ عزیزاً/ (کردی، داینا) بە خۆشەویست.
تَعَزَّزَ. إعتزَ به: صار عزیزاً/ لای خۆشەویست بو.
– . – به: تَشَرَّفَ/ پێی گەورە بو، سەری پێ بەرز بوەوە.
– . – به: صار قَویّاً/ پێی بەهێز بو، قایم بو، پتەو بو.
– : تَقَوّی/ قایم بو، پتەو بو، جێگیر بو.
– : اظهر الرفض و هو راض/ خۆی (بەناز فرۆشت، قورس گرت، تەسك کردەوە)، نازو نوزی کرد.
– لَحمُهُ: إشتَدَّ و صلب/ گۆشتی تورت بو، جیڕ بوەوە.
إستَعَزَّ علیه: غلبه/ زاڵ بو بەسەریا.
– بالشيء: احَبَّهُ و إعتنی به/ خۆشی ویست، بە تەنگیەوە هات، چاودێری کرد.
عِزّ: مَجْد. رِفْعَة/ شکۆ، سەربەرزی.
– : شِدَّة/ تین، هێز، توندی.
– الشِتاء/ چلەی زستان.
– الصیف/ قرچەی هاوین، چلەی هاوین.
– : مَکانَة/ رێو شوێن، پلەوپایە.
– : المطر الشدید/ بارانێکی قایم رەهێڵە، شەست.
فی – غناه/ لەوپەڕی سامانیا.
فی – صباه/ لە هەرەتی لاویدا.
فی – المعرکة/ لە گەرمەی جەنگدا.
عِزَّة: الحَمیَة و الأنفة و الکرامَة/ رێز، سەربەرزی، شکۆ.
– النفس: إحترام الذات/ رێزی خۆگرتن، رێزخۆ.
صاحب الـ – / خاوەن شکۆ، پایەبەرز.
عزیز: قَویَ/ بەهێز، قایم.
– : محبوب/ خۆشەویست، جگەرسۆز.
– : نادر الوجود/ زۆرکەم، دەگمەن.
– : ثمین/ بەنرخ، گرانبەها.
– : شَریف/ خانەدان، خواپێداو، پیاوچاك، وەجاخ زادە.
– الجانب: قَوی. شدید. مقتدر/ بەهێز، بەکار، بەتوانا.
– المنال: بعید المنال/ دەست ناکەوێ، بەنارەحەت دەست ئەکەوێ.
– النفس: کریم النفس/ جوامێر، دەست بڵاو.

ع

الكتاب الـ – : القرآن الشريف/ قورئانی پیرۆز.
مَعَزَّة: مَحَبَّة. وَمَوَدَّة/ خۆشەویستی.
مُعْتَز: فَخُور/ شانازی.
عزب:
عَزَبَ: لم يتزوج/ رەبەن بو، ژنی نەهێناوە.
– عن البال: نَسِيَ/ لەبیرچوەوە.
– . أعزب: بَعُدَ/ دورکەوتەوە، ون بو، خۆی شاردەوە.
تَعَزَّب: قضى في العُزوبَة زمنا ثم تزوج/ بە گەورەیی ژنی هێنا.
عَزَب. أعْزَب. عازِب: غير متزوج/ رەبەن، قەیرە، ژنی نەهێناوە، سەڵت، بوخچەی نەکراوە.
عازِبَة: مؤنث العازِب/ قەیرە کچ، گەورەکچ، شوی نەکردوە.
عُزوبَة: عُزْبَة. عُزوبِيَّة: فَتْرَة العزوبِيَّة/ رەبەنی، بێژنی.
عزر:
عَزَرَ. عَزَّرَ: لامَ/ سەرزەنشتی کرد.
عَزر. تَعْزِير: لَوْم/ سەرزەنشت.
عزرائيل: ملاك الموت/ ئیزرائیل: گیان کێش.
عزف:
عَزَفَ. عَزَّف عَزِيفاً: غَنَّى/ گۆرانی وت.
– عُزوفاً عن الشيء: زهد فيه ومَلَّتَهُ/ لەبەرچاوی کەوت، لێی بێزار بو.
– على آلة طرب: ضَرَبَ عليها/ ژەندی، لێیدا.
– ت نفسه عن كذا: منعها عنه/ لەخۆی گرتەوە، وازی لێ هێنا. دەستی لێ هەڵگرت.
– ت الريح: صَوَّتَت/ لورانی، باکڤەی هات، وژەی هات.
عزيف: صوت مُسْتَهْجَن. صوت الجِنّ/ دەنگی خێوو جنۆکە.
– الرعد: صوت الرعد/ گرمەی هەور.
– الريح: صوت الريح/ لورەو گڤەی با، وژەی با.
عازِف: موسيقي/ مۆسیقاژەن.
– : مُغَنِّي/ گۆرانی بێژ.
عَزْف: اللعب بالآلة الموسقية/ ژەندن، لێدان.
– الرياح: اصواتها/ گڤەی با، لورە، وژە.
مَعْزوفَة: قطعه موسيقية/ پارچەیەك مۆسیقا.

عزق:
عَزَقَ الأرض: شَقَّها/ هەڵی کەند، کرانی، پاچەکوڵەی کرد.
عَزْق. عَزِيق الارض: شَقّ الأرض/ هەڵکەندن.
– – الأرض: حَفر الارض و قلع الأدغال/ پاچەکوڵەکردن.
مِعْزَقَه. مِعْزَق: فاس/ پاچەکوڵە، خاك ڕن.
عزل:
عَزَلَ. عَزَّل الشيء عن غيره: فَرَزَ/ لێی جیاکردەوە، خستیە لاوە، بڕی.
– : منع الاتصال و التَسَرُّب/ بڕی، قرتانی.
– : فصَلَ/ جیای کردەوە.
– ـه عن مَنْصَبه او عمله: خلعه. طرده/ دەری کرد، لە ئیش لای برد.
عَزَلَ: نَقَل مسكنه/ گواستیەوە.
– الدكان مثلاً: اغلقه/ دایخست، لە کار وەستا، مەڵی گرت.
إنْعَزَلَ عنه: تَنَحَّى جانباً/ لێی جیابوەوە، تەریك بو، خۆی دایە کەنار.
إعْتَزَلَ الشيء و عنه: تَنَحى عنه/ وازی لێ هێنا، دەستی لێ هەڵ گرت، لێی جیابوەوە، جیای کردەوە.
عَزْلٌ: فَصل/ جیاکردنەوە، دابڕین، پەڕکردنەوە، بڕدان، کەلاخستن.
– : نقل. إبعاد/ دورخستنەوە، گواستنەوە.
– عن مَنْصَب: خَلْع/ لابردن، دەرکردن، لاخستن.
– : منْع الإتصال و التسرب/ بڕین، قرتانن.
اعزَل. عُزُل: بلا سلاح/ بێچەك.
عُزْلَة. إعتزال: تَنَحٍّ/ وازهێنان، دەست هەڵ گرتن، خانەنشین، گۆشەگیری.
– : إنفراد/ تەنهایی، تەنیایی، دورەپەرێزی.
عازِل: فاصِل/ جیاکەرەوە.
– : مانع الاتصال او التسرب/ جیاکار، نەگەیەن، نەکێش.
إنعزال: تَنَحِّي. إنفراد/ پەڕبون، خۆپەڕکردن، گۆشەگیری.

مُنعَزِل: منفرد/ پەڕ، تەریك، گۆشەگیر، تەنهایی، دەرکەنار.
مَعْزِل: مكان الإعتزال/ پەنا.
بِمَعْزِلٍ عَن: بعيد عن/ دورەپەرێز.
عزم:
عَزَمَ على: نَوِى/ نیازی کرد، ویستی، بڕیاری دا.
- . عَزَّمَ الراقى: قرأ العزائم/ جادوی کرد، ویردی خوێند، نوشتەی کرد.
- : اقسم/ سوێندی خوارد.
تَعَزَّمَ و إعتزم الأمر و عليه: اراد فعله/ ویستی بیکا، بڕیاری کردنی دا.
عَزْمٌ: قَصد/ مەبەست، نیاز.
- . عَزِيمَة: إرادة ثابتة/ بڕیار، سوربون، هەتەری.
- . - : قُوَّة/ هێز، توانا، زەبر، خوڕ، وره، وزه، تین.
عزيمه. رُقْيَة/ نوشته.
- : الارادة المؤكدة/ نیازو بڕیار، توانا.
- . عُزومَة: دَعْوَة الى وليمَة/ بانگ کردن.
- . - : وليمة/ زیافەت، داوەت.
عَزوم. قَوِّى العَزم/ بێپەروا، بەغیرەت، بڕیارنەشکێن.
عازم: ناوٍ/ بڕیاردار.
- : داعٍ/ بانگ کەر.
مَعزوم: مَدعو/ بانگ کراو.
عزا:
عَزَا: إعتزى الشيء لفلان او الى فلان: نسب اليه/ بەهی ئەو دانرا، بەسترایەوە بەوەوە، بەوەوە پەیوەند کرا.
- : اليه أمراً مستنكراً: الصق به/ تاوان (درایه پاڵی، بارکرا، کرایه ملی).
- : صبر و سلا/ سەبوری هاتەوە، هێمن بوەوە، دڵنەوابو، پشویەکی هاتەوە به بەرا، حەوایەوە.
عَزو: نسبة. إسناد/ درانه پاڵ، خستنه پاڵ.
- : إتهام/ گوناه بارکردن، تاوان بارکردن.
عزى:
عَزَى اليه: نسب/ درایه پاڵی.
عَزِىَ. تعَزَّى: صَبر وسلا/ سەبوری هاتەوە، هێمن بوەوە، دڵنەوابو، حەوایەوە.
عَزَّى المصابَ: سَلاّه/ دڵخۆشی دایەوە، دڵی دایەوە، بەسەریا هات.
- اهل المتوفى: سَلاّه/ سەرخۆشی لێکردن، چو بە پرسەیانەوە.
عَزاء. تَعْزِيَة/ پرسه، دڵ خۆشی دانەوە، دڵ دانەوە.
خطاب تعزيَة/ پرسەنامە.
مُعَزٍّ. مُسَلٍّ/ سەرخۆشی کەر، پرسەکەر.
عزير (فى عز)
عس:
عَسَّ: طاف بالليل/ شەو (پاس، پاسەوان، چەرخە)ی کرد.
عاسّ. عَسّاس: حارس ليل/ پاسەوان، چەرخی، حەسحەس.
عَسَس: حُرّاس الليل/ پاسەوان، چەرخی، حەسحەس.
عَسّاس. عَسْعَس: ذئب/ گورگ.
عَسْعَسَ الليلُ: إظْلَمَّ/ تاریکی کرد، تاریك داهات.
عسب:
يَعْسوب: ملكه النحل/ شاهەنگ.
- : ذكر النحل/ نێرەهەنگ.
- : حشرة كالجراد/ پوش به قنگه.
عسج:
عَسْجَد: ذَهَب/ زێڕ، ئاڵتون.
عَوْسَج: نبات شائك/ توترك.
عسر:
عَسَرَ. عَسُرَ. عَسِرَ: ضِد يَسُرَ/ گران بو، سەخت بو، نارەحەت بو، قورس بو.
- عليه ما فى بطنه: لم يخرج/ سكی نارەحەت بو، دەرنەچو، قەبز بو، گرفتی کرد.
- ت. اعْسَرَت المراة: عَسَرت عليها ولادتها/ بەنارەحەت منداڵی بو.
عَسِرَ: كان اعْسَر/ چەپەبو، چەپلەربو.
عَسَّرَ عليه: ضَيَّقَ عليه/ وەڕسی کرد، تەنگی پێ هەڵ چنی، جاڕسی کرد، بێزاری کرد.
- الأمْرَ: جعله عسيراً/ گرانی کرد، کارەکەی گران کرد.
اعْسَرَ: إفتقر/ دەستی کورت بو، نەی بو.
- : افلس/ نابوت بو، هیچی نەما.

— العزيم: طلب منه الدَين على عُسْره/ داوای قەرزی لێ کردەوە سەرەڕای لاتی و نەبونی.

تَعَسَّرَ. تَعاسَرَ. إسْتَعْسَرَ عليه الأمرُ: إشْتَدَّ و إلتوى/ کارەکەی لێ گران بو، لێی ئاڵۆزا، پێك نەهات.

— . — عليه القول: إلتبَس/ سەری لێ شێوا، لێی تێك چو.

إسْتَعْسَرَ الأمرَ: وجده عسيراً/ زۆر بەگران هاتە پێش چاوی.

عَسِرٌ. عَسِيرٌ: ضد سهل/ گران، ناڕەحەت، قورس، سەخت، دژوار.

ماء — : ضد يُسر/ ئاوی گران، ناساز، ئاوی قورس.

عُسْر: فُقْر/ هەژاری، نەبونی، دەست کورتی.

— مالى/ بێدارایی، بێ دراوی، نەداری.

— الهضم: سوء الهضم/ گرفت، هەرس نەکردن.

— . عُسْرَة. مَعْسَرَة: صُعوبَة. مشكلة/ تەنگانە، ناڕەحەتی، ناخۆشی، بەڵا.

أعْسَر: اشْوَل. الذى يعمل بيسراه/ چەپە، چەپلەر.

— يَسَر: يعمل بيديه/ چەپەیشەو ڕاستەیشە.

مُعْسِر. مَعسور: فى ضنك. ضد الميسور/ نەبو، هەژار، کەم دەست.

— فى التجارة: مُفْلِس/ نابوت، تێشکاو.

عسف:

عَسَفَ. تَعَسَّفَ. إعْتَسَفَ عن الطريق: حاد/ لایدا، لەڕێ لایدا، لاکەوت.

— . — . — : إستخدم/ بەکاری هێنا، کاری پێکرد، بەکرێی گرت.

— . — : ظَلَمَ/ زۆرداری کرد، جەورو ستەمی کرد.

— الشيءَ: اخَذَهُ بِقُوَّة/ بەزۆر بردی.

— فى الأمر: فعله من غير تدبُر/ هەڵەشەیی کرد، کوێرانە جوڵایەوە.

عَسَفَ: سار على غير عِلمَ/ کوێرانە ڕۆیی، ملی نا بێهۆ.

تَعَسَّفَ. إعْتَسَفَ الأمْرَ: فعله بلا رَوِيَّة/ بە کوێرانە جوڵایەوەو کرداری کرد.

— فى رايه: إسْتَبَدَّ به/ زۆردار بو لە گوفتاریا، قیرسچمە بو.

عَسْف: ظلْم/ زۆرداری، جەورو ستەم.

عَسّاف. عسوف: طاغِيَة/ زۆردار، ستەم کار.

تَعَسُّف: ظلم. استبداد/ زۆر، زۆرداری، ناڕەوایی.

تعسُّفى: باستبداد/ زۆردارانە، ستەمکارانە.

عَسيف: الاجير/ بەکرێ گیراو.

عسك:

عسكر القوم: تجمعوا/ کۆبونەوە.

— الليلُ: تراكمت ظلمته/ تاریکی کرد، بو بە شەوەزەنگ.

— الجند: خَيَّموا/ هەڵیان دا، سوپا هەڵیدا.

عَسْكَر: جَيش/ لەشکر، سپا.

عَسْكَرى: جُندى/ سەرباز.

— : حربى/ جەنگاوەر.

حاكم — / فەرمان ڕەوای سپایی، سپا (سالار، دار، ران).

حُكم — / فەرمان گێڕیی سپایی.

نظام — / ڕژێمی سپایی.

مُعسكَر: موضع تجمع الجيش/ سەربازگە، سپاخانە، شوێنی کۆبونەوە.

عسل:

عَسَلَ. عسَّلَ الطَعام: خلطه بالعَسَل/ هەنگوینی (پیاکرد، پێوەکرد، تێ کرد، تێکەڵ کرد).

— . — : حَلّى/ شیرینی کرد.

عَسَّلَت. إستعسلت النحل: عملت العَسل/ هەنگوینی دروست کرد.

عَسل: شهد/ هەنگوین.

— صافى/ ڕنگاڵ.

— : دبس الرطب/ دۆشاوی خورما.

شهر الـ — / مانگی هەنگوینی.

قرص — النحل/ شانەی هەنگ، شانەی هەنگوین.

فرز او تصفية الـ — / ڕینگانەوە.

عسلى: بلون العَسَل/ هەنگوینی، ڕەنگ هەنگوینی.

عيون عَسَلِيَّة/ چاو (هەنگوینی، قاوەیی).

عَسّالة. مَعْسلَة: خَلِيَّة النحل/ کورەی هەنگ، پورەی هەنگ، دوبەرە.

مَعسول: مُخَلّى بالعسل/ شیرین کراو بە هەنگوین، هەنگویناوی.
— المواعید: صادقها/ راستگۆ، بە گفت.
کلام — : منطق حلو/ قسەی نەستەق، قسەی راست و شیرین.
لسان — / زمان شیرین.
رجل — الکلام: حلو المنطق/ قسەخۆش، قسە شیرین.
عَسّال. عَسول: یهتز لیناً/ ئەلەرێتەوە، لەرزۆك.
— : ذئب/ گورگ.
عُسلُج. عُسلوج: غُصن لَیِّن/ شوڵ، شوڵك، لق و چڵی نەرم.
عسم:
عَسَمَ: إجْتَهَدَ/ کۆششی کرد، رەنجی دا.
— فی الأمر: طَمَح فیه/ تەماعی تێ کرد.
عَسِمَت القَدَم او الکف: یَبُسَ المفصل/ گێڕ بو، گرج بو.
عاسِم. عَسُوم: الکاد علی عیاله/ کۆشش کار، رەنجدەر.
عَسمَة. عُسُوم: کسر الخبز الیابس/ نانە رەق.
اعْسَم. عَسماء: اعوج القدم او الکف/ پێخوار، گێڕ، دەست خوار.
عسی:
عسی: لعل/ لەوانەیە، رەنگە، بەشکو، خۆزگە.
عش:
عَشَّ. عَشَّشَ. اعْتَشَّ الطائر: إتَّخَذَ عُشاً/ هێلانەی کرد.
— : رَقَّعَ/ پینەی کرد.
— الشَّيءَ: جَمَعَهُ/ کۆی کردەوە.
— الشَّيءَ: طَلَبَهُ/ داوای کرد.
— البَدَنُ: نَحِل/ لەڕولاواز.
عُشّ. عَشّ: بیت الطائر/ هێلانە.
عَشاء. عَشاوه (فی عَشو)
عشب:
عَشِبَ. عَشُبَ. اعْشَبَ. عَشَّبَ المکانُ: نبت عُشبُهُ/ گیای لێ ڕوا، گیاکەی دەرهات.
تَعَشَّبَ. إعْتَشَبَ: رَعی العُشبَ/ لەوەڕی خوارد، گیای خوارد.
عُشْب: کلأ رَطِب/ سەوزەگیا، لەوەڕ.
— . عُشبَة: نبات. حشیش/ پەڕێز، پوش، لەوەڕ.
عُشبی: نباتی/ گیایی.
عَشیب. مُعْشِب. عَشِب. مِعْشاب: کثیر العُشب/ مێرگ، گیاپۆش.
عَشیب. یعیش علی الأعشاب/ گیاخۆر.
عَشّاب: عالم بالاعشاب/ گیاناس.
عشر:
عَشَرَ. عَشَّرَ المال: اخذ واحداً من عَشَرَة/ دەیەکی برد، یەك لە دەی برد.
— القومَ صار عاشِرَهُم/ بو بە دەهەمیان.
— الناقَة: صارَت عُشَراء/ سکی هەشت یا دە مانگە، ئاوس بو، تکەی گرت.
اعْشَرَ القومُ: صاروا عاشِرَهُم/ بو بە دەهەمیان.
— العدد: جعله عشرة/ کردی بە دە، دەی تەواو کرد.
عاشَرَ: خالَطَ و صاحَبَ/ تێکەڵی کرد، برادەری لەگەڵ کرد.
تعاشَرَ. إعْتَشَرَ القومُ. تعاشَروا: تصاحبوا و تخالطوا/ تێکەڵیان کرد.
عَشَّرَت الدابَّة: صارت عُشراء/ ئاوس بو، تکەی گرت.
عَشْرَة. عَشْر: ١٠/ دە.
— اضعاف/ دە ئەوەندە.
عاشِر: واقع بعد التاسع/ دەهەم، دەیەم.
عُشر. عِشر: جزء من عشرة اجزاء. ١/١٠/ دەیەك، ١/١٠.
— او عُشور المال/ دەیەکانە، دەیەك.
— او عُشور حصیلة الارض/ دەیەکی بەرهەمی زەوی.
— او عُشور کسب العمل/ دەیەکی کاسبانە.
عُشری. اعشاری: المَنْسُوب الی الأعشار/ دەیی، دەییانە، دەدە، دەیەکی.
کَسْر — او أعشاری/ کەرتی (دەیی، دەیەکی).
عشرون: ٢٠/ بیست، دودەیی.
الـ — : واقع بعد التاسع عشر/ بیستەم، بیستهەم.
معشار: جزء من عشرة/ لە دەیەك، دەیەك.
عَشّار: جابی العُشور/ باج گری، دەیەك، دەیەك سەن.

عاشور. عاشوراء: يوم العاشر من مُحَرَّم/ رۆژی دەی محەڕەم، عاشورا.
عِشْرَة. مُعاشَرَة: مُخالَطَة/ تێکەڵی.
– . – : صُحْبَة/ برادەری، هاوەڵێتی، ناسیاوی.
عَشير. مُعاشِر: صاحِب/ برادەر، هاوەڵ، هاواڵ.
– : قريب. صديق/ خزم، خوێش، هاوەڵ.
عَشيرة: قبيلة/ هۆز، تیرە، خێڵ، ئێل.
النزعَة العشائرية/ تیرەگەری.
مَعْشَر: جَماعَة/ کۆمەڵ.
– : أهل الرجل/ کەس و کاری پیاو.
عِشار. عُشَراء: حبلى للبهائم/ ئاوس.
اعْشَر: احمق/ گێل، گەوج، کەودەن.
معشار: غزيرة اللبن/ شیردار، تێر شیر، بەشیر.
عشق:
عَشِقَ الشيءَ: تَعَلَّقَ به قلبه/ خۆشی ویست، بەدڵیاچو، دڵی پیاچو، حەزی لێکرد.
– بالشيءَ: لَصِقَ به/ پێوەی نوسا، پیالکا.
تَعَشَّقَ: غازل/ دڵداری کرد.
– ـه: تَعَلَّق به قلبه/ دڵی پیاچو، شەیدای بو، خۆشی ویست.
عَشْق: فَرط الحُبّ/ دڵداری، خۆشەویستی، ئەڤین.
عشيق. مَعشوق: محبوب/ خۆشەویست، دڵدار.
– . – . حبيب/ یار، دەنك.
عاشِق. مُحِبّ/ دڵدار، شەیدا، دلارام.
– و مَعشوق. فحل و نثيَة/ نێرەو مێیە، دڵدارو دڵخواز.
تعشيق الخشب: وَصل/ تێهەڵکێش، لێکدان.
عشم:
عَشَمْ. عَشَمَة: طَمَعٌ/ چلێسی، تەماع کاری، چاوچنۆکی.
عَشِمَ الشيءُ: يَبَسَ/ وشك بوەوە، رەق بوەوە، وشك هەلگەڕا.
عَشَمٌ عَشَمَة: الخبز اليابس/ نانەڕەق، نانی وشك.
– . – : اليابس هزالاً/ لەڕو لاواز، رەق هەلگەڕاو.
اعْشَم: كل لونين إختلطا/ دو رەنگ.
عشا:
عَشا. عَشِيَ: لم يَبْصُر بالليل/ شەوکوێرە، توشی شەوکوێری بوە.
– . اعشى الرَجُلَ: اطعَمهُ العَشاءَ/ ژەمی ئێوارەی دایە.
عَشِيَ: تَعَشّى. اكل العَشاءَ/ ژەمی ئێوارەی خوارد.
عَشا. عَشاوَة: العَمى الليلى/ شەوکوێری.
عَشاء. طعام العَشاء/ ژەمی ئێوارە.
عِشاء. عَشِيَّة: اول الليل/ ئێوارە، سەرەتای شەو، خەوتنان.
عَشواء. عَشوَة: ظُلْمَة/ تاریکی
خَبط – : على غير بَصيرة/ کوێرانە.
عَشوائي: إعتباطاً/ کوێرانە، هەڕەمەکی.
اعْشى: لايَرى ليلاً/ شەوکوێر.
– : ضعف البَصر/ چاوکزی.
عشير (في عشر)
عص:
عَصّ: صلب و إشتَدَّ/ جیڕ بوەوە، تورت بو.
عَصّ: الأصل/ رەسەن.
كريم الـ – : كريم الاصل/ خانەدان، رەسەن.
عُصْعُص: أصل الذنب/ بنکی کلك، قنگە جۆڵە.
عُصْعُص: قليل الخير/ بڕکەڵك، کەم بەخش.
– . عُصعوص: عظم الذنب/ ئێسقانی کلك، کلێنچکە.
– الطيور: زِمْكى/ قنگەجۆڵە.
عصب:
عَصَبَ الشيءَ: شَدَّهُ. طواهُ/ پێچایەوە، بەستی، قەدی کرد.
– . عَصَّبَ: رَبَط بعصابَة/ تێوەی ئالان، بەستی، پێچای.
– الريقُ بالفم: يبس عليه/ تف (لە دەمیا، لە گەرویا، بەدەمیەوە) وشك بو.
تَعَصَّبَ: شَدَّ العصابَة/ سەریەستی، سەرپێچی بەست، سەری بەست.
– : اتى بالعصبيَّة/ تورە بو، رقی هەڵسا.
– لە و مَعَهُ: مال آليه/ لایەنی گرت، پشتگیری کرد.

– : صار سَيِّداً/ گەورە بو، خۆی زل کرد، رێزی لەخۆی نا.

– في دينه و مَذهبه: كان غيوراً فيهما مُدافِعاً عنها/ دەمارگیر بو، توندوتیژ بو، تیرەگەر بو.

– إعتصب القوم: صاروا عُصبَةً/ کۆمەڵیان کرد.

– . – العمال: اضربوا/ یاخی بون، مانیان گرت.

– . – بالشيء: رَضِيَ به/ قایل بو، ویستی.

عَصَّبَهُ: شَدَّهُ بالعِصابة/ پێچای، بەستیەوە.

– : جَوَّعَهُ/ برسی کرد.

– فلاناً: جعَله سَيِّداً/ گەورەی کرد، رێزی لێنا.

عَصَب: عِرق/ دەمار، چەقەدەمار.

– : طُنُب/ ژێی ماسولکە، دەماری ماسولکە.

قرابَة – : من جِهَة الأب/ خزمانی باوك.

عَصْب: عِمامَة/ مێزەر، سەرپێچ.

مُعَصَّب. معصوب: مَشدود/ پێچراو، بەستراو.

عَصْبَة. عَصابَة الجبين/ سەرپێچ، سەربەست.

عَصَبي: مختص بالأعصاب/ دەمار (زان، شوناس).

– المزاج: حاد الطبع. سريع التأثر و الإنفعال/ تورە، زو هەڵ ئەچێ، توند خو، توندڕەو دەمارگرژ، کەللەرەق، شێت گیر، جەنگەڵی.

تَعَصُّب: حَماس. غيره/ پەرۆشی.

– ديني او مَذهَبي/ دەمارگیری تیرەگەری، دەرمارگیری باوەڕی.

مُتَعَصِّب: غيور/ پەرۆش.

– لمذهب/ دەمارگیر، تیرەگەر.

عَصَبِيَّة. تَعَصُّب: تَحَزُّب/ دەمارگیری، تیرەگەری.

– : قَرابَة/ خزمایەتی، خوێنشێتی، پەیوەندێتی.

عُصْبَة. عصابَة: جماعَة/ کۆمەڵ، دەستە، تیپ.

– . – . عِصاب: رِباط/ سەربەست، سەرپێچ، سارخی.

– الأمَمْ/ کۆمەڵەی گەلان.

عِصابَة: جماعَة/ چەتە.

– : عِمامَة/ مێزەر.

حرب العِصابات/ چەتەگەری.

عاصِب: قريب من جهة الاب/: خزمی باوك.

يوم عصيب: شديد الحَرّ/ زۆر گەرم.

معصوب: جوعان/ برسی.

إعتصاب: إضراب/ مان گرتن.

عصد:

عَصَدَ الشيءَ: لَواه و عَقَدَهُ/ لولی کرد، گرێی دا.

عَصيدَة: طعام من الدقيق و السمن/ حەڵوای ئارد، پەڵوله.

عصر:

عَصَرَ الشيءَ: إستخرج ماءه/ گوشی، ئاوەکەی لێ (گرت، دەرهێنا).

– الحبوب: إستخرج زيتها/ رۆنەکەی گرت.

– الدُمَّلَ: إستخرج مِدَّته/ گوشی، تەقانی، دەرکی کرد، کێمەکەی دەرهێنا.

– الشيءَ عنه: مَنَعَهُ/ لێی گرت.

إعتصر: بمعنى عَصَرَ/ بە مانای گوشین.

– مالاً: إستخرجه منه/ لێی سەند، لێی دەرهێنا، لێی کشایەوە.

– عليه: بَخَلَ/ رژد بو، کردی بە دەسندە.

– . تَعَصَّر به: لاذ به و إلتجا/ پەنای بردە بەر، مانای بۆ برد.

تَعَصَّر. إنعَصَرَ: خَرَجَ ماءُه/ گوشرا، ئاوەکەی دەرهات، تەڕی تیا نەما.

– به: إلتجا اليه/ پەنای بردە بەر، هانای بۆ برد.

اعْصَرَ: اسرعَ/ خێرای کرد، پەلەی کرد، گوڕی دایە.

– الريح: جاءت بالاعصار/ کردی بە گێژەڵوکە، خۆڵی هێنا، کردی بە گەردەلول.

عاصَرَ فلاناً: في عصر و جيل واحد/ هاودەمی بو.

عَصْر: إستخراج الماء/ گوشین، ئاو (دەرهێنان، لێگرتن).

– . عصْر: دَهر. زَمَن/ چاخ، دەم، کات، چەرخ، سەردەم، سەدە، رۆژگار.

– : آخر النهار/ عەسر، پاش نیوەڕۆ، ئێوارە.

الـ – الجليدي/ بەفرەچاخ.

الـ – الحجري/ بەردەچاخ.

ع

عُصارَة. عُصار. عصير. عصيرة: ما تُحْلَب مِمّا عُصِر/ شیراوگ، دۆشاو، ئاوگ، رینگاو، گوشراو.
- النبات: عُصارَة لبنية تفرزها بعض النباتات/ شیری رووەك، ئاوك، لیکاو، شیراوگ.
عَصّارة. مِعْصَر. مِعْصَرَة: آلة العصر/ گوشەر.
مَعْصَر: مَعْصَرَة: مكان العَصْر/ شوێن گوشین.
عَصْري: حَديث/ تازە، نوێ، سەردەم.
مُعاصِر: في عهد و جيل واحد/ هاو (دەم، چەرخ، تەمەن، سەدە).
إعصار: ريح شديدة. ريح تستدير و ترتفع/ گێژەلوکە، گەردەلول، خۆڵ بارین.
عصف:
عَصَفَ: اسرع/ گوڕی دایە، دایە غار.
- الدهر بهم: أبادهم/ لەناوی بردن، سەرگەردانی کردن.
- الزرعَ: جَزَّهُ قبل ان يدرك/ بە سەوزی درویەوە.
- . اعْصَفَ عن الطريق: مالَ/ لەرێ لایدا.
- ت. اعْصَفَت الريح: إشتدت/ با هەڵی کرد، بای هات.
- ت. اعصفت الحرب بهم: ذهبت بهم و اهلكتهم/ لەناوی بردن، تەفروتونای کردن، پرزەی برین.
- الرجل: هلك/ پرزەی برا، پەرێشان بو.
اعصف الزرعُ: حان أن يجز/ کاتی درونەوەی هات.
عَصْف: هُبوب/ با هەڵ کردن.
- : حُطام/ چڵ و چێو، پاشماوە.
عاصِفَة. عَصيف: ريح شديدة/ رەشەبا، بای قایم، باگێژە، گەردەلول، شڵێوە.
عاصِف. مَعْصَف: فيه الريح/ بای هەیە، باکەی قایمە.
- : مائل عن الفرض/ سەرکردو، لاداو، پێ نەکاو.
عُصافَة: تبن/ پوش، کا، وەریو.
عَصْفَرَ الثوبَ: صَبَغَهُ بالعُصْفُر/ زەردی کرد.
عُصْفُر: نبات يستخرج منه الصِبْغ/ جۆرە روەکێکە، گیاکەزنە.
زيت الـ - / رۆن (عوسفور، قورتم).
عُصفور: طائر/ مەلی بچوك.
- الجَنَّة/ پەرەسێلکە.
- دوري/ چۆلەکە، پاساری.
- : الخشب الذي تُشَدّ به رؤس حبال الحمل/ دار بەستی بار.
- : عظم ناتيء في جبين الفرس/ ئێسقانی ناوچەوانی وڵاخ.
عصافير: جمع عصفور/ چۆلەکەکان.
صاحت – بطنه. جاعَ/ برسی، سکی قوڕەی هات لە برسا.
عصم:
عَصَمَ: مَنَعَ/ قەدەغەیکرد.
- : حَفَظَ و وقى/ پارازتی، پاراستی.
إعتصم و إستعصم به: إلتجأ/ پەنای بردەبەر.
- و - به: لزمه/ پشتی گرت، پشتگیری کرد.
- و - بالصبر: تَجَلَّد/ ئارامی کرد، ئۆقرەی گرت.
- و - بالصمت: صَمَتَ/ بێدەنگ بو.
- و - من الشَرّ و المكروه: إمتنع/ نەی کرد، خۆی لێدورخستەوە، وازی لە خراپە هێنا.
عَصْم. عِصْمَة: مَنْع/ قەدەغەکردن، نەکردن.
- . - : وقايَة/ پارازتن، خۆلێپاراستن.
عِصْمَة: تَنَزُّه عن الخَطيئة/ دوربون لە گوناە و تاوان، داوێن پاکی.
- تنزه عن الخطأ/ دەربون لە هەڵە، هەڵە نەکردن.
صاحِبَة العِصْمَة. معصوم: مُنَزَّه من الخطأ/ دور لە هەڵە، پایە بڵند، خان.
إمرأة في عِصْمَة رجل: متزوجَة/ ئافرەتی بەشو، مێردار.
عِصام: عَهْد/ پەیمان.
- : حِمالَة/ هەڵ گر، راگر، ئەوپەتەی مەشکەی پێ هەڵ ئەواسرێ.
- : عُرْوَة/ قوڵف، دەسك.
- : الكحل/ کل.
عِصامي: مُرْتَقٍ بجده و إجتهاده/ خۆپیگەیین، بەخۆیەوە ئەنازی نەك بە باوانەوە.
عاصِمَة: قاعدة البلاد/ پایتەخت.
مِعْصَم: موضع السوار من اليد/ مەچەك.

ساعَة – / سەعاتی دەست.
مَعْصوم: محفوظ/ پارێزراو.
– : مُنَزَّه عن إرتكاب الخطايا/ دور لە تاوان و گوناه، داوێن پاك.
– : منزه عن الخَطأ/ دور لە هەڵە.
مُعْتَصَم: موضع الاعتصام/ پەنا، پەناگە، سوپێر.
إعتصام: إلتجاء/ پەناگرتن، پەنابردنەبەر.
عُصْمَة: قلادَة/ ملوانكە، گەردانە.
عصا:
عَصا: ضَرَب بالعَصا/ داركاری كرد، بەدار لێی دا.
– : عَصايَة: قضيب/ دار، كوپاڵ، گاڵۆك، داردەست.
– : عود/ شوڵ، توڵ.
– : الاجتماع و الائتلاف/ كۆبونەوەو رێك كەوتن.
– : الجَماعَة/ كۆمەڵ.
شَقّ الـ – : خالف جماعته/ لە كۆمەل لایدا، لێیان جیابووەوە.
شَقّ – الطاعَة: تَمَرَّد/ یاخی بو، هەڵی تیزان.
إنشقت – القوم: وقع الخلاف بينهم/ تێك چون، ناكۆكیان تێكەوت.
قرع لە الـ – نَبَّهَهُ/ ئاگاداری كرد، تێوەی ژەن.
قَشَّرَ لە الـ – : ابدى لە ما فی ضميره/ چی پێ بو (پێیوت، بۆی هەڵ رشت).
القی المسافر الـ – : بلغ موضعه/ گەیتشە جێ.
القی – الترحال: اقام/ لایدا، هەڵیدا.
لَيِّن الـ – : رقيقٌ حَسَن السياسة/ روخۆش، پیاوچاك.
صلب الـ – : عكس لَيِّن العَصا/ رەق، وشك، پیاوخراپ.
عصی:
عَصى. عَصا: ضِد اطاع/ لاساری كرد، بەلەسە بو.
– . عاصی. إستعصى على: تَمَرَّدَ/ یاخی بو.
إستعصى. تَعَصّى. إعتصى الأمرُ: اصبح صعباً/ گران بو قورس بو.
– . – المرضُ: لايُبْرَأ منه/ چاك نابێتەوە.
عِصيان. مَعْصِيَة: ضد طاعَة/ بەلەسە بون، لاساری، یاخی بون.
– . – : تَمرّد/ یاخی بون، یاخێتی، مان گرتن.
مُسْتَعْصٍ. مُتَعَصٍ: صَعب/ گران، قورس.
– . – : عُضال/ چاك نابێتەوە، دەرمانی نییە.
– . – : راسِخ مُتَمَكِّن/ بنج داكوتاو، رەگ قوڵ، جێگیر.
عاصٍ: ضد طائع/ بەلەسە، لاسار، سەر بە كۆیەنگ.
– : مُتَمَرِّد/ یاخی، سەرپێچ.
عصيب (فی عصب) عصيده (فی عصد)
عض:
عَضّ: امسك باسنانه و شَدّ/ بەقەپ گرتی، قەپی پیاكرد، گازی گرت، گازی لێ گرت.
– : الشيءَ: لزمه و استمسك به/ پێوەی لكا، پێوەی نوسا.
– به الزمان: إشتَدّ عليه/ رۆژگار (گەستی، رەق بو لە گەڵیا).
عَضَّض. عَضّ كثيراً/ بە قایم گازی لێ گرت.
– على اللجام: حَكَمَ عليه. لاكە/ جوییەوە.
عَضّ/ گاز، گازگرتن، قەپ پیاكردن.
عَضّه/ قەپێك، گازێك.
عَضّاض. عَضوض: كثير العَضّ/ گازگر.
مَعْضوض/ گاز لێگیراو.
عُضّ. عِضّ. عِضّة: نبات شائك/ دركەزی.
عُضّ: شعير، حنطة، اليابس من الحشيش/ گەنم، جۆ، پوش و پەلاش.
عِضّ: سيء الخلق، شرس، خبيث/ بێئابرو، در، دوپو.
عَضاض: مايؤكل/ خۆراك.
عِضاض: صبور/ بە ئارام.
عضب:
عَضَبَ: قَطَعَ/ بری.
– ه المرض: اقعده عن الحركة/ خستی، پەكی خست.
اعْضَب: مَشقوق الاذن/ گوێ دابڕاو.
– : مكسور القرن/ شاخ شكاو.
– : من ليس له اخ/ تاقانە، بێبرا.

– : من له يد واحدة/ قۆڵ برلو، یەك دەست، كۆڵ، گۆج.
– : من لا ناصِرَ له/ بێكەس.
عضد:
عَضَدَ. عاضَدَ عاوَنَ/ یارمەتی دا، پشتگیری كرد، دەستی گرد.
– . عَضِدَ: شكا عَضُدَهُ/ قۆڵی ئێشا، هاواری قۆڵی كرد.
– . إستَعْضَدَ الشجرة: قطعها/ بڕیەوە، هەڵیپاچی.
تَعاضَدوا: تعاونوا/ یارمەتی یەكتریان دا.
إعْتَضَدَ: تَعَضَّدَ: إحتَضَنَ/ باوەشی پیاكرد، گرتیە (خۆی، باوەش).
– به: إستعان و تقَوّی/ پێی پشت ئەستور بو، قایم بو.
عَضْد. مُعضِد: مُعِین/ یارمەتی دەر، پشتگیر.
– . تَعضید: مُعاوَنَة/ یارمەتی دان، پشتگیری، دەستگرتن، یاربو.
– : ناحیة/ ناوچە، كەنار.
عَضُد: ساعد/ باهو، بازو، باسك.
عَظم الـ – / ئێسقانی باسك، بەرەش.
فلانٌ عَضُدی ای مُعینی و ناصِرِی/ یارمەتی و پشتگیرمە.
مِعضَد: حدیده كالمنجل لقطع الشجر/ تەور، تەوراس.
مِعضاد: سكین كبیر/ كێرد.
عَضَد: قُوَّة/ هێز، تین.
– : الورق المنثور/ گەڵای وەریو.
عضل:
عَضَلَ. عَضَّلَ علیه: ضَیَّقَ علیه و مَنَعَهُ/ لێی تێك دا، نەیهێشت بیكا، دەستی بەسەراگرت، لێی قەدەغەكرد.
– . – المراة عن الزواج: حبسها و منعها/ نەیهێشت شوو بكات.
– به الأمْرَ: إشتَدَّ/ كارەكەی لێگران بو، باری گران بو.
عَضِلَ: كَبُرَ عضله/ ماسولكەكانی گەورە بو، بازوی ئەستور بو.
اعْضَلَ الأمْرَ: إشْتَدَّ و إستغلق/ روناكی تیا نەما، كارەكە گران بو.
– به الأمرُ: ضاقت علیه فیه الحیل/ كارەكەی لێ گران بو، هیچ شتێ كەڵكی نەبو، كەڵكی نەما.
– . تَعَضَّل الداءُ الأطباء: اعیاهم/ دەردەكە پزیشكی هیلاك كرد.
عَضَّلَت، اعْضَلَت المراة بولدها: عَسرَ علیها ولادتها/ بەگران و ناڕەحەت منداڵەكەی بو.
عَضِلٌ: قَویّ العضل/ باسك بەهێز.
عَضَلَة: واحدة عضل الجسم/ ماسولكە، ماینچە.
عَضَلی: مختص بالعَضَل/ ماسولكەناس، ماینچەناس.
– : مكون من العضل/ هەموی (ماسولكەیە، ماینچەیە).
– : قَویّ الجسم/ بەهێز، بەكار.
عُضال: شدید/ گران، ناڕەحەت، قورس.
داء – : لادواء له/ دەردی بێ دەرمان، درێژخایەن.
مُعْضِل: مُشكِل/ كێشاوی، گران، گیروگرفتاوی.
– : مُحَیِّر/ سەرسوڕهێنەر، شپرزەكەر، شڵەژێن.
– . عضل: شدید القُبح/ زۆر ناشیرین، سەگسار.
مُعْضِلَة: مُشكلة/ كێشە، گرفت، دیشوار، گرانی، گیروگرفت، ستەم، دەردی سەری.
عضم: العضم: مِذراة/ شەن.
عضو:
عُضو. عِضو: جزء من جسم/ ئەندام، ئەندامی لەش.
– . – : واحِد من جماعَة/ ئەندام، ئەندامی كۆمەڵەیەك، ئابونە.
– . – : طرف/ پەل.
– . – : قضیب/ ئەندامی نێرێتی، كێر.
اعضاء التناسُل/ زا ئەندام، ئەندامی زاوزێ.
عُضوی: آلی/ ئەندامی.
غیر عضوی. لا عضوی/ نائەندامی.
عُضویَّة (فی جمعیة)/ ئەندامێتی، ئابونە.
عطاء (فی عطو) عطّار، عطارد (فی عطر)
عطب:
عَطِبَ. إعتطب: تلف او هلك/ پەكی كەوت، لەناوچو، خراپ بو.

**عَطَبَ. اعْطَبَ**: **أتْلَفَ**/ خراپى كرد، پەكى خست، رزانى.

— . — : **اهلك**/ لەناوى برد، مرانى، هيلاكى كرد.

**عَطَّبَ الشراب**: **طَيَّبَهُ**/ خۆشى كرد.

**عَطَبَ**: **تَلَفَ**/ خراپ بون، پەك كەوتن.

— : **هَلاك**/ لەناوچون، وێران بون، هيلاك كردن.

**سريع الـ — سريع التلف**/ زو خراپ ئەبێ، زو پەكى ئەكەوێ.

**سريع الـ — : سريع الفساد**/ زو پيس ئەبێ، زو بۆگەن ئەكا.

**عُطبَة**: **ريح خِرقه او قطنه محترقة**/ بۆسۆ.

**عطر:**

**عَطِرَ. تَعَطَّرَ. إستعطر**: **تَطَيَّبَ**/ بۆنى دا لە خۆى.

— : **كان طَيِّبَ الرائحة**/ بۆنى خۆش بو، بۆن خۆش بو.

**عَطَّرَ**: **طَيَّبَ**/ خۆشى كرد، بۆن خۆشى كرد.

**تَعَطَّرَت البِنتُ**: **لم تتزوج**/ شوى نەكرد، مايەوە.

**عِطر**: **طيب**/ بۆنى خۆش، عەتر

— **الورد**: **ماء الورد**/ گولاو.

**عَطِرٌ. عطرى. زكى الرائحة**/ بۆن خۆش.

**مُعَطَّر**: **مُطَيَّب**/ بۆن خۆش.

**عَطّار**: **بائع العُطور**/ بۆن فرۆش.

— : **بائع العقاقير**/ داودەرمان فرۆش، وردەفرۆش، عەتار.

**عِطارَة**: **روائح عطرية**/ بۆن و بەرامە.

— : **عقاقير طبية**/ داودەرمان، دەرمان.

— : **حِرفة العطار**/ عەتار، داودەرمان فرۆش، وردەفرۆش.

**عُطارِد**: **اقرب نجم سيّار الى الشمس**/ ئەستێرەى زاوە.

**عطس:**

**عَطَسَ. عَطِسَ**: **اتته العطسة**/ پژمى.

— **الصُبحُ**: **لنار**/ شەبەقى دا، روناك بوەوە، رۆژبوەوە.

**عَطَّسَهُ**: **جعله يَعطس**/ پژمانى.

**عَطْس. عُطاس**/: پژمين.

**عَطسَة**: **اندفاع الهواء من الانف مع صوت**/ پژمە.

**عاطوس. ما يُعطس منه**: **نشوق**/ پژمەر، برنوتى، كوندوش.

**مَعْطَس. مِعْطَس**: **أنف**/ لوت، كەپو.

**عاطِس**: **صُبح**/ بەيان.

**عطش:**

**عَطِشَ**: **ضِد رَوِيَ**/ تينوبو.

— **اليه**: **إشتاق**/ بيرى كرد، ئارەزوى كرد.

**عَطَّشَ. اعْطَشَ**: **اظمأَ**/ تينوى كرد.

**عَطَش**: **ظَمَأ**/ تينوێتى.

**عَطِشٌ. عَطْشان. عاطِش**: **ضَمْآن**/ تينو.

— . — . — : **مُشتاق**/ تامزرۆ، ئارەزومەند.

**عطف:**

**عَطَفَ الى**: **مال**/ لاىدا، لاى كردەوە، پێچى كردەوە، وەرگەڕا.

— . **عَطَفَ**: **ثَنى**/ نوشتايەوە.

— . — **الشيء**: **اماله**/ خوارى كردەوە، لارى كردەوە، وەريگێڕا.

— **عنه**: **إنصرف**/ وازى لێ هێنا، دەستى لێ هەلگرت.

— **كلمة على اخرى**/ وشەيەكى پەيوەندكرد بە وشەيەكى ترەوە.

— . **تَعَطَّفَ عليه**: **رَقّ له قلبه**/ دڵى بۆ سوتا، بەزەيى پياهاتەوە.

**تَعَطَّفَ**: **إنحنى و مال**/ خواربوەوە، پێچى كردەوە، وەرگەڕا.

— **الثَوبَ و بالثوب**: **ارتدى به**/ لەبەرى كرد، لەخۆيەوە پێچا، خۆى پێ داپۆشى.

**إنعطف**: **إنثنى**/ نوشتايەوە، خواربوەوە، وەرگەڕا.

**تعاطف في مشيته**: **حَرَّك راسه و تمايل**/ بە لارو لەنجەو لارو لار رۆيى.

— **القومُ**: **عطف بَعضهم على بعض**/ بەتەنگ يەكەوە هاتن.

**إستعطف**: **تَوَسَّل**: **إلتَمَسَ**/ پاڕايەوە، لالايەوە، دڵيان بەيەكترى سوتا.

— ـه: **إستعطف خاطره**: **تَرَضّاه**/ دڵى هێنايەوە جێ، ئاشتى كردەوە، داواى لێبوردنى كرد.

عَطْف: إمالة/ چەمانەوە، نوشتانەوە.

— . إنعطاف: مَيل/ خواری، لاری، پێچ.

— . — : حَنو. شفقه/ بەزەیی، ئارەزو، دڵسۆزی، بەتەنگەوە هاتن، پەیوەندی، پەیوەستی، دڵ پێ سوتان.

عطف: جانب/ تەنشت، لا، ئەم سەرو ئەوسەر.

اداة او حرف الـ — / ئامرازی (پەیوەندی، یەك خەر).

عَطْفَة. مُنْعَطف/ پێچ، لاری، سەرەو خوارە.

— . زُقاق/ کۆلان، لاکۆلان، کوچە.

مَنْعَطَف الوادی: منحناه/ سەرولێژی، لێژی.

معْطَف. معْطاف/ پاڵتۆ، جرتە، ساقو، زرتە، قاپوت.

عاطف: اداة عطف/ ئامرازی پەیوەندی.

— : إزار/ پۆشاك، پێخەف.

— : واصل/ پەیوەندکار.

— : عطوف: شفیق/ دڵسۆز، بە بەزەیی، بەسۆز، میهرەبان.

عاطفَة: شَفَقَة/ خواستی دەرونی، دڵسۆزی، بە بەزەیی، سۆز، هەست.

عواطف. جمع عاطفه. جَرح العواطف: کسر الخواطر/ دڵ شکاندن.

عاطِفی. عَواطِفی/ دڵسۆز، بە بەزەیی، بەسۆز، سۆزی.

اعطاف. جمع عِطف: إبط، جانب/ بن باخەڵ، تەنیشت، لا، بن هەنگڵ.

عطل:

عَطَلَ. عَطِلَ من كذا: خلا مِنْهُ/ لێی پەتی بو، تیایا نیە، تیا نەبو.

— ت .— ت المراة: لم یکن علیها حُلی/ خشڵی پێوە نەبو، روت بو.

— الأجیرُ: بطل عن العمل/ لەکار کەوت، وازی لە ئیش هێنا، دەستی هەڵگرت.

عَطَّلَ الشیءَ: ترکه ضیاعاً/ فەرامۆشی کرد، خستیە پشت گوێ.

— : اعْجَزَ عن العمل/ لە ئیش وەستانی، نەیهێشت ئیش بکا، لەکاری خست، پەکی خست.

— : المراةَ: نزع حلیها/ خشڵەکانی (لێ کردەوە، پێ داکەند).

— : المجلس: اوْقَفَهُ لأجل/ ئەنجومەنی (راگرت، راوەستان).

— : عاق/ دوای خست، پەکی خست، وەستانی.

تَعَطَّلَ. بَقی بلا عمل/ بێ ئیش و بێکار دانیشت، پشوی دا.

— ت المدرسة: توقفت/ قوتابخانە کەوتە پشوەوە.

— ت الآلة: فَسَدَت/ پەکی کەوت، لەکار کەوت، خراپ بو.

عاطِل. عُطْل من كذا: خالٍ منه/ نیەتی، پێوەی نیە، لێی کراوەتەوە.

— : بدون عمل/ بێئیش، بێکار، هیچ ناکات.

— : مُتَوَقِّف. عاجز/ پەك کەوتو، کارناکات.

رَجُل — : لا أخلاق له/ بێئابرو.

إمراة — ـة: غیر شریفه/ بێئابرو، سۆزانی.

عُطْلَة: بقاء بلا عمل/ پشو، بێئیشی، بێکاری.

— : وقت الفراغ من العمل. إستراحَة/ کاتی پشو، رۆژە پشو، پەروا.

— مدرسیة/ پشوی قوتابخانە.

— كعطلة المحاكم و البرلمان: توقف عن العمل/ پشو، کاروەستان.

تعطیل: القول بعدم وجود إلاه، إنكار صفات الباری/ لاری بون لە بونی خوا.

— : إرجاء. تأجیل/ دواخستن.

— : تعویق/ تەگەرە تێخستن، کۆسپ دروست کردن، پەك خستن.

— المدارس: إستراحَة المدارس/ پشودان.

مُعَطَّل: بلا عمل/ بێ ئیش، بێکار.

— . متوقف عن العمل/ لەکار کەوتو، پەك کەوتو.

— : كافِر/ لاری لە بونی خوا، کافر، گومڕا.

معطال: مُعتاد البطالَة/ بێئیش، بێکار، تەمەڵ.

عطن:

عَطَنَ. عَطَنَ الجلدَ: القاه فی العطان/ دەباخی کرد، داوری پێوەکرد.

— الكتان و القنب: نَقَعَهُ لیهتری/ خوسانی تا بپروێ.

عَطِنَ. إنْعَطَنَ الجلدُ: وُضِعَ فی الدباغ/ دەباخ کرا.

عَطْن. تعطین/ دەباخ کردن، توك لێ بونەوە، توك وەرین.

تعطین القِنَّب/ خوساندن.

عِطان. مواد يُجْعَل فيها الجلد الى ان يتفسخ صوفه/ داړو، دهباخ، کهرهستهی پێسته خۆش کردن و

روتاندنهوهی توك، جهووت، مازو، گزگل.
عطا:
اعطي: ضِد اَخَذَ/ داى.
– : قدَّمَ/ پێشکهشی کرد.
– : مَنَحَ/ بهخشی.
– مثلاً/ نمونهی هێنایهوه.
تعاطي: تناول. اخَذَ/ وهری گرت.
– الأمرَ: قام به. خاضَ فيه/ خۆی تێ فرێدا، کردی.
– عملاً: مارسه/ کردی، پیشهیهکی کرد.
إستَعْطي. تَعَطّى: تَسَوَّلَ/ پاڕایهوه، دهروهزهی کرد، سوالّی کرد، دهستی پان کردهوه.
تَعاطِ: اخْذ او تناول/ وهرگرتن.
عَطاء. عطا. عَطيَّة: ما يُعطى. هِبَة/ خهلات، بهخشین، پێدان، دیاری.
– . – . – : ثمن مَعروض/ نرخ دانان.
مُعْطٍ: ضِد آخِذ/ بدهر.
معطاه: كثير العطاء/ بدهر، بهخشندهه.
إستعطاء: تَسَوُّل/ پاڕانهوه، دهروهزهکردن، سوالّ کردن، دهس پان کردنهوه.
مُستَعْطٍ: مُتَسَوِّل/ دهروهزهکهر، داواکهر، سوالّ کهر.
عظم:
عَظُمَ: خِلاف صَغُرَ/ گهوره بو، مهزن بو، زال بو.
– . اعْظَمَ الأمرُ عليه: صَعُبَ و شَقَّ/ گران بو، نارهحهت بو، دژواربو.
عَظَّمَ: فَخَّمَ و بَجَّلَ و كَبَّرَ/ گهورهی کرد، مهزنی کرد، رێزی لێنا.
تَعَظَّمَ. إستَعْظَمَ. تعاظَمَ: تَكَبَّرَ/ گهوره بو، خۆی گهوره کرد.
تَعاظَمَ الأمرُ: صار عظيماً/ کارهکه زۆر گهورهو گران بو.
إستَعظم الامرَ: رآه او عَدَّهُ عظيماً/ زۆر به گهورهو گران ماته پێش چاوی، گهورهی کرد، زلی کرد.
– ت الفتنة: إشْتَدَّت/ ئاژاوهکه زۆر زیادی کرد، تهنیهوه، خراپتر بو.

عَظْم: قصب الحيوان و الانسان/ ئێسك، ئێسقان.
– . عُظم الشيء: اكثره/ زۆرهکهی، بهشی زۆری.
عَظمي: كالعظم أو منه/ وهك ئێسك، ئێسکی.
هيكل – : مجموع العظام/ ئێسکه پهیکهر، ئێسك بهند.
عِظَمَ. عُظْم: ضد صِغَر/ گهورهیی، مهزنی.
– . – : اهميّة/ بایهخ، گرنگی.
عَظَمَة: كِبر/ شانازی، لوت بهرزی، فیز، بایی بون، تهنتهنه، دهبدهبه.
– : جلال/ مهزنی، گهورهیی، شکۆ، شکۆمهندی.
صاحِب الـ – / خاوهن شکۆ.
مرض الـ – : جنون العظمة و الاضطهاد/ خۆ به گهورهزانین، دهردی خۆ به زل زانین.
عظيم: ضِد صغير/ گهوره، کهته، زل.
– : جليل. هام/ مهزن، گرنگ، شکۆمهند، شکۆدار.
– : فاخِر/ نایاب، نادیده.
– النفس او الأخلاق/ جوامێر، رهوشت بالاّ.
عظيمة مُعَظِّمَة: مُصيبة شديدة/ بهلاّی گهوره، کارهسات.
تَعاظُم: تَفاخُر. تَكَبُّر/ لهخۆبایی بون، فیز، ترۆفین.
تعظيم: تَفْخيم/ مهلّ دان، گهوره کردن.
مُعْظَم: اكثر/ زۆربه، بهشی زۆری.
– : غايَة. اقْصى/ ئهوپهڕی، ئهوپهڕهکهی.
مُعَظَّم: مُبَجَّل/ گهورهکراو، شکۆدار، شکۆمهند، بهرێز.
مُتعظّم: متكبر/ لهخۆبایی، لوت بهرز، فیزن، فیز.
عظي:
عِظاية. عِظاءَة: سِحْلِيَة/ مارمێلکه، شهوگهرد.
عِظة (في وعظ)
عف:
عَفَّ. تَعَفَّفَ: اصبح عفيفاً طاهِراً/ پاك بو، خاوێن بو، داوێن پاك بو.
– عن كذا: إمتنع/ وازی لێ هێنا، دهستی لێ مهلّ گرت.
تَعافَّ المريضُ: تداوى/ چاك بوهوه.
عِفّه. عَفاف: طهارَة/ پاکی، خاوێنی، داوێن پاکی.

– . – : نزاهَة/ راستی، دەست پاکی، دەس و دەروون پاکی.
عَفّ. عفیف: طاهر/ خاوێن، داوێن پاك، بێگەرد، پوخت.
– . – : نزیه/ راست، دەست پاك.
عفاف: دَواء/ دەرمان.
عفا (فی عفو)
عفج: مِعْفَجَة. مِعْفاج: مِضرب الملابس/ کەلا کوتك.
عفر:
عَفَرَ. اعْفَرَ. عَفَّرَهُ فی التراب: مَرَّغَهُ و دَسَّهُ فیه/ لەخۆلا تلانیەوە، گەوزانی.
تَعَفَّرَ. إنْعَفَرَ فی التراب: تَمَرَّغ فیه/ خۆی (گەوزان، تلانەوە).
– الشیء: تَتَرَّبَ/ خۆلاوی بو، خۆڵی گرت.
عَفَّرَ: تَرَّبَ/ خۆلاوی کرد، خۆڵی پێوە کرد، تۆزاوی کرد.
عَفَر. عَفْر. عُفار: تُراب/ خۆڵ، تۆز.
اَعْفَرْ. عَفَرْ. مُتَرَّب. بلون التراب/ خۆلاوی.
عُفْرَة. عفراء. شَعر القَفا/ یاڵ، یاڵ و دو، کەڵە موچ.
عفر. عُفَر: حَلُّوف. ذکر الخنزیر/ بەکانە.
عفریت: شیطان/ دێو، خێو، شەیتان، دەعبا.
– : کثیر الاحتیال/ فێڵ باز، تەڵەکەباز، ساختەچی.
مکان فیه – : مَسکون/ خێوی هەیە.
عَفرَتَة: شیطنَة/ تەڵەکەبازی.
عفش:
عَفَشَ: جَمَعَ/ کۆی کردەوە.
عَفَش. عُفاشَة: مالا خیر فیه/ بێکەڵك.
– المُسافر: امتعته/ کەل و پەلی رێبوار.
– المنزل: اثاثه/ کەل و پەلی ناوماڵ.
عفص:
عَفَصٌ البلوط: نتوء یحصل علی شجر البلوط/ مازو، سیچکە، گزگل.
عِفص: دواء قابض/ دەرمانی سك چوون.
عِفاص: غطاء القارورة/ سەرقاپ، دەمەوانە، سەر، دەمەڵبێن، تۆپەوانە، قەپاخ.
عفط:
عَفَطَ: ضَرَبَ بشفتیه/ جرتی (لێدا، کەن، کێشا).
عافط. عَفیط: ضَروط/ جرت لێدەر.
عَفْط: ضرطة بالشفتین/ جرت.
عفن:
عَفِنَ. تَعَفَّنَ: فَسَدَ/ خراپ بو، بۆنی کرد، بۆگەنی کرد، کەرووی هەڵ هێنا، پەپولەی هەڵ هێنا، گەنی، پرکی کرد.
عَفَنٌ. عُفونَة: فساد/ گەنین، خراپ بون، بۆن کردن، بۆگەن کردن.
– . – : کَرَج. فطر/ کەرو، پرك، پۆسان.
عَفِن. مُتَعَفِّن: فاسِد. کَرِج/ کەرواوی، بۆن کردو، بۆگەن.
عفونه الدم: مرض فی المواشی/ لارەشە، بۆگەنەتا.
– الظلف: دَخَس/ ئارنگ، شەلکە، تەبەق.
تَعَفُّن: فَساد/ بۆن کردن، خراپ بون، بۆگەن کردن، گەنین، (کەرو، پەپولە) هەڵ هێنان.
عفه (فی عف)
عفا:
عَفا عَنْهُ او عن ذنبه: صفح عنه/ لێی بورد، بەخشی، لێی خۆش بو، خوابەخشی.
– عن الشیء: امسك عنه/ وازی لێهێنا، خۆی لێ دورخستەوە، دەستی لێ هەڵ گرت.
– الله عنه: مَحا ذُنوبه/ خوا لە گوناهی خۆش بو.
– . عَفّا: مَحا/ سریەوە، نەیهێشت، لای برد.
– الله عما سَلَف: الذی فات مات/ هەرچی بو رۆی.
عافی. اعفی: شَفی/ چاکی کردەوە.
– . – : دَفَعَ عَنْه السوء/ دەردو بەلای لێدا.
تَعافی: شُفِیَ/ چاك بوەوە.
اعفاه من الأمر: بَرَّاهُ منه/ سەرفرازی کرد، لێی خۆش بو، بەخشی.
اَعْفی بِحَقِّه. وَفّاه إیّاه/ دایەوە، مافی خۆی دایەوە.
إستَعْفی: طلب العَفو/ داوای لێبوردن و بەخشینی کرد.
– : طلب إعفاءَه من امر/ وازی هێنا، نەیویست بیکا، داوای لێبوردنی کرد بۆ نەکردنی کارێك.
– : إستقال من العمل/ وازی لە ئیش هێنا.

عَفو. عَفاء: مَحو/ سرینەوە.
– : صَفح/: لێبوردن، بەخشین.
– : فَضل. مَعروف/ چاکە، پیاوەتی.
عَفواً: ارجو صفحكم/ ببەخشە، تکای لێبوردن ئەکەم.
– : من تلقاء ذاته/ لەخۆیەوە، خۆڕەس، لەخۆڕا.
– : إعتباطاً/ بەرێکەوت.
عافی: مُسامح/ بەخشندە.
– : طویل الشعر/ توك درێژ، توکن.
– : ضیف/ میوان، داواکار.
عافِیَة: صحّة تامّة/ تەندروستی چاك، ڕەنگ و بۆ.
– : قُوَّة/ هێز، توانا، تین.
إعفاء: صَفح/ لێخۆش بون، بەخشین، لێبوردن.
إستِعفاء: طلب العَفو/ داوای لێبوردن و لێخۆش بون کردن.
– من منصب: إستقالة/ ولزهێنان، دەست هەڵ گرتن.
عَفوی: تلقائی. من تلقاء نفسه/ خۆڕەس، لەخۆیەوە، لەخۆڕا.
عافٍ، مُعتَفٍ: مَمحوّ/ سڕاوە، کوژاوە.
عَفاء: تُراب/ خۆڵ، خاك، گڵ.
عق:
عَقّ الولدُ والدَهُ: عَصاه: شَقّ عصا طاعته/ یاخی بو، بەلەسە بو، بەقسەی باوکی نەکرد.
– ت. أعقت الفرسُ: حَمَلت/ ئاوس بو.
عَقّ. عاقّ: عاصٍ: ضِد بارّ/ سەرەڕۆ، یاخی، بەلەسە، خوێڕی.
عقیق. عَقّة: شَعر کل مولود/ قژی ساوا.
– : خرز احمر/ شیلان، گەوهەری شەو چرا، ئەقیق، سلێمانی.
– : وادی ضَیِّق/ چەم و جۆگەی تەسك.
عَقوق من الخیل: حامل/ ئاوس.
عَقعَق: طائر علی شکل غُراب. کندش/ خومە (ڕێژە، ڕژە)، قشقەرە، قەلەباچکە.
عقب:
عَقَبَ. اعقَبَ: جاء بعد/ لەدواییدا هات، بەدوایا هات.
عَقَّبَ علیه: نَدَّدَ علیه و بَیَّنَ اغلاطه/ پەرچی دایەوەو هەڵەکانی دەرخست، بەسەریەوە ئەچو.
– علی الحدیث: عَلَّقَ علیه/ بەدوایا دوا، قسەی کرد، لەسەری ڕۆی.
أعقَبَ الرجلُ: رجع مِن شَرٍ الی خیرٍ/ گەڕایەوە.
– نسلاً: أنجَبَ. خَلَّفَ/ وەچەو نەوەی خستەوە، منداڵی بو.
– الأمرُ: حَسُنَتْ عاقِبَتَه/ دوایار بو، ئاخر خێر بو.
– هُ: جازاهُ بخیرٍ/ پاداشتی بە چاکە دایەوە.
عاقَبَهُ بذَنبِه و علیه: قاصَّهُ/ سزای دا.
– : ناوَبَهُ/ نۆرەی کرد، نۆرەی لەگەڵ کرد، بەدوایا هات.
تَعاقَبَ: تَتابَعَ/ بەدوای یەکتردا هاتن، بەرودوا بون.
تَعَقَّبَ: تَتَبَّعَ/ دوای کەوت، بۆی گەڕا.
– : لاحَقَ و طارَدَ/ شوێنی کەوت، دوای کەوت، ڕاوەدوی نا.
– عن الخبر: شك منه/ دودڵ بو، پرسی کردەوە.
– من امره: ندم/ پەشیمان بوەوە.
عَقِب: تابع. لاحِق/ پاشکۆ، لەگەڵ، لەشوێن، بەدوایا.
– . عَقِب: مُؤَخر القدم/ پاژنە، پاژنەی پێ.
– . – : وَلَد/ منداڵ، وەچە، نەوە.
– . – . ولد الولد/ نەوە، منداڵی منداڵ، کوڕەزاو کچەزا.
جاء عَقِبَهُ و بِعَقِبِه: ای خَلفَهُ/ بەدوایا هات.
رَجَعَ علی عَقِبِه: ای الطریق التی جاء منها/ بە ڕێگەکەی خۆیدا گەڕایەوە.
وَطِیءَ عَقِبَه: مَشی فی اثره/ شوێنی کەوت، شوێن پێی هەڵ گرت، دوای کەوت.
سافر علی عَقِب الشهر: ای فی آخِره/ لەکۆتایی مانگدا ڕۆیشت.
راساً علی عِقِب/ ڕەهێڵ بون، سەرەوخوار، سەریەرەو خوار، سەرەنگری.
عُقب. عُقبی. عاقِبَة: آخِر/ دوایی، کۆتایی.
– . – . – : نتیجَة/ ئەنجام.
– السجارَة: فَلّ/ قنگە جگەرە.
– الشَمعه و قلم الرصاص.. / بنەمۆم، قنچکە قەڵەم، پاش ماوە.
عَقَبَة: عائق/ تەگەرە، کۆسپ.
– : الطریق فی الجبال/ ڕێگەی ناو شاخ، ڕێگەی سەرەو ژورە.

عُقاب: كاسِر/ دالّ، رەش دالّ، دالاش، بازۆری، خەرتەل، داڵە كەرخۆر.
– ملحی: أباذقن/ دالاش.
عُقْبَة: مُناوِبَة/ نۆرە.
– : آخر/ پاشماوە، دوامین.
عِقاب. عُقُوبَة: قَصاص/ سزا.
قانون العقوبات/ یاسای سزا.
مُعاقِب: مُوَقِّع القصاص/ سزادەر.
– : متناوِب/ نۆرەگر.
– : آتٍ بَعد/ ئەوی تر، دوای ئەو.
مُعاقبة: إیقاع القصاص/ سزادان.
عَقِب: تالٍ/ ئەوی تر، دوای ئەو.
– ذلك: بَعد ذلك/ دوای ئەو، پاشان.
– الباب: الذی یدور علیه/ گرێژەنە.
تَعَقُّب: تَتَبُّع/ لەسەر رۆین، بەدوادا گەڕان، شوێن كەوتن.
– : مُلاحَقَة و مَطارَدَة/ شوێن كەوتن، دواكەوتن.
تعاقُب: تتابُع. توالٍ/ یەك لە دوای یەك، دوابەدوا.
بال – بالتتابع. علی التوالی/ بەدوای یەكدا، بەرودوا.
مُتعاقِب: مُتتابِع/ یەك لە دوای یەك، دوابەدوا.
– : مُتوالٍ/ نۆرە.
عاقِبَة: نَسْل/ وەچە، نەوە.
– الشیء: نتیجته/ ئەنجام، ئاكام، ئاكامی شت.
یعقوب: ذكر الحجل/ نێرە پۆڕ.
عُقبول: بَقایا العلّة أو العَداوة/ كۆنەقین، پاش ماوەی دەردو ناخۆشی.
– : مایَخرُج علی الشَفَة بعد الحُمّی/ تامیسك.
عقد:
عَقَدَ. عَقْدَ: ضِد حَلَّ/ گرێی دا، بەستی.
– البیعَ أو العَهْد: أقَرَّ/ برانیەوە، بەستی، بڕیاری لەسەر دا، سەلماندی.
– الصفقة: إتفق/ پێكی هێنا، بەستی.
– الخیط: جَعَل فیه عُقدَة/ گرێی دا، گرێی تێخست.
– البناء: عمل السَقْف/ سەری گرت.
– النیَّة أو العزم: عَزَم علی. نوی/ بڕیاری دا، پەیمانی دا.

– علی المراة. إقترن بها/ مارەی كرد، مارەی ژنەكەی بڕی، بو بە هاوسەری.
– جلسة: إجتمع/ كۆڕی گرت، كۆبونەوەی كرد، كۆبوەوە.
– قرضاً: طلب/ قەرزی كرد.
– فصلاً: كَتَبَهُ/ نوسیەوە.
– علی الشیء: عاهَدَه/ پەیمانی دا، پەیمانی بەست، گفتی دا.
– عنقه الیه: لجأ/ پەنای بردە بەر.
– الزهرة اصبحت ثمراً/ گرتی، بەری گرت، هەڵی پێچا.
– ناصیتهُ: قَطَّبَ جبینهُ/ ناوچەوانی گرژ كرد، مۆن بو، خۆی مۆن كرد.
– لسانَهُ: اسكنه/ زمانی بەست، بێدەنگ بو.
عقدوا الخَناصِر: إشتبكوا/ باوەشیان كرد بە ناو قەدی یەكتردا، دەستیان دایە یەخەی یەكتری، جنگیان كرد بەیەكدا.
عَقَّدَ الأمْرَ: لَربَكَهُ/ كارەكەی (شێوان، ئاڵۆزان)، پەشێوی كرد.
– الكلام: تكلم بغُموض/ بە نهێنی و نادیار دوا، دای بەسەر یەكدا.
عَقِد لسانُه: إحْتَبَس/ زمانی بەسترا.
تَعَقَّدَ. إنْعَقَدَ. عَقَد اللبَنُ: تَخَثَّر/ بزركا، خەست بوەوە.
– . – : ضِد إنْحَلَّ/ گرێدرا، بەسترا.
– . – : الأمرُ: إرتبك/ ئاڵۆزا.
إنعَقَد المَجْلِسُ: إجتمع/ كۆبونەوە، كۆڕگیرا، كۆڕدانیشت.
تَعاقَدَ مَعَهُ: إتَّفَق مَعَهُ/ رێك كەوت لەگەڵی، پێك هات.
إعْتَقَدَ: صَدَّقَ/ باوەڕی كرد، بڕوای كرد، سەلماندی.
عَقْد: ضِد حَلّ/ گرێدان، بەستن.
– : إتِّفاق مُدَّوَن/ بەڵێن نامە، قەواڵە.
– : حَلَقَة/ بازنە.
– إیجار: إتفاق مدَّون/ بەڵێن كرێ، رێك كەوتن نامەی كرێ.
– المُلْكِیَّة: حُجَّة/ تاپۆی رەش، سەنەدی تاپۆ، موڵك نامە.
– من الأعْداد: عشَراتها/ دەیەكان.
– من السنین: عشر سنوات/ دە ساڵان.

— من بناء: قَوس/ تاق.
عُقدَة: موضع العقد من الحبل/ گرێ.
— : مكان كثير الشجر و الكلأ/ دارستان، سەوزایی.
— من كل شيء: وجوبه و احكامه و ابرامه/ بەستن، دیاری کردن، ساخ کردنەوە.
— نفسيَّة/ گرێخۆ، خۆپەستی.
— : غُدَّة/ لو، ئالو.
— في خَشَب/ گرێی دار.
— : مُشكلَة/ کێشە، ئالۆزی.
— : لُغز/ مەتەڵ.
عقيد. مُعاقد. مُتَعاقد: مُعاهِد/ بەڵێن بەست.
— : رتبه عسكريَّة/ سەرهەنگ، کۆلۆنێل.
— : غليظ/ خەست، تونگ، بزرکاو.
— : مُخَثَّر بالغلي/ بزرکاو، گرێگرێ، خەستەوە بو.
إعتقاد: تَصديق/ باوەرکردن، برواکردن.
— : إيمان/ ئایین.
— . مُعتَقَد: رأي/ باوەر، بروا.
مُعَقَّد: مُشَبَّك/ ئالۆز، ئالۆزاو، ئالۆزکاو، پێکاچو.
— : ذو عُقد/ گرێگرێ، گرێیاوی، گرێن.
— : ضِد مَحلول/ گرێدراو، بەستراو.
— : ساحِر/ جاودباز.
مَعقود: مَربوط/ پێچراو، گرێدراو، بەستراو.
— اللسان/ زمان بەستراو.
بناء — : مُسَقَّف/ سەرگیراو، خانوی سەرگیراو.
اعقد: من كان في لسانه عقدة/ زمان قورس، زمانی ئەیگرێ.
— : ماكان به عُقد/ گرێیاوی، پرگرێ.
متعاقدون/ بەڵێن بەستان.
عقيدة الإنسان: مَذهَبُه/ باوەر، ئایین، بیروڕای مرۆڤ.
عُقد: قِلادَة/ ملوانکە، ملیوانە، خەناوکە، گەردانە.
— من الخرَز/ تەزبیح، بەرمور.
عُنقود: عِذق/ مێشو، زەنگاڵ.
عقر:
عَقَرَ: جَرَحَ/ بریندارى کرد، بری، بریندار بو.
— : عَضَّ/ گازی گرت.

— ت الأنثى: صارت عاقراً/ بو بە نەزۆك، لە سك چوەوە.
عَقُرَت الأنثى: كانت عاقراً/ نەزۆك بو، سك ناکا.
— الأمرُ: لم يُنْتِجَ عاقبةً/ بێئامانج بو، هیوادار نیە.
عاقَرَ الشيءَ: لازمه و ادمَنَ عليه/ خوی پێوە گرت، فێری بو.
اعْقَرَ. اندهش/ وری کرد، سری کرد، سەری سوڕمان، سەرسامی کرد.
تَعَقَّر. إعْتَقَرَ ظهر الدابة: اصابه جرح/ بریندار بو.
عَقور: عَضّاض/ گازکر.
عُقْر. عَقارَة: عُقم/ نەزۆکی.
— الدار: وسط الدار/ ناوەڕاستی خانو.
— . عاقِر: عقيم/ نەزۆك، وەجاخ کوێر.
— القَصَب و امثاله: عُقْدَة/ گرێ.
عاقِر: امرأةٌ عاقِر: لم تَلِد/ ئافرەتی نەزۆك، منداڵ نابێ.
— : رجل عاقِر: لايولد ولد/ پیاوی نەزۆرك، وەجاخ کوێر.
عقار: مُلك ثابت/ خانوبەرە، ساختمان.
عقاري: ذو ملك/ خانودار، خاوەن خانو.
رَهْنٌ — / بارمتەی خانوبەرە.
مَصرَف — / بانکی خانوبەرە.
عَقار: دَواء/ دەرمان، داودەرمان.
— : الصبغ الاحمر/ خومی سور، بۆیەی سور.
عقيرة: صَوت/ دەنگ.
رَفَعَ عقيرته: رفع صوته/ دەنگی (بەرز کردەوە، هەڵ بری).
عقرب: ام عريط، ام ساهر: دويبه سامَّة/ دوپشك.
— الساعَة/ سەعات ژمێر.
— الدقيقة/ دەقیقەژمێر.
— الثانية/ چرکەژمێر.
باتجاه — الساعَة/ ڕاستەخول.
عكس — الساعَة/ چەپەخول.
عَقارِب: شَدائد/ بەلا، قوڕت، کارەسات.
مُعقرَب: مُعَوَّج/ خوار، چەماوە، کوور، چەوتاوە، لار.
عقف:

ع

لَيْسَ: لا/ نا، نە، نەء.
– إلاّ: فقط/ تەنها.
– في مكان ما/ لە هيچ كوێيەك.
ليف:
لَيَّفَ: غَسَل بالليفَة/ بە لفكە خۆی شت، لفكەی لەخۆیدا.
ليفَة: خَيْط ليفي/ ريشاڵ.
– : قطعة من ليف النخيل/ ريشاڵ و لفكەی دارخورما.
– الإستحمام. لوفة/ لفكە.
مُلَيِّف: من حرفته حك المستحمين بالليف/ ناتری حەمام، پشت شۆر.
ليفي: كالليف. ذو الياف/ ريشالآوی.
ليف: قشر النخيل/ توێكڵ و لفكەی دار خورما ريشاڵ.
ليق:
لاقَ به: ناسَبَهُ/ لێی هات، بۆی بو، فيتی بو، بۆی گونجا، بۆی شيا، پڕ بەپڕی بو.
لَيَّقَ: لَيَّنَ/ نەرمی كردەوە، شلی كردەوە.
مايَليق ان تَفْعَل كذا: لايُحْسِن و لايُناسِب/ لێت نايەت بيكەی، جوان نيە، بۆت ناشێ.
هذا امْرٌ لا يليق بك و لا يَلِقُك: لا يُناسبك/ ئەم كارە بۆ تۆ جوان نيە، بۆت ناگونجێ، بۆت ناشێ.
لَيْق. لياقَة: مُناسَبَة/ لێهاتن، گونجان، لەباربون، پڕبەپڕ.
لياقَة: حُسْن الذوق/ جوان پۆشی، جوان كردار، جوان هەڵبژاردن، لێهاتن، لێوەشانەوە.
لائق: موافِق: مُناسِب/ گونجاو، لێهاتو، لەبار، شياو، لێوەشاوە، شايان، دروست.
غير – : غير موافق. غير مُناسب/ نەگونجاو، لێنەهاتو، نالەبار، نەشياو، ناشايان.
ليقة الدواة: قُطنَة المحبرة/ پارچە پەڕۆی ناو شوشەی مەرەكەب، ليقە.
ليل:
لَيْل: عكس النهار/ شەو.
لَيْلَة: واحدَة الليالي/ شەوێك، يەك شەو.
– : سَهْرَة/ شەو رابواردن.
ليلة ليلاء. ليل لائل: طويلة. شديدة السواد/ شەوی درێژ، شەوەزەنگ، تاريك و نوتەك.
اللَّيْلَة: هذه الليلة/ ئەم شەو.
لَيْلي: عكس نهاري/ شەوی، هی شەو، شەوانەيی.
لَيْلاء: طويلة شَديدَة السواد/ شەوی درێژی زۆر تاريك، شەوە زەنگ، نوتەك، ئەموستەچاو.
لَيْلى: الخمر/ مەی، بادە.
– : نَشْوَة الخَمر/ مەستيی مەی، مەستێتی.
أم – : الخمر السوداء/ مەی، مەی رەش، رەش مەی، شەرابی ترێی رەش.
ليم:
لِيْم: صُلح/ ئاشتی، رێك كەوتن.
– : شَبَه. مَثيل/ هاوشێوە، هاورەوشت، لەيەك چون.
لَيْمون: شجر و ثمر/ ليمۆ.
– حامِض/ ليمۆی ترش.
– حُلو/ ليمۆی شيرين.
ليمونات/ مزرە مەنی.
لين:
لانَ: ضد خَشُن/ ساف بو، لوس بو.
– : ضد صَلُب/ نەرم بو، شل بو، نەرم و شل بو.
– : رَضَخَ/ ملیدا، قايل بو، نەرم بو، تاو بو، ملی درێژ كرد.
لَيَّنَ الانَ: جعله لَيِّناً/ نەرمی كرد، شلی كرد، تاوی كرد.
– . – البطن: سَهَّل البطن/ سكی دەرچوان، رەوانی كرد.
لايَنَ: لاطَفَ/ روخۆشی نواند، نيانی كرد، نەرم و نيان بو.
لَيِّن. لَيْن: ضد قاسٍ/ نەرم، شل، مڵ، نيان، نەرم و شل.
– . – : مَرِن/ روخۆش، ئاسان، بێزيان، نيان.
– . – : مطواع/ گوێرايەڵ، هۆگر، بەقسە ئەكا.
لين. لِيُونَة/ نەرمی، شلی، نيانی.
– : إسهال البطن/ سك چون، رەوانی، بەلەفيرە.
– : تساهل. رفق/ نەرمی، نيانی، بەزەيی، دڵنەرمی.
مُلَيِّن: مُخَفِّف/ نەرم كەر، نەرم كەرەوە، شل كەرەوە.
– البطن: دواء مُلَيِّن/ دەرمانی رەوانی.
ل:
لِيَّة. إليَة الغَنَم/ دوگ، دوگی مەڕ، دونگ

مابون (فی إبن) ماتم (فی اتم) ماثرة (فی اثر) مادبة (فی ادب) مئذنه ماذنة (فی اذن) مارب (فی ارب) مازق (فی ازق) ماساة (فی اسو).

ماق: مَئِقَ الصبی: نَشَجَ/ هەنسکی دا، گریا.

– الرجل: كادَ يَبْكی/ دڵی پڕ بو، هاکا بگری.

مَأقَة: نشیج/ هەنسك دان، گریان، دڵ پڕ بون.

مام:

مَأمَأ الخروفُ: ثُغی/ باڕانی، باعانی، باعەباعی کرد.

مَأمَأة: ثُغاء. صوت الغنم/ باڕە، باڕەبار، باعەباع.

مان:

مأنَ. مَوَّنَ: إدَّخَر/ ئازوخەی خست، تفاقی خست.

مَؤُونه: مُؤْنَة: قوت/ ئازوخە، تفاق.

مَأنَة: السُرَّة و ما حولها من البطن/ سك، ورگ، دەوری ناووك.

مای:

مئة. مائة: عشرعشرات/ سەد.

خَمْسُ – / پێنج سەد.

فی ال – / لەسەدا.

مِئَوی / سەدی.

ما:

ما: ماذا/ چی.

– فَعَلَ: ماذا فَعَلَ/ چی کرد.

– دُمْتُ حَیّاً/ تا زیندوم، تا کو زیندوم، هەتا ماوم.

– اجْمَلَهُ/ چەند جوانە.

– قرات: لم اقْرَأ/ نەم خوێندەوە.

– لَمْ/ تا، تاكو، تاكونێ، هەتاكو.

اما رأيْتَ/ ئایا نەت دی.

جاء لأمر ما/ بۆ کارێك هاتوە.

ماءٌ (فی موه) مائده (فی مید) مائع (فی میع) مات (فی موت) ماج (فی موج) ماحك (فی محك) ماخور (فی مخر) ماد (فی مید) مادّة (فی مدّ) ماذا (فی ذا) مارس (فی مرس) ماسّ (فی موس) ماسوره (فی مسر) ماش (فی موش) ماصول (فی مصل)

ماعون (فی معن) ماكنه (فی مكن) مآل (فی أول) مال (فی مول) مال (فی میل) مالح (فی ملح) مباح (فی بوح) مباراة (فی بری) مباشر (فی بشر) مبال

م

(فی بلی و بول) مبتسر (فی بسر) مبرد (فی برد) مبلغ (فی بلغ) مبهم (فی بهم) متاع (فی متع) متباین (فی بین)

مت:

مَتّ: مَدّ/ درێژ بو، کشا، درێژی کرد، کشانی.

– إلیه بِصِلَةٍ: وصل الیه قرابَة/ خزمایەتی هەیە، بەخزمایەتی ئەیگاتێ.

ماتّة. مَتات: قَرابَة/ خزمایەتی، خوێشایەتی.

متر:

مِتر: مقیاس طول/ مەتر، ۱۰۰ سم.

– مُربَّع/ مەتر دوجا.

– مُكعَّب/ مەتر سێجا.

متراس (فی ترس) متساهل (فی سهل) متساوٍ (فی سوی) متسع (فی وسع) متسق (فی وسق) متشائم (فی شام) مُتَشَرِّع (فی شرع) متواضع (فی وضع) متضلع (فی ضلع) متطوع (فی طوع)

متع:

مَتَع بالشيء: ذَهَبَ به/ بردی، بردی و ڕۆی.

– الشيءُ: طال/ درێژ بو، فراوان بو، درێژ بوەوە.

مَتَّعَ الشيءَ: أطال/ درێژی کردەوە، فراوانی کرد.

– . أمْتَعَ: جعله يَستَمْتِع/ وای لێ کرد رابوێرێ.

– المرأة المُطَلَّقَة: أعطاها مُتْعَةً/ مافی خۆی دایە.

– ـهُ الله: أطال عمره/ خوا تەمەنی درێژ کرد.

– ـهُ الله بكذا: صَيَّرَهُ يَنْتَفِع و يَتَلَذَّذ/ خوا گوزەران و خۆشی پێ بەخشی.

تمتَّع. إستَمْتَعَ به و منهُ: تَهَنَّأَ. إستمتع و تلذذ/ خۆشی لێ بینی، پێی رابوارد، لەگەڵی رابوارد،

– بماله: عاش به هنيئاً/ باش پێی ژیا، خێری لێ بینی.

ماتع: طويل/ درێژ، فراوان.

– : جَيِّد/ چاك، باش، زۆرباش.

مُتعَة. تَمَتُّع. إستمتاع: مَسَرَّة/ رابواردن، خۆشی، خۆش رابواردن.

– المرأة: مُتعَة الطلاق/ كەل و پەل و شت و مەكی ئافرەتی تەلاقدراو.

زَواج – / ژن هێنانی موقعە، ژن هێنان (بۆ ماوەیەك، بۆ رابواردن)، موتعە.

مَتاع. امْتِعَة: ممتلكات، كل ما يُنتفع به/ بارگە، كەل و پەل، هەمو شتێكی بە كەڵك و سودگەیەن.

– : كل ما يلبسه الانسان أو يبسطه/ بەرگ، پۆشاك، راخەر، پێخەف.

– و امتعه البيت/ كەل و پەل و پێویستی ناوماڵ، بیتاك.

– و - السفر/ كەل و پەلی رێبوار.

سَقْطُ الـ – نُفايَة/ هەمو شتێكی بێكەڵك، كەل و پەلی فڕێ دراو، پیسی ناو ماڵ.

متعصب (فی عصب) متفاوت (فی فوت) مُتَقِد (فی وقد) مُتَّكا (فی وكأ)

متك:

مُتْك (فی الزهرة)/ پۆرگ، كەپوی نێرەكی.

متن:

مَتُنَ: صَلُبَ و قَوِيَ/ (رەق، بەهێز، قایم، پتەو، توند، جێگیر) بو.

مَتَّنَ الشيءَ: صَيَّرَهُ متيناً. صَلَّبَهُ/ (رەق، بەهێز، پتەو، توند، قایم، جێگیر)ی كرد.

– لَه فی اللعب: قال له تَقَدَمَنی فی اللعب الحَقَ بك/ قانگی (دایە، بۆ داكرد) تەرحیدایە، پێش كەوە پێت ئەگەم.

مَتين: يَتَحَمَّل: صَلب. قَوِيّ/ قایم پتەو، بەهێز، بەرگە ئەگرێ.

مَتانَة: صَلابَة. شِدَّة. قُوَّة. رسوخ/ قایمی، پتەوی، بەهێزی، توندی.

مَتْن: ظهر/ پشت.

– الطريق: وسط أو تَحَدُّبَهُ/ ناوەڕاست، چەقی رێگا.

– . متين: ثابت. قوى. صلب/ قایم، پتەو، بەهێز، توند، جێگیر، رەختە.

تمتين: تقوية/ (قایم، پتەو، بەهێز، جێگیر) كردن.

– فی الالعاب: بَيْع/ تەرح دان، قانگ (دان، بۆ داكردن).

**متناه** (فى نهى) **متناوب** (فى نوب) **مُتَّهَم** (فى وهم) **مُتَهَوِّر** (فى هور) **متواتر** (فى وتر) **متواز** (فى وزى) **متوالٍ. متوالى** (فى ولى) **متوان** (فى وتن)

**متى:**

**مَتى**/ كەی.

– : **لَمّا. حينما**/ لەكاتی، لەكاتێكدا، كە، كاتی.

**متيقظ** (فى يقظ) **مثابَة** (فى ثوب) **مثانه** (فى مثن) **مُثرٍ** (فى ثرو) **مِثقال** (فى ثقل).

**مثل:**

**مَثَلَ. ماثَل: شابَه**/ لێچو، لەوچو، وەكو ئەو بو، هاو.

– : **ظَهَرَ**/ دەركەوت، سەری دەرهێنا، هاتەدەر.

– **و مَثُلَ و تَمَثَّلَ بينَ يَدَيْه: حَضَرَ**/ لە بەردەمیا (وەستا، ئامادە بو، دەركەوت).

– . **مَثَّلَ. ماثَل به: شَبَّهَهُ به**/ وتی لەو ئەچێ وەكو ئەو وایە، پێی بەراورد كرد، بەوی چواند.

– – **به : نَكَّلَ**/ دەستی بڕی، تەفرەی دا، نوكتەی پێكرد.

– . – **به : شَوَّهَهُ**/ شێوانی، تێكیدا.

– . – **بالقتيل: شَوَّهَ جَسَدَهُ**/ لەشی كوژراوەكەی تێك و پێك دا، شێوانی.

– . – **التمثال: صَنَعَهُ**/ بت و پەیكەری (دروست كرد، تاشی).

**تَمَثَّل به: تَشَبَّهَ**/ لاسایی كردەوە، وەكو ئەوی كرد، چاوی لێكرد.

– **الشيء: تَمَثَّلَ له الشيءَ: تَصَوَّر. تَخَيَّل**/ وا هاتە پێش چاوی، وایهات بە خەیاڵا، هاتە پێش چاوی.

– **بالشيء: ضَرَبَه مثلاً**/ (بە نمونە، بۆ نمونە) هێنایەوەو باسی كرد.

**مَثَّلَ له: صَوَّرَ له**/ بۆی باس كرد، نەخشەی بۆ كێشا، تێی ئەگەیان، ئەی خستە پێش چاوی.

– : **نابَ عَن**/ نوێنەرێتی كرد، نوێنەری بو، لەجێی بو.

– : **اعطى مَثَلاً**/ نمونەی هێنایەوە.

– **رِوايَةً: عَرَضَها**/ ئەكتەری یا نوێنەری چیرۆكی كرد.

**تَماثَل الشيئان: تَشابَها**/ لەیەك چون، وەك یەك بون.

– **العليل من مرضه: قارَبَ الشفاء**/ نەخۆشەكە نزیكی چاك بونەوەیە، خەریكی چاك بونەوەیە، هەڵسا.

**إمتثل: خَضَعَ**/ ملی دا، رام بو.

– : **اطاع**/ گوێڕایەڵی كرد.

– : **قَبِلَ. سَلَّمَ**/ قایل بو، خۆی دا بە دەستەوە، رام بو، تاوبو.

– **الطريقة: إتَّبَعَها**/ پەیڕەوی كرد، لەسەر ڕێ و شوێنی ڕۆی، لاسایی كردەوە.

**مِثل. مَثَل: شَبَه**/ لەیەك چون، وەك یەك بون، چون یەك.

– . – . **كَمِثل: شبيه**/ وەك، وەكو، هەروەك، چون یەك، هاوچەشن.

**بالمِثل: كذلك**/ هەروەها.

**مِثلَما: كَما**/ وەك، هەروەك.

**و امْثالُه الذين يشبهونه**/ ئەوانەی لەخۆی (ئەكەن، ئەچن، وەك خۆی وان).

**مُقابَلَة المثل بالمِثل: إيثار**/ تۆڵە، تۆڵەسەندنەوە، هەق كردنەوە، داش بە داش، هەق بەهەق.

**مَثَلٌ: نموذَج**/ نمونە، وەك.

– : **قَولٌ مُمَثَّل بِمَضرَبِه**/ پەند، وتەی بەنرخ، قسە لەجێی خۆیدا.

– : **قول مأثور**/ قسەی نەستەق.

– **اعلى: مثال الكمال**/ نمونەی باڵا، نمونەی تەواوی بێكەم و كوڕی، نمونەیی.

– **تشبيه: قِصَّة مجازية**/ هیما چیرۆك.

**الطريقة المُثلى: الافضل**/ ڕێگەو ڕێبازی نمونەیی.

**مَثَلاً**/ نمونە، بۆ نمونە.

**على رأي المَثَل**/ هەروەك و تویانە.

**مِثال: عِبرَة**/ پەند.

– : **شَبَه**/ لێچون، وێنە، لەیەك چون.

– : **مقدار**/ بڕ، كێوڕ.

– **نموذج**/ نمونە.

– **بياني: توضيحي**/ نمونەی ڕون كاری.

**مِثالي: نموذجي**/ نمونەی تایبەتی، تایبەتی، نمونەیی.

– : **عِبَري. للعِبرَة**/ بۆ دەرس لێ وەرگرتن، بۆ پەند.

– : **تَخَيُّلي**/ بەخەیاڵ، خەیاڵ پڵاو.

مَثِيل: شبيه/ هـاو، لەيـەك چـو، هـاوجوت، هاوچەشـن، چونيەك، وەك.
– الشخص: ليم/ دوانە، لەيەك چو.
– : نظير/ وەك خۆی.
– : فاضـل/ گـەورە، بـەناوبانگ، ناسـراو، بێهاوتـا، شكۆمەند.
ليس لە – . لا – لە: فَريد/ بێهاوتا، هاوتای نيە.
مُثُلوِيَّـة. اِمْثِليَّـة: المـذهب التـصوری أو المثـالی/ فەلسەفەی نمونەيی، بير لێكردنەوە.
اَمْثَل: افضل. كَمال/ باشتر، چاكتر، تەواوتر.
رَجُـلٌ – : إمـراة مُثْلی/ پيـاو يـا ئـافرەتی بێهاوتـا و نمونەيی.
إمتثال: طاعَة/ پەيرەوی كردن، گوێرايەڵی، بەگوێكردن.
عدم – : عـدم طاعـة: عـصيان/ لاسـاری، يـاخی بـون، بەگوێ نەكردن.
تِمثال: صورة/ وێنە.
– : صوره مُجَسَّمَة/ پەيكەر.
– يُعْبَد: صَنَم/ بت.
– لعرض للازياء/ بوكە پەيكەر.
تمثيل: ضرب الأمثال/ نمونە هێنانەوە، قسەی نەستەق وتن.
– تـشخيص او نيابَة/ نوێنـەری، لـەبری بـون، لـە جياتی، نواندن.
– المَـسارِح/ نوانـدنی سەرشـانۆ، شـانۆگەری، ئەكتەری.
– روايَة/ چيرۆك نواندن.
دار الـ – : مَسْرَح/ شانۆ.
تَمْثيلِيَّة/ چيرۆك.
تَماثُل: تَشابُه/ لەيەك چون، وەك يەك بون، لەيەك چو.
– مـن المـرض: نَقَـه مـن المـرض/ چـاك بونـەوە، هەڵسان.
مُمَثِّل: نائب/ نوێنەر.
– الروايات/ ئەكتەر، تيات.
– سينمائی/ ئەكتەر.
مُمَثِّلَة/ ئافرەتی ئەكتەر، تيات.
مُماثِل: مُشابِه/ وەكو، لێك چو، هاوشێوە، هاوجۆر.
– : مُقابِل/ بەرامبەر، تۆڵە، هەق بەهەق.
مُماثَلَة: مُشابَهَة/ هاوشێوەيی، لەيەك چونی، وێ چون.
– : مُقابَلَة/ بەرامبەری، تۆڵـە سـەندن، چاوڵێ (كـردن، كەری).
مُمْتَثِل: طائع/ گوێرايەڵ، بەگوێ.
مَثّال: صانع التمثال/ پەيكەرتاش.
مَثالَة: فَضل/ پياوەتی، پياوچاكی، نمونەباشی، بەرزی.
ماثِلَة: نَجَفَة/ چل چرا.
تَمَثُّـل الطعـام: تَحَـوّل الطعـام بعـد هـضمه الی مـواد اخری/ گۆڕانی شێوەی خۆراك پاش هەرس بون.
مثن:
مَـثِنَ. مَـثَنَ: إشـتكی مثانتـه/ هـاواری ميزەڵانـی كـرد، ميزەڵانی (دەردی تێكەوت، هاتەنێش).
مَثَن: إلتهاب المثانَة/ دەردی ميزەڵان.
مَثانَة: كيس البول/ ميزەڵان.
مثوی (فی ثوی)
مج:
مَجّ الشيء: رماه من فَمِه/ لـە دەمـی فـرێدا، دەريهێنـا، هاوێشتی، تفی كردەوە.
– الشيءَ: رمی بە/ فرێيدا، دەست بەرداری بو.
مَجَّجَ الثَمرُ: طابَ/ پێگەيی، خۆش بو.
مُجاج. مُجاجَة: ريق/ تف، بەڵغەم، كەفی لالفاوە.
– النحل: شهد: عَسَل/ هەنگوين.
– السحاب: المطر/ باران.
– العنب: الخمر/ مەی.
ماج: من يسيل لعابه/ ليكن.
مُجاجَة: عُصارَة/ ئاووك، خۆشاو.
مجموج: مرمـی. مَنبـوذ/ فـرێدراو، نەويستراو، ئەفـەرۆز كراو.
مَجْمَجَ فی الكِتابة: شَخْبَطَ/ تێكەڵ و پێكـەڵ نوسـی، دای بەسەر يەكدا.
– فی كلامـه: مَغْمَغ. لَمْ يُبَيِّنـه/ منجەمنجی كرد، بە منجە منج قسەی كرد، هيچی (رون نەكردەوە، نەگەيان).
مُمَجْمَج: غير مَقـروء/ ناخوێنرێتـەوە، تێكـەڵ و پێكـەڵ. شەرە پشيلە.
مجاز (فی جون) مجال (فی جول) مجاناً (فی مجن)

مجد:

مَجَدَ. مَجُدَ: كان ذا مجد/ (شكۆدار، سەربەرز، خانەدان، خاوەن رابوردویەكی رون) بو.

مَجَدَ. امْجَدَ: عَظَّمَ/ گەورەی كرد، بەرزی كردەوە، رێزی لێنا.

— . — : اثنـى/ هەڵیدا، پیاهەڵدا، گەورەی كرد، هەڵیدا.

تَمَجَّدَ: تعَظَّمَ/ خۆی هەڵكێشا، خۆی بەزل گرت.

مَجـد: عـزّ. رِفْعـة/ شـكۆ، سـەربەرزی، خانـەدانیتی، پایەبەرزی.

مجيد. ماجد: جليل. فخم/ خاوەن شكۆ، بەرز، گەورە، خانەدان، شكۆدار، پایەبەرز.

امْجَد: افخم. اكثر مجداً/ شكۆدار تر.

تَمْجيـد: تبجيـل. مَـدح/ پیـا هـەڵدان، بەرزكردنـەوە، هەڵنان.

مجذاف (فى جذف) مجرم (فى جرم) مَجَرَّة (فى جَر) مجرور (فى جر) مَجَلّة (فى جل)

مجن:

مَجَنَ. تَمَجَّـنَ: مَـزَح و قَـلَّ حيـاءً/ گاڵتـەی ناشـیرین و بێئابڕوی كرد، لاقرتێی كرد، رەفتاری ناشیرینی نواند.

— : مَزَحَ/ گاڵتەی كرد، گەپی كرد.

— : غَلُظَ و صَلُبَ/ ئەستور بو، پتەو بو، رەق بو.

مُجون: مَزاح/ گاڵتە، گاڵتەو گەپ.

— : مَزاح سَمِجٌ/ گاڵتەی ناشیرین، قەشمەری، لاقرتێ، لۆترەوانی.

مَجَـان. مـاجِن: قليـل الحيـاة/ بێئـابڕو، چەقاوەسـو، روهەڵماڵراو.

— . — . مازح/ گاڵتەچی، قۆشمە، لۆترەوان.

— . مَجاني: بلا مُقابل/ خۆڕایی، بێ دراو، بەلاش.

مجاناً: بلا مُقابل/ بەخۆڕایی، بەبێ دراو، بە بەلاش.

مجنون (فى جن) مجهر (فى جهر)

مح:

مَحَّ امَحَّ الثوب: بلى/ رزی، كۆن بو، شڕ بو.

ماحّ: مَحٌّ: بالٍ/ كۆنە، شڕە، رزیو، پەڕپوت.

مُحٌّ: خـالص كـل شيء/ رۆن، دۆشـاو، ریـە، خۆشـاو، پوختە، رینگاو.

— البيض: صَفار البيض/ زەردێنەی هێلكە.

محا (فى محو) محار (فى حور) محال (فى حول) محام (فى حمى) محتاج (فى حوج) محتال (فى حول) مُحْتَدّ (فى حد) محتشم (فى حشم) محراب (فى حرب) محرمة (فى حرم) مُحسن (فى حسن) محَسَّه (فى حس)

محص:

مَحَّصَ. مَحَصَ: نَقَّى/ بژاری كرد، پاكی كردەوە، پوختی كرد، پەتی كرد.

— الرجل: إبتلاه و اختبره/ توشی كرد و كردی بە كوڵییەوەو پێی تاقیكردنەوە.

تمحص. إنْمُحَصَ: تَنَقَّى/ پاك بوەوە، پوخت بو، بژار كرا.

مُمَحِّص: مُدَقِّق فى امور الدين. حَنْبَلي/ لێكۆڵەرەوەو بەتەنگەوە بوی كاروباری ئایینی.

محض:

مَحَضَ. امحض فلاناً النُصحَ او الودَّ: صَدَّقهُ/ بڕوای پێكرد، دڵسۆزانە ئامۆژگاری و خۆشەویستی وەرگرت.

— هُ الثنـاء: مَدَحَـهُ/ پیاهـەڵ دا، پیاهـەڵ خوێنـد، هەڵیدا.

مَحُضَ: كان خالصاً/ پوخت بو، بێخەوش بو، پەتی بو، روت بو.

مَحْض: خالِص. صَريح/ پوخت، پاك، بێخەوش، پەتی، روت، قوح.

لَبَن — : خالص/ شیری بێخەوش، پوخت، چۆڕی شیر.

امْحوضَة: نصيحة خالِصَة/ ئامۆژگاری دڵسۆزانە.

محضر (فى حضر) محطة (فى حَط) محظور (فى خطر) مخطية (فى خطى) محفل (فى حفل) محفة (فى حفّ)

محق:

مَحَقَ: اهلك. ازال/ لەناوی برد، ریشەی دەرهێنا، وێرانی كرد، كاوڵی كرد، فەوتانی.

— : مَحى. ابْطَلَ/ كوژانیەوە، سریەوە، هەڵیوەشان.

— الحرّ الشيء: احرقه/ سوتا، گڕە بردی.

— الشيءَ: ذهب ببركته/ پیتـی نەهێشت، پیرۆزیەكەی برد.

**امْحَقَ المال: هَلَكَ**/ دارایی بە فیرۆدا، لەناو چو، بە فیرۆ چو، نەما، هیچ نەما.
— **القَمَرُ: دخل فی المحاق**/ مانگ (کەلی گرت، چوە کەلەوە)، ون بو.
**إنْمَحَقَ. إمَّحَقَ. إمْتَحَقَ. تَمَحَّقَ: إضْمَحَلَّ و إمَّحى**/ توایەوە، کەم بوەوە، ئاوا بو، لەناوچون سڕایەوە، نەما، فەوتا، وێران بو.
**مَحْق إبادَة**/ قەلاچۆ، لەناوبردن، کوشتن، فەوتان، نەهێشتن.
**مَحاق. مُحاق. مِحاق القمر: آخر الشهر القمری**/ مانگ لە کەلا بون، مانگ ون بون، کەل گرتن، پەناگرتن.
**القمر فی المحاق**/ مانگ لەو دیو کەلەیەوە، ونە، پەنای گرتوە.
**ماحِق: الصیف**/ هاوین.
— **: شدة الحر**/ قرچەی گەرما.
**یوم — : شدید الحر**/ زۆر گەرم.
**محك:**
**مَحَكَ. امْحَكَ. تَمَحَّكَ: نازع فی الکلام**/ بەناخۆشی و تورەیی و ناشیرینیەوە دواو گفت و گۆی کرد، شەڕی لێ ئەبوەوە.
— . — . — **: تمادی فی اللجاجة**/ (سور، هەتەر، ترن، کەللەرەق، قیرسچمە، لەوچەو ترق) بو.
**تَمَحَّكَ: حاوَلَ. راوغ**/ بە فێڵ و فەرەج بو، بەپێچ و پەنا بو، گزی کرد، ساختەی کرد.
**ماحَكَ. خاصَمَ**/ زویر بو، تێك چو، دژمنایەتی کرد، شەڕی نایەوە.
**مَحِك. ماحِك. مُماحِك: مُحِبّ العِراك و الخِصام**/ شەڕانی، شەڕفرۆش، ترن، کەللەرەق، گێرەشێوێن.
**مُماحكة: خِصام**/ دوشمنایەتی، تێك چون، شەڕ (کردن، فرۆشتن، نانەوە)، ناکۆکی، ئاشوب، ئاژاوە.
**مَحَكّ (فی حك) محکمة فی (حکم)**
**محل:**
**مَحَلَ. مَحِلَ. مَحُلَ. امْحَلَ المکانُ: اجْدَبَ**/ (روت، گروێ، روتەن) بو، هیچی تیانەما.
— . — . **بە: سَعى بە و کادَ**/ فێڵ و پیلانی لێکرد، هەڵی خەڵەتان.

**امْحَلَ المطرُ: إحْتَبَسَ**/ باران بڕا، نەما، بو بە بێ بارانی.
— **الارضَ: جعلها مَحْلَةً**/ (روت، گروێ، روتەن)ی کرد، هیچی تیا نەهێشت.
**تَمَحَّلَ الشيءَ: إحتال فی طلبه**/ بۆ فێڵ گەڕا، بە فێڵ بردی.
— **العُذْرَ: إعتذر. دبَّر العذر**/ پۆزشتی درۆی کرد، بیانوی درۆی هێنایەوە.
**ماحَلَ: تماحَلَ: کایَدَ و ماکَرَ**/ فێڵی کرد، گزی کرد، ساختەی کرد.
**ماحِل. مُمْحِل: اَجْدَبُ**/ روت، روتەن، گروێ.
— . **مَحول. مَحّال: مُدبِّر المکائد. خَدّاع**/ فێڵباز، تەڵەکەباز، ئاژاوەگێڕ، ساختەچی، دەستبڕ.
**مَحْل: جَدْب**/ روتەنی، گروێیی.
— **: قحط**/ بێبارانی، نەهاتی.
— **: جوع شدید**/ برسێتی.
— . **مِحال: خدیعَة**/ فێڵ، گزی، فروفێڵ، تەڵەکەبازی، ساختە.
**مَحالَة. لامَحالة: لابُدّ و لا حیلة**/ بێگومان، چار نیە، بڕوبیانوی ناوێ.
**محن:**
**مَحَنَ. إمْتَحَنَ جَرَّب و إختبر**/ تاقیکردەوە.
**مِحْنَة: تَجرِبَة بَلِیَّة**/ بەڵا، کارەسات، ناخۆشی، کوست کەوتن، چورتم، گێچەڵ.
**إمتحان: إختبار. تجربَة**/ ئەزمون، تاقی کردنەوە.
**مُمْتَحَن: مُستنطق المتقدم للامتحان**/ تاقی کراوە، تاقیئەکرێتەوە.
**مُمْتَحِن: فاحص. مُستَجْوِب**/ تاقی کەرەوە، تاقیئەکاتەوە.
**محی:**
**محا. مَحّى الکتابَة: مَسَحَها**/ سڕیەوە، کوژانیەوە.
— . — **: ازال الأثر**/ سڕیەوە، شوێنی ون کرد، جێگەکەی نەهێشت.
— . **إمَّحى. إمْتَحى. تَمَحّى: تلاشى و إضْمَحَلَّ**/ سڕایەوە، کوژایەوە، شوێنی نەما.
**مَمْحِي. مَمْحُو. مُزال**/ سڕاوە، کوژاوە، نەماو.

محو: شطب. إزالة/ سرینەوه، لابردن، کوژانەوه، کوژیونەوه.
مِمحاة. مَحّایَة: مَسّاحَة/ تەختەسڕ، کوژێن، لاستیکی خەت کوژانەوه.
محور (فی حور) مُحوِلَة (فی حول) مُحَیّا (فی حی)
محیص (فی حیص) محیط (فی حوط)
مخ:
مَخَّخَ. تَمَخَّخ. إمتَخَّ العَظَم: اخرج مُخَّهُ/ مۆخەکەی دەرهێنا.
مُخّ العظم: نُخاع/ مۆخی ئێسقان.
– : خالِص کل شيء/ پوخته، کرۆك.
– : دماغ/ مێشك، مۆخ.
مُخَیخ / مێشکۆکه.
مخیخ: فیه مُخّ/ مۆخی تیایه.
عَظمٌ – : فیه مُخّ/ ئێسقانێ که مۆخی تیابێ.
مخاض (فی مخض) مخاضَة (فی خوض) مَخاضَة (فی مخض) مختار (فی خیر) مُختال (فی خیل)
مخترع (فی خرع) مختصر (فی خصص) مُختَلّ (فی خل) مَخدع (فی خدع) مِخدَّة (فی خد)
مخر:
مَخَرَ: شقَّ/ دڕی، دایهێنا، دڕانی، هەڵیدڕی، دوو کەرتی کرد، کردی بە دوو کەرتەوه.
– ت السفینة: جَرَت فَشقّت الماء/ ئاوەکەی (بڕی، دوکەرت کرد).
ماخِرة: سفینة/ کەشتی، ئاوبڕ.
ماخور: بیت الدعارَة/ ماڵە خراپ، ماڵی سۆزانی.
مَخرَقَ: کَذِبَ/ درۆی کرد.
مخزن (فی خزن) مخصوص (فی خص) مخصی (فی خصی)
مخض:
مَخَضَ اللبَنَ: إستخرج زبدته/ کەرەو چەوریەکەی گرت.
– الشيء: حرَکَهُ بشدَّة/ رایوەشان، ژەندی.
– الرایَ: قَلَّبَهُ و. تَدَبَّر عواقِبَهُ/ زۆری لێ کوڵیەوه و لێکی دایەوه، بیری لە ئیستەیی و ئەنجامی کردەوه.
مَخِضَت مُخِضَت. تَمَخَّضَت الحامل: دنا وِلادتها و اخذها الطلق/ ژان گرتی، هاتە سەر کاسە، کاتی منداڵ بونی هات.
إمتَخَضَ. تَمَخَّض الجنین: تَحرّك فی البطن/ لە سکدا جولا.
– . – اللبن: تَحَرَّك فی المِمخَضَة/ ژەنرا، شلقەی هات.
مَخاض: طلق الولادة/ ژان گرتن، چونەسەر کاسە، سەردەستان ، کاتی منداڵ بون.
ماخِض: اخذها الطلق/ ژان گرتی، ژان ئەیگرێ، کاتی منداڵ بونێتی.
مخیض: لَبَن الخَضّ/ دۆ، ماستی ژەنراو.
مِمخَضّ اللبن. مَخّاضَة: وعاء الخَضّ/ مەشکە، ژەنەر.
مِمخَضَة: فَرّازَة/ کەرەگر.
مخط:
مَخَطَ. تَمَخَّطَ: اخرج المخاط من انفه/ چڵمی لە لوتی دەرهێنا، فنگی کرد، لوتی سڕی.
مَخَّطَ الولدَ. اخرج المَخاط من انفه/ لوتی بۆ سڕی، فنگی پێکرد.
مُخاط: مایسیل من الأنف/ چڵم.
– الشیطان: لعاب الشمس/ تەنافی شەیتان.
مُخاطی: لزج. غروی/ لینج، چڵمی، مڵی، هێلمی.
– القوام/ لیتەیی، مڵ.
غشاء – / توێژاڵی چڵمی، مڵ توێژاڵ.
مَخَط: قذف المخاط من الأنف/ فنگ کردن، فم کردن، خم کردن.
مَحمَل (فی حمل) مُخَیِّلَة (فی خیل)
مد:
مدّ. امَدّ: اعان و اغاث/ یارمەتی دا، پشتگیری کرد، دەستی گرت، (بە دەنگیەوه، بە دەمیەوه) هات.
– . – : امهَلَ/ مۆڵەتی دا، دوایخست، ماوەی دا.
– . – : الجُندَ: عَزَّز. قَوّی/ لەشکرەکەی بەهێز کرد و یارمەتیدا، بۆی نارد.
– الشيء و بالشيء: بَسَطَهُ/ رایخست، درێژی کردەوه، پانی کرد.
– عنقه: طوَّلَهُ و رَفَعهُ/ ملی درێژ کرد، بەرزی کردەوه.

– يَدَهُ: بَسَطَهُ/ دەستی (درێژ کرد، پان کردەوە).
– يَد المساعَدة (عطاه/ دەستی یارمەتی درێژ کرد، پێی دا، دایە.
– بَصَرَهُ: إتّسَعَها/ چاوی (زیت، زەق) کردەوە.
– الله عُمْرَهُ: اطاله/ خوا تەمەنی (دایە، درێژ کرد).
– الارض: سمدها/ پەینی (کرد، پێوەکرد).
– مائدَةً: بسطها/ خوانی راخست.
– النهرَ او البحر: زاد ماءهُ/ هەڵسا، ئاو هەڵسا.
– القلم: غَمَسَهُ/ قەڵەمەکەی کرد بە مەرەکەبەکەدا.
– جذراً في الارض: تَكَوَّن و تَأصَّلَ/ رەگی داکوتا.
– في المَشي: مَطا/ هەنگاوی درێژی نا.
– خطًا حديديا: بَنى: شَيَّدَ/ خەتی ئاسنی دامەزراند.
– طريقاً: بنى: شَيَّدَ/ رێگەی (لێدا، دروست کرد).
مَدَّدَ . مَدَّ: بَسَطَ/ فراوانی کرد، کردیەوە، رایخست.
– . – : أطال/ درێژی کردەوە.
– . – . أمَدّ الى الاسفل/ شۆڕی کردەوە، رایهێلا.
– . – . الجرحُ. تَقَيَّحَ/ تەنیەوە، تەشەنەی کرد، زەرد بو، کێمی کرد.
إمْتَدَّ. تَمَدَّدَ: إنبسط/ کشا، درێژ بوەوە، فراوان بو، تەنیەوە.
– الى/ درێژ بوەوە بۆ..
– في مَشْيَتِه: تَبَخْتَرَ/ خۆی (بادا، گیف کردەوە).
تَمَدَّدَ: ضد تَقَلُّص/ فراوان بو.
– : تَمَطّى/ کشا.
– : إستلقى/ راکشا درێژ بو، پاڵ کەوت.
إسْتَمَدَّ منه: تَلَقّى/ لێوەی وەرگرت، وەریگرت.
– فلاناً: طلب معونته/ داوای یارمەتی لێکرد.
مَدّ: بَسْط/ فراوان (کردن، بون).
– : إطالَة/ درێژ (کردن، کردنەوە)، کشان، کشاندن، شۆڕکردنەوە، رایەڵ کردن.
– البَحر: خلاف الجزر/ خێزاو، بەرزاو، سەرکردن، هەستانی ئاوی دەریا.
– وَجَزر/ خێزاو و نیشتاو، هەستان و نیشتنەوە.
– سَيْل/ لافاو، لێشاو.
– الطُرُق. بناء و تشييد الطرق/ رێگە لێدان، رێگا دروست کردن.

– : مَدَّة: علامة الهمزة/ ئا، هەڵکشاوی.
مَدَد: نَجدَة/ فریاکەوتن، بەهاوارەوە چون، پشتگیری کردن.
– : عَوْن/ یارمەتی دان، یاریدەدان.
مَديد: طويل/ درێژ، فراوان، ئەد.
عُمْرٌ – / تەمەنی درێژ، بەساڵا چون.
إمداد: إعانَة/ یارمەتی دان، پشتگیری کردن، دەستگرتن.
– : مَعونَة/ یارمەتی.
– : نجدة/ بەهاوارەوە چون، فریاکەوتن، بەهێزکردن.
إمتداد: مَدى/ ماوە.
– : طول/ درێژی، فراوانی.
– العمر/ تەمەن درێژی.
تَمَدُّد: ضد تقلص/ کشان.
– : إنبساط/ فراوان بون.
قابليَّة الـ – / توانایی کشان.
مُمْتَدّ. ممدود: مُنْبَسِط/ کشاو، درێژ بو، راکشاو، پاڵ کەوتو.
– . – : مستطيل/ لاکێشی، درێژ.
– : مُتَّسِع/ فراوان، گەورە.
مَدّاد. مادّ: سُطاح. ما إفترش من النبات/ روەکی راکشاو و پاڵ کەوتو.
مُدَّة من الزمان: بُرْهَة/ ماوە، کات، دەمە، تاو، بەین.
– : اجل. امَد/ ماوەیەکی دیاری کراو.
– قصيرة/ ماوەیەکی کەم، تاوێك.
في – كذا/ لە ماوەی.. ئەوەندەدا، لە ماوەیەکی ئاوەهادا.
لـ – : الى حين/ تا (بەینێك، ماوەیەك).
مُضي الـ – : مضى الوقت/ کات تێپەرین.
مضي – : تقادم/ ماوە بە سەراچون.
مُدّ: مكيال/ پێوەر، ئەندازە.
مَدَّة. امُدّة النسيج: سداة/ تان.
مِدَّة: قَيْح/ کێم، زوخ، زیچکاو، لیمان.
مِداد: حِبر/ مەرەکەب.
– : سَماد/ پەیین.
– : مِثال/ نمونە.
مادّة: جَوهَر/ ناوەرۆك، کرۆك.

– : مايُتَركَبْ منه الشيء/ كەرەستە، شت، شت و
ەك.
– : عُنْصُر/ توخم.
– : مكسب و عُمْلَة/ دەستكەوت و دراو.
– : بَند/ بەش، كەرت، بەند.
المادَّة الحيوية: جَبْلَة. المادَة التي تتكون منها الخَلِيَّة/ پرۆتۆپلازم، پێكهێنەری خرۆكەی زیندو.
مواد: جمع مادَّة/ شت و مەك..
– أوَّلِيَّة: أدوات ولوازم/ كەرەستە، كەرەستەی خاو.
– اللغة: ألفاظها/ وشەو دەنگی زمان.
– الاتفاق: فقرات الاتفاق/ بەندەكانی ڕێك كەوتن.
– البناء/ كەرەستەی خانو، پەردو.
مادِّي: ضِد مَعْنَوي/ شتكار، لە شت پێك هاتوە.
– : لا يؤمن بالروحانيات/ شتكار باوەڕ.
– : بخيل. شحيح/ پیسكە، ڕژد، پولەكی، پارەپیس.
– : دُنْيَوي/ جیهان پەرست، ژیان پەرست.
– : محب المكسب و المال/ پارە پەرست، دراو پەرست.
مادياً/ شتكاری.
مدار (في دور) مداس (في دوس) مُدام. مُدامَة (في دوم)
مدح:
مَدَح. مَدَّح. إمْتَدَح: أحْسَنَ الثناء عليه. ضِد ذَمَّ/ ستایشی كرد، هەڵی دا، هەڵیهێنا، پیا هەڵ دا.
تَمَدَّح: إفتخر/ خۆی هەڵكێشا.
مَدْح. مَديح: حَمْد. ثناء/ ستایش كردن، پیاهەڵدان، هەڵدان، هەڵنان.
مادِح: مُثْنٍ/ ستایشكار، پیاهەڵدەر، هەڵنەر.
– . مَدّاح: مُقَرِّظ/ شایەر.
مَمْدوح: حميد. محمود/ ستایشكراو، پیاهەڵدراو.
مَمادِح: عكس مقابِح/ پەسەند، ڕەوا، شت و كرداری بەجێ، پێچەوانەی ناڕەوا.
مدخنة (في دخن)
مدر:
مَدَر. مَدَّر المكان: طانَهُ/ قوڕاوی كرد.
تمَدَّر: تلَطَّخَ/ قوڕاوی بو.
مَدَر: طين/ قوڕ/ لیتە.
– . مَدَرَة: كتلة ترابية/ كلَمتك، كەرسەك، كەستەك.
أمْدَر: ضخم البطن/ ورگن، ورگ زل.
– . ممْدِر: مُطَيَّن/ قوڕاوی.
– : حَضَر. المُدُن و القُرى/ شار، گوند، لادێ، ئاوەدانی.
مَدَري: ساكن المَدَر/ دانیشتوانی شارو گوند، پێچەوانەی كۆچەری.
مدرسة (في درس) مُدَّعٍ (في دعو) مَدفع (في دفع)
مدمن (في دمن)
مدن:
مَدَن بالمكان: اقام/ نیشتەجێ بو، جێگیر بو.
مَدَّن المدائن: بناها/ شارو گوندی (دروست كرد، ئاوەدانی كردەوە).
– : حَضَّر/ ڕەفتاری جوانی (فێركرد، نواند).
تَمَدَّن: تَحَضَّر. تَهَذَّبَ/ ڕەفتاری جوان و بەجێی گرت، ڕاژەی شارستانیەتی فێر بو.
مدينة: بلدة كبيرة/ شار.
– السلام: بغداد/ شاری بەغدا.
مَدَنِيَّة. تَمَدُّن: حضارة.. عمران/ شارستانێتی، پێشكەوتن، ئاوەدانی.
مَدَني: حضري/ نیشتەنی، نیشتەجێ.
– : من أهل المدن/ شاری، دانیشتوی شار.
– : مُلكي. غير عسكري/ ناسەربازی، ئاسایی.
– : غير جنائي (في الحقوق)/ سوك، سوكە.
قانون – / سوكە یاسا.
مدي:
مادَى. أمْدَى: أمْهَلَ/ ماوەی دایە، مۆڵەتی دا، دوای خست، (حاپول، چاپولكی)دا.
تَمادي في الأمْر: بلغ غايَتَه/ بە (ئەنجام، مەبەست)ی خۆی گەیشت.
– في الأمر: دام على فعله/ لەسەری (ڕۆی، بەردەوام بو).
– : ذَهَبَ بعيداً/ زۆر ڕۆی، دوركەوتەوە.
مَدى: مَجال/ بوار، ماوە، دەرفەت.
– : بُعْد/ دوری.

– : مايُتَرَكّبُ منه الشيء/ کەرەستە، شت، شت و مەك.
– : عُنْصُر/ تۆخم.
– : مكسب و عُمْلَة/ دەستكەوت و دراو.
– : بَنْد/ بەش، کەرت، بەند.
المادّة الحيوية: جَبَلَة. المادّة التي تتكون منها الخَلِيَّة/ پرۆتۆپلازم، پێکهێنەری خرۆکەی زیندو.
مواد: جمع مادَّة/ شت و مەك..
– أوَّلِيَّة: ادوات ولوازم/ کەرەستە، کەرەستەی خاو.
– اللغة: الفاظها/ وشەو دەنگی زمان.
– الاتفاق: فقرات الاتفاق/ بەندەکانی رێك کەوتن.
– البناء/ کەرەستەی خانو، پەرنو.
مادِّي: ضد مَعْنَوِي/ شتکار، لە شت پێك هاتوە.
– : لا يؤمن بالروحانيات/ شتکار باوەڕ.
– : بخيل. شحيح/ پیسکە، رژد، پولەکی، پارەپیس.
– : دُنْيَوِي/ جیهان پەرست، ژیان پەرست.
– : محب المكسب و المال/ پارە پەرست، دراو پەرست.
ماديًا/ شتکاری.
مدار (في دور) مداس (في دوس) مُدام. مُدامَة (في دوم)
مدح:
مَدَحَ. مَدَّحَ. إمْتَدَحَ: احْسَنَ الثناء عليه. ضِد ذَمَّ/ ستایشی کرد، هەڵی دا، هەڵیدا، پیا هەڵ دا.
تَمَدَّحَ: إفتخر/ خۆی هەڵکێشا.
مَدْح. مَديح: حَمْد. ثناء/ ستایش کردن، پیاهەڵدان، هەڵدان، هەڵنان.
مادح: مُثْنٍ/ ستایشکار، پیاهەڵدەر، هەڵنەر.
– . مَدّاح: مُقَرِّظ/ شایەر.
مَمْدوح: حميد. محمود/ ستایشکراو، پیاهەڵدراو.
مَمادح: عكس مقابح/ پەسەند، رەوا، شت و کرداری بەجێ، پێچەوانەی نارەوا.
مدخنة (في دخن)
مدر:
مَدَرَ. مَدَّرَ المكان: طانَهُ/ قوڕاوی کرد.
تَمَدَّرَ: تَلَطَّخَ/ قوڕاوی بو.
مَدَر: طين/ قوڕ، لیتە.
– . مَدَرَة: كتلة ترابية/ گلمتك، کەرسەك، کەستەك.
أمْدَر: ضخم البطن/ ورگن، ورگ زل.
– . مَدِر: مُطَيَّن/ قوڕاوی.
– : حَضَرٌ. المُدُن و القُرى/ شار، گوند، لادێ، ئاوەدانی.
مَدَرِي: ساكن المَدَر/ دانیشتوانی شارو گوند، پێچەوانەی کۆچەری.
مدرسة (في درس) مُدَّعٍ (في دعو) مَدفع (في دفع)
مدمن (في دمن)
مدن:
مَدَنَ بالمكان: اقام/ نیشتەجێ بو، جێگیر بو.
مَدَّنَ المدائن: بناها/ شارو گوندی (دروست کرد، ئاوەدانی کردەوە).
– : حَضَّرَ/ رەفتاری جوانی (فێرکرد، نواند).
تَمَدَّنَ: تَحَضَّرَ. تَهَذَّبَ/ رەفتاری جوان و بەجێی گرت، رازەی شارستانیەتی فێر بو.
مدينة: بلدة كبيرة/ شار.
– السلام: بغداد/ شاری بەغدا.
مَدَنِيَّة. تَمَدُّن: حضارة. عمران/ شارستانێتی، پێشکەوتن، ئاوەدانی.
مَدَني: حضري/ نیشتەنی، نیشتەجێ.
– : من اهل المدن/ شاری، دانیشتوی شار.
– : مُلْكي. غير عسكري/ ناسەربازی، ئاسایی.
– : غير جنائي (في الحقوق)/ سوك، سوکە.
قانون – / سوکە یاسا.
مدي:
مادَى. أمْدَى: أمْهَلَ/ ماوەی دایە، مۆڵەتی دا، دوای خست، (حاپول، چاپولکی)دا.
تَمادى في الأمْرِ: بلغ غايَتَه/ بە (ئەنجام، مەبەست)ی خۆی گەیشت.
– في الأمر: دام على فعله/ لەسەری (رۆی، بەردەوام بو).
– : ذَهَبَ بعيداً/ زۆر رۆی، دورکەوتەوە.
مَدى: مَجال/ بوار، ماوە، دەرفەت.
– : بُعْد/ دوری.

— : مَسافَة/ ماوە.
— : غايَة. مُنْتَهى/ مەبەست، ئامانج، ئەوپەڕی، کۆتایی.
— البَصَر: مَجال الرؤيَة/ چاوبڕکردن، تا چاوبڕکا.
— السلطة: مَجال الحُكم و الصلاحيَّة/ توانستی فەرمان ڕەوایی.
— الصوت: مجال وصول الصوت و السَماع/ دەنگ گەیشتن، تا دەنگ بڕکا.
— العمر: فترة الحياة. عمر. حَياة/ درێژایی ژیان، هەموو تەمەن، تەمەن، ژیان، ژین.
بَعيد الـ — : ذات نتيجَة او تاثير بعيد/ دوورئەنجام.
مَدْيَة. مُدْيَة. مِديَة: سكين/ چەقۆ، قەڵەمبڕ، کێرد.
مَدَوي: صانع الآلات القاطعة/ چەخماخ ساز، شیر گەر، چەقۆکەر.
مديد (فى مد) مدير (فى دور) مدين (فى دين) ميدنه (فى مدن) مذاق (فى ذوق)
مذر:
مَذِرَ. تَمَذَّرَ البيضُ: فسد/ پیس بو، خراپ بو، بۆنی کرد.
مَذَّرَ الشيءَ: فَرَّق. شَتَّتَ/ پەرشی کرد، بلاوی کردەوە، پەرش و بلاوی کردەوە، تێك و پەکانی دا.
تَمَذَّرَ: تَفَرَّقَ/ پەرش بو، بلاویوەوە، پەرش و بلاو بوەوە.
— ت المعدة أو النفس فسدت/ ترشا، دڵتێکەڵ هات، تێك چو.
مَذِر. ماذِر: فاسِد. مُتَعَفِّن. تالف/ پیس، خراپ، ترشاو، بۆگەن، بۆن کردو.
تَفَرَّقوا شذر مَذَر: فى كل جِهَة/ هەریەکەی بەلایەکدا بلاوەیان لێ کرد، پەرش و بلاو بونەوە.
مِذرى: مِذراة (فى ذرو)
مذق: مَذَقَ الشراب: مَزَجَهُ بالماء/ ئاوی تێکەڵ کرد، روونی کردەوە.
— اللَبَن: مَزَجَهُ بالماء/ کردی بە ماستاو.
مذق. مذيق: ممزوج بالماء/ تێکەڵ بە ئاو.
لبن — و — ممزوج بالماء/ ماستاو، شیراو.
مَذاق. مُماذِق: مَن كان وِدّه غير خالص/ ریاکار، دوڕو، هاوڕێ و خۆشەویستێکی ناپاك.
مذكرة (فى ذكر)
مذل:
مَذِل بِسِرِّه: باح به/ درکانی، خۆی بۆ نەگیرا نهێنی خۆی درکان.
امْذَلَهُ: اضجره و اقلقه/ بێزاری کرد، سەری کردەسەر.
مَذِل. مَذيل: مُفشٍ السِرّ/ دەم شڕ.
— . — : قلِق. ضَجور/ بێزار.
مذنب (فى ذنب) مذهب (فى ذهب) مذود (فى ذود)
مر:
مَرَّ: فاتَ/ رابورد، گوزەشت، تێپەڕی.
— : ذهَبَ/ رۆی، رۆیشت، ڕەت بو، گوزەری کرد.
— : إنْقَضى/ بەسەرچو، تێپەڕی، رابورد.
— : جازَ. قَطَعَ. عبر/ بڕی، پەڕیەوە.
— به و عليه: زارهُ/ سەریدا، چوەلای، بەلایا تێپەڕی.
— . امَرَّ: صار مُرّاً/ تاڵ بو.
امَرَّ: جَعَلَهُ يَمُرّ/ ڕێدا تێپەڕێ، هێشتی تێپەڕێ.
— : فَوَّتَ/ پیاکرد، کردی بە ناویا، تێی پەڕان.
— . مَرَّرَ الشيءَ: صَيَّرَهُ مُرّاً/ تاڵی کرد.
إسْتَمَرَّ: دام. بَقي/ لەسەری ڕۆی، بەردەوام بو، کۆڵی نەدا، نەوەستا، بینی گرت.
— به: ثَبَّتَهُ/ هێشتیەوە.
مَرّ: حَبْل/ پەت، گوریس.
— . مُرور. عُبور/ تێپەڕین، پەڕینەوە، رابوردن، ڕەت بون، گوزەر کردن.
— و — الوقت و الأيام: تَقَدُّم و سريان الوقت/ تێپەڕبونی کات و ڕۆژ.
مرور: عبور. إجتياز/ تێپەڕین، گوزەر کردن، ڕەت بون، پەڕینەوە، رابوردن.
— زمن: تَمَلُّك بوضع اليد مُدّة طويلة/ داگیرکردن و بون بەهی خۆ بەهۆی تێپەڕبونی کات و کۆن بونەوە، کات بەسەراچون و تێپەڕین.
— الوقت و الأيام/ کات و ڕۆژان تێپەڕین.
— : إجتياز/ تێپەڕین، تێپەڕبون، هات و چۆ.
— : تفتيش/ پشکنین.
تَذكَرَة — / بلیتی تێپەڕبون.
حركة الـ — / هات و چۆی ڕێگەوبان.
شرطة الـ — / پۆلیسی هات و چۆ.
مارّ: مجتاز. عابِر/ تێپەڕیو، باسکراو، رابوردو.

ال – ذكره/ باسكراو، ناوبراو، تێپەڕیو.
إمرار: إجتياز. عبور/ تێپەڕاندن، گوزەر کردن.
– الوقت/ کات (بردنەسەر، کوشتن).
إستمرار: دوام/ يەك بينەيی، بەردەوامی، هەميشەيی، بێن گرتن، پەيتاپەيتا، پەیدەرپەی.
ب – : دوماً/ پەيتاپەيتا، هەميشە، هەموکات، يەك بينە، نەوەستان، سەرومڕ.
مُستَمِرّ: دائم. غير منقطع/ پەيتاپەيتا، يەك بينە، بەردەوام.
إستمارة/ ئەنکێت.
مَمَرّ: مكان المرور/ ڕێڕەو، گوزەر، پیاڕەو، ڕێگە، شوێنی پیا تێپەڕین.
مَرّة: كَرّة/ جار، جارێك، پات، کەڕەت.
– اخرى: إيضاً/ ديسان، هەروەها.
– اخرى. – ثانية/ جارێکی تر، جارێکی کە.
– واحدَة/ يەك جار، جارێك.
بال – : ابداً. قطعاً/ نە، نا، نەء، نەخێر، هەرگيز، بەيەك جاری.
بال – : إيضاً/ هەروەها، ديسان.
ذات – / جارێك، ڕێکەوتێك، جارێکيان.
هذه ال – / ئەم جارە.
مَرّةً بَعد مَرّة/ جار لە دوای جار.
مِراراً: مَرّات عديدة/ زۆرجار، جارەها، چەند (جار، جاران).
– : احياناً/ ناو بەناو، جارجار، جاروبار، هەندێ جار.
– و تكراراً/ جارەها، جار لە دوای جار، چەند جاران.
مَرّات. بعض المرّات: احياناً/ جارجار، جاربەجار، جاروبار، ناوبەناو.
مُرّ: ضد حلو/ تاڵ، ژەقنە (بوت، موت)، زەقنە (بوت، موت).
– : مُؤلم. قاسٍ/ بەسوێ، سەخت، جەرگ بڕ، بەئازار.
مُرار. مُرّير: نبات/ تالیشك.
مَرارة. مرّة: صفراء/ زەرداو.
– : الحوصلة المرارية او الصفراء/ زراو، تورەکەی زەرداو، زالو، زارە.
– : ضد حلاوة/ تالاو، تالی، تالێتی.
– العمر: ضد حلاوته/ سەختی و سوێ و تەنگ و چەڵەمەو تالاوی ژيان.
بِمَرارة: بِحُرقَة/ بەداخەوە.
أمَرّ: اكثر مرارةً/ تالتر.
الأمَرّان: الفقر و الهرم/ نەبونی و پيری.
مَريرة: حلقة فی طرف حبل/ گرێ، گرێ قولفە، چەڵەمە.
مَرّ: حَبْل/ پەت، گوريس.
مِرّة: قَتْل/ کوشتن.
مَرير: عزيمَة/ غيرەت، ورە.
– . حبل مرير: شديد الفتل/ گوريسی سفت و توند هۆنراوە.
رجل – : قويّ. ذو عزم/ بەغيرەت، بەهێز، ئازا، بەورە.
مَرمَر: غَضَبَ/ توڕەبو، رقی هەڵسا، قينی هەڵسا.
– . مَرَّ: صار مُرّاً/ تاڵ بو.
– عَيْشَهُ: نَقصهُ/ ژيانی لێتاڵ کرد.
تَمَرمَر: تَذمَّر/ بۆڵەی هات، سکاڵای کرد، بێزاری دەربڕی.
مَرْمَر: رُخام او نوع من الرُخام/ مەڕمەڕ.
مرأ:
مَرأ. مَرُءَ. مَرِيءَ (مراءَة) الطعامُ: طاب و نَفَع/ خواردنەکە خۆش و بەکەڵك بو.
– . – . – الطعامُ: ساغ من غير غَصَص/ بە ئاسانی قوت چو، چوە خوارەوە، نەرمە قوت بو.
مَرُؤَ (مُروءَة): صار ذا مُروءَة/ بو بە پياوو خاوەن پياوەتی، جوامێر بو.
– ( مراءَة) المكان: حَسُنَ هواؤه/ ئاووهەوای خۆش ساز بو.
إستَمرأَ الطعام: إستَطيَبَهُ/ لای خۆش بو.
مَريء: مجرى الطعامَ من الحلقوم الى المعدة/ سورێنچك.
طعام مَريءَ: طَيِّب/ خواردنی خۆش.
هنيئاً مريئاً: بالعافيَة/ نۆشی گيانت بێ، نۆش.
مُروءَة. مُرُوَّة: نَخوَة/ چاکە، دەست گرتن، پياوەتی، جوامێری.
– . – : كمال الرجولة/ پياوەتی، ئازايەتی.
اَمْرُءْ. إمْرِيء. مَرْء: إنسان/ مرۆڤ، پياو، زەلام، کەس، مەرنوم.

مَراة. إمراة (الجمع نساء)/ ئافرەت، ژن.
إمْرَأة: عقيلة/ خێزان، ژن، هاوسەر.
مُراء (فی رای) مُرابِ (فی ربو) مراد (فی رود) مراراً (فی مر) مرام (فی روم) مرآة (فی رای) مراهِق (فی رهق)
مرت:
مَرَتَ الشيء: مَلَسَهُ/ سافی کرد، لوسی کرد، ساوی‌دا، سویەوە.
مَرْت. ارض مَرْت و مَمْروتَة: لانبات فیها/ زەوی روت و ساف، روتەن.
رَجُلٌ — : لاشعر بحاجبه/ بێ برۆ.
مُرتاب (فی ریب) مُرتاح (فی روح) مرتاع (فی روع)
مرتبة (فی رتب)
مرث:
مَرَثَ: مَصَّ/ مژی، هەڵیمژی.
— : لَيَّنَ/ نەرمی کردەوە، شلی کردەوە، خاوی کردەوە.
— : دَهَكَ و لَيَّنَ/ خوسانیەوە، فلیقانیەوە.
— الشيءَ فی الماء: نَقَعَهُ فيه/ خستیە ئاوەوە، خوسانیەوە.
مرثاة (فی رثی)
مرج:
مَرَجَ الدابَّة. ارسلها ترعی/ (ناردی، بردی) بۆ (لەوەڕ، پاوەن، چایەر).
مَرِجَ الأمْرُ: إضطرب/ شێوا، شپرزە بو، شڵەژا.
مَرْج: مَرعی/ لەوەڕ، لەوەڕگا، پاوەن، چایەر.
— : رَوْضَة/ مێرگ، مێرگزار، سەوزایی، شەکار.
— . مَرَج: إضطراب/ پشێوی، شێواوی، ئاژاوە، سەرلێ تێك چون.
هَرَج و — : ضَوْضاء: ضَجيج/ دەنگە دەنگ، ژاوەژاو، پشێوی.
مَرجان: صِغار اللؤلؤ/ شیلان.
مرجع (فی رجع) مرجل (فی رجل)
مرح:
مَرِح: إشتَدَّ فَرَحَهُ و نشاطه/ (شادمان، شادان، دڵخۆش، پێخۆشحاڵ) بو.
مَرَحٌ: شِدَّة الفرح/ خۆشی، شادی، ئەوپەڕی خۆشی و شادمانی.
مَرِح. مُريح. طَروب/ روخۆش، شادمان، دەم بە پێکەنین.
مَرحی: احسنت/ ئافەرین، چاکت کرد، ئافەرم، باشت کرد.
مرحب: رَّحب به/ (پێشوازی، بەخێرهاتن، خۆش هاتن)ی کرد.
— به: قال له مَرْحَباً/ پێی وت خۆش هاتی، بەخێربێیت.
مرحاض (فی رحض) مرحلة (فی رحل)
مرخ:
مَرَخَ. مَرَّخَ جَسَدَهُ بالدهن دَهَنَهُ/ چەوری کرد، تێی هەڵسو، هەنوی.
مَرَّخَ. أمْرَخَ العجينَ: اكثر ماءه/ ئاوی زۆری تێ کرد، شلی کردەوە.
تَمَرَّخَ بالدهن: ادهن به. تَدَلَّك/ خۆی چەور کرد، رۆنی تێ هەڵسو، هەنوی.
مَروُخ: دَلوك. دهان للتدليك/ رۆن و دەرمانی چەورکردن، هەنون.
مَرِخ: لَيِّن/ نەرم، شل.
مِرّيخ: كوكب سيّار/ مەریخ، بارام.
مرد:
مَرَدَ. مَرَّدَ الغُصْنَ: القی عنه لحاءه. جَرَّدَه من الورق/ روتی کرد، گەڵای پێوە نەهێشت، توێکڵەکەی لێ کردەوە.
— . — الشيء من الماء: عَرَكَهُ/ فلیقانیەوە، تلیسانیەوە.
— الشيءَ: قَطَعَهُ/ هەڵی وەران، وردی کرد.
— الشيءَ: لَيَّنَهُ/ سافی کرد، شێلای، نەرمی کرد.
— . مَرُدَ. تَمَرَّدَ: عَصَی و عَتَی/ یاخی بو، مانی گرت، سەرکێشی کرد.
— . — . — : جاوز حَدّ امثاله/ بەرز فڕی، پێی لێ هەڵکێشا.
تَمَرَّدَ: إستكبر/ ترۆ بو، تری زل بو، لە وزە چوە دەرەوە.
امْرَدْ: بلا لِحْيَة/ بێتوك، كوستە.
مَرداء: شجرة لاورق عليها/ داری بێ گەڵا، گەڵاوەریو، روت.

تَمَرُّد: عُصيان/ سەرکێشی، یاخی بون، یاخێتی، مان گرتن، سەرپێچی.
مُتَمَرِّد: عاصٍ/ سەر بەگوێنەند، سەرکێش، یاخی، مان گرتو، سەرپێچی کەر، سەرپێچ.
مارد: عملاق/ زەبەللاح، درێژ، چەتەوڵ، دێو.
— : مُرتفع عالٍ/ بەرز، بڵند.
— : مَريد. عاصٍ/ یاخی، مان گرتو، سەرکێش.
مُراد. مَرّاد: عُنُق/ مل، گەردن، ئەستۆ.
مُراد (فی رود)
مُردی: خَشَبَةٌ تُدفَع بها السفينة/ تێلای کەشتی جولان.
مَريد: تَمرٌ يُنقَع فی اللبن/ خورمای ناو ماست، خورماوماست.
تمراد: بُرج الحمام/ هێلانە کۆتر، بورجی کۆتر.
مردقوش: نبات/ جاترە کێویلە.
مرز:
مَرْز: سواقی صغيرة للزراعة/ دێراو، کۆل، دوکان.
مَرّازة: آلة عمل المروز/ کەتو.
عمل المرز أو المروز/ دێراو دروست کردن، کۆل برین.
مرس:
مَرَسَ: نَقَعَ فی الماء حتی يَتَحَلَّل/ خستیە ناوەوە، خوسانیەوە.
— يده بالمنديل: مَسَحَهُ/ سڕی، دەستی سڕی.
تَمَرَّسَ بالشيء: إحتَكَّ/ خۆی (تێهەڵ سو، لێخشان).
مارَسَ الأمر أو العمل: زاول لە و عاناه و شرع فيه/ کاری تیاکرد، شارەزایی تیا هەیە، تاقی کردۆتەوە، لێی ئەزانێ.
تَمارَسوا: تضارَبوا/ دایان بەیەکدا.
مَرِس: مُجَرَّب/ کارامە، شارەزا.
مُمارِس: مُزاوِل/ کار تیاکردو، شارەزا، لێزان.
مُمارَسة: مُزاوَلَة/ کارتیاکردن.
مرسَة: حبل غليظ/ گوریس.
مراس. مَراسَة: قُوَّة/ هێز، توانایی، تین.
سهل الـ — : وَديع. سهل الانقياد/ ئاسان، ئەگونجێنرێ، هۆگر ئەگرێ، زو ڕاپەت.
صعب الـ — : شديد الشكيمة. جَموح/ رەق، ڕانایەت، دەستەمۆ نابێت، کەللەرەق، سەرکێش.

مارس: آذار. الشهر الميلادی/ مانگی نەورۆز.
— : إلاه الحرب عند الرومان/ خوای شەڕ، مارس.
مرسال (فی رسل) مرساة (فی رسو)
مرش:
مَرَش: خَدَشَ/ روشانی، چنگی لێدا.
مَرَّش: خَدَّشَ/ روشان.
اَمْرَش: شرّير/ پیاوخراپ، شەڕانی.
مرض:
مَرِضَ: سَقِمَ/ نەخۆش کەوت، توشی نەخۆشی بو.
مَرَّضَ المريض: إعتنی بە. داواه/ چاودێری کرد، بەدیاریەوە بو، تیماری کرد.
— . امرض: صَيَّرَه مريضاً/ نەخۆشی خست.
تَمَرَّضَ: ضعف فی امره. اصابه المرض/ نەخۆش کەوت، دەردەدار بو، لاواز بو.
تَمارَضَ: اظهر انه مريض/ خۆی نەخۆش (خست پیشان دا).
مَرَض: علّة. داء/ نەخۆشی، دەرد، زەدە، ناساخی.
— بسيط: إعتلال الصحَّة. إنحراف المزاج/ سوکە ناساخی، بێتاقەتی، هەوەس نەبون.
— مستوطن: متوطن/ دەردو نەخۆشی ناوخۆیی و نیشتمانی، نەخۆشی نیشتەنی.
— وبائی: وَباء/ پەتا، دەردی داکەوتو.
— معدٍ: مُتَنَقِّل بالعَدوی/ درم، نەخۆشی (تێپەڕ، تەشەنە کار).
فراش الـ — / جێگەو نوێنی نەخۆش.
مريض. مُصاب بمرض. عليل/ نەخۆش، دەردەدار، دەرداوی، زەدەدار، بیمار.
— : مُعْتَلّ الصحَّة/ بێتاقەت، کز.
— الحُبّ: مَضنی بالهَوی/ نەخۆشی دڵداری، دەردی دڵداری.
بَدَن — : ناقص القُوَّة/ بێهێز، لاواز، زەبون، چروساوە.
قلب — : ناقص الدين/ ئایین (لاواز، لەق)، کەم ئایین، بێبروا.
رای — : ضعيف و فيه إنحراف/ باوەڕو رای ناتەواو لاواز، کەم باوەڕ.
عَيْنٌ مريضَة: فيها فتور/ چاوی کز.

ريح – : ضعيفَة/ كزەبا.
شمس – : ضعيفَة الضوء/ خۆری بێهێز
لَيْلَةٌ – : لاتُرى فيها الكواكب/ شەوێ ئەستێرە دیار نیە.
أرض – : إذا ضاقت باهلها/ زەوی تەسك و بەشی دانیشتوان نەکرێ.
أرض – : كثيرة الفِتَن/ شوێنی پڕ لە ئاژاوە.
مَرَضي: مُتَعَلِّق بالمرض/ پەیوەندی بە نەخۆشیەوە هەیە.
إجازة مَرَضِيَّة/ پشوی نەخۆشی.
تمريض: مهنة التمريض/ نەخۆش کاری.
تَمارُض: إدّعاء المرض/ خۆنەخۆش خستن.
الـ – : التخلص من واجب/ خۆدزینەوە بە بیانوی نەخۆشیەوە.
مُمَرِّض: مَشارِف. مُضَمِّد/ نەخۆش کار، برین پێچ، نەخۆشەوان.
مُمَرِّضَة: المرأة التي تعتني بالمرضى/ نەخۆش کار، برین پێچ، سستەر، ئافرەتی نەخۆشەوان.
مِراض. مُتَمَرِّض: كثير المرض/ دەردەدار، شلەپەتێ.
مرط:
مَرَط. مَرَّط: نَتَف/ هەڵی کەن، دەسکەنەی کرد.
– . – الشَعْرَ: أزاله/ هەڵی‌کەن، هەڵی‌گرت، مۆکێشی کرد.
تَمَرَّط الشَعْرَ: تَساقَط/ وەری، لێی بوەوە، پێوە نەما.
مريط. أمرط: لا شَعْرَ عليه/ بێتوك، کوستە، توك وەریو.
مرع:
مَرَع بالدهن: مَسَح/ چەوری کرد، رۆنی تێ (هەڵسو، لێدا)، هەنوی.
مَرِعَ. مَرُعَ: تَنَعَّم/ کەوتە خۆشیەوە.
– . – . أمْرَعَ الكانُ: اخْصَبَ/ بە پیت بو، بە برشت بو.
مُرعَة. مُراع: شحم. دسم/ چەوری، بەز، پیو.
مَرْع: كَلأ/ لەوەڕ.
مَريع: خَصيب/ بەپیت، بە برشت.
مَرْعى (في رعى)/ لەوەڕ، لەوەڕگا.
مِرعِز: شعر العَنْز/ مەرەز.
مرغ:
مَرَّغَ الشيءَ في التراب: قَلَّبَهُ فيه/ گەوزانی، لەخۆڵا تلانیەوە.
– راسَهُ: اشْبَعَهُ دهناً/ رۆنی دا لەسەری، سەری چەور کرد.
– . امْرَغَ عِرضَهُ: دَنَّسَهُ/ ناموسی شکان.
تَمَرَّغَ في الوحل و التراب: تَقَلَّبَ/ لەقوڕو خۆڵا گەوزا، تلایەوە.
– في الفراش: تَضَوَّر/ تلێدا، تەپاوتلی کرد.
– في الأمر: تَرَدَّدَ/ دودڵ بو، راڕابو، گێنگڵەی دا.
مَرْغ. تَمَرُّغ: تَقَلُّب. تَضَوُّر/ گێنگڵە (دان، خواردن)، گەوزان، تلانەوە.
مرفا (في رفا) مرفع (في رفع) مرفق (في رفق)
مُرفين: مادّة مُخَدِّرَة/ بێهۆش (کەر، داڕو)، مۆرفین.
مرق:
مَرَقَ منه: نفذ فيه/ پیاچو، پیاچەقی، تێی چو، بەری چوە ناوی.
– من الدين: خَرج منه بِضَلالَة/ گومڕابو، لە ئایین لایدا.
– : إنطلق/ دەرپەڕی، فرتەی کرد، بۆی دەرچو.
– . مَرَّق القِدرَ: اكثر مرقها/ ئاوی زۆر تێکرد، شلی کردەوە.
مَرَّق: غَنَّى/ سۆزی کرد، گۆرانیوت، دەنگی لێ هەڵبڕی.
– العجينَ: مَرَّخَهُ/ شلی کردەوە، هەویرەکەی شل کرد.
تَمَرَّق الشَعْرُ: تَساقَط/ وەری، هەڵوەری، کەوت، تولەك بو.
مَرَق. مَرَقَة: مَسْلوقَة/ کوشتاو، شلە.
مارِق: نافِذ/ پیاچو، تێچو.
– من الدين: الخارج منه/ گومڕا، لە ئاین لاداو.
– : ضالّ/ بەرەڵا، چەوت، ون بوو.
مُروق: ضلال/ بەرەڵایی، چەوتی، پەتیارەیی.
– من الدين: إرتداد عن الدين/ لە ئاین لادان، گومڕایی.
مرقاة (في رقي) مركبة (في ركب) مركز (في ركن)
مرن:
مَرَنَ: لانَ في صلابَة/ نەرم بوەوە، جیڕ بوەوە.

– على الشيء: إعتاده/ راهات، پێی راهات، خۆی راهێنا، رام بو.
مَرَّن على: دَرَّبَ/ مەشقی پێکرد، فێری کرد.
– الشيء: لَيَّنَه/ نەرمی کردەوە، شلی کردەوە.
– على: عَوَّدَ/ رای‌هێنا، بەکاری هێنا، رامی کرد.
– جسده. تمَرَّن: تَرَيَّضَ/ وەرزشی تایبەتی کرد، لەشی نەرم کردەوەو رای‌هێنا.
تَمَرَّن: تَدَرَّب/ مەشقی کرد، کۆششی کرد، کۆشا.
– على: تَعَوَّدَ/ خۆی راهێنا، راهات، پێی راهات، رام بو.
مـرن: لَـيِّن. يلتـوي/ ئەنوشـتێتەوە، خـوار ئەبێتـەوە، ئەچەمێتەوە، نەرم، جیڕ، ئەگونجێ، نیان.
– : لَدَن: يَتَمَدَّد و يَنْضَغِط/ ئەكشێ، فشۆڵ، نـەرم، نەرم و نۆڵ.
مُرونَة. مَرانَة/ لاستیكی، جیڕی، نەرمی، گونجان، نیانی.
مِران. تَمَرُّن. تَمْرين: مُمارَسة. مزاولَة/ كـردن، فێربـون، راهێنان، مەشق کردن، راهاتن، کۆشش کردن.
– . – جسدي/ نەرمە وەرزش، لەش راهێنان.
– . – على عمل: تَلْذَة/ فێربون، شاگردی.
تحت التمرين: تلميذ في مِهْنَة/ قوتابی، فێرکار.
تحت التمرين: صانع/ شاگرد.
مُمَرَّن. مُتَمَرِّن: مُدَرَّب/ راهاتو، فێر، فێربو، گونجاو، رام.
تَمـرين. مـايُتَمَرَّن بـه الطلبـة علـى اعمـالهم/ کۆشـش، راهێنان، فێرکردن، راکۆش.
شجرة المُرَّان/ سورەچنار.
مَرَّة (في مَرّ) مرهم (في رهم) مُروءَة (فـي مـرأ) مروَحَة (في روح) مَريء (في مرأ)
مرى:
مَرى حَقَّهُ. جَحَدَهُ/ مافی خوارد، لاری بو لێی، نكوڵی کرد، ئەچوە ژێری.
ماری: جادل و نازع/ مشت و مڕی کرد، چەقەی هات.
إمترى في الأمر: شَكَّ/ گومانی لێکرد، دڵی لێ پیس کرد.
مِريَة: شَكّ/ گومان.
– . مِراء: جَدَل/ مشت و مڕ، چەقە (کردن، هاتن).
مريخ (في مرخ) مريع (في مرع) مريوق (في يرق)
مز:
مَزَّ الطَعْمُ: صار مُزّاً/ مێ خۆش بو، مزر بو.
– الشيءَ: مَصَّهُ/ مژی، هەڵی مژی.
تَمَزْمَـزَ: اكـل او شـرب. ذاق/ لێـی (چێـشت، خـوارد)، ناخونەکی دا، خواردی، خواردیەوە.
مُزّ: ما طعمه بين الحامض و الحلو/ مێخۆش، تـرش و شیرین، مزر.
مزاج (في مزج) مزاد (في زيد) مزيله (في زيل)
مزج:
مَزَجَ: خَلَطَ/ تێکەڵی کرد، تێکیدا، ئاوێتەی کرد.
– الدواءَ: رَكَّبَهُ/ گرتیەوە، دەرمانەکەی گرتەوە، تێکـەڵی کرد.
مازَجَ: خالط/ تێکەڵی کرد، ئاوێتەی کرد.
إمتزج به: إختلط/ تێکـەڵ بو، تێکـەڵی بـو، تێکـەڵاو بـو، ئاوێتە بو.
مَزْج: خَلْط/ تێکەڵ بـون، تێکـەڵاو بـون، تیـك دان، تێکـەڵ کردن.
مزيج: تركيب/ ئاوێتە، پێك هاتو.
– : خليط/ تێکەڵ، تێکەڵاو.
ممزوج. مُمْتَزَج: مخلوط. مختلط/ تێکەڵ کراو، تێکـەڵاو بو.
إمتزاج: إختلاط/ تێکەڵ، تێکەڵاو، تێکەڵ کراو، تێکەڵی.
مـزاج: مـا أسـس عليـه البـدن/ خـو، کـردار، رەوشـت، چۆنیەتی کردارو رەوشت.
– : بُنيَة الجسم/ چۆنیەتی و شێوەی لەش، داروبار.
– : كَيف/ تاقەت، هەوەس، ئارەزو.
مزح:
مَزَحَ: هَزَلَ/ گاڵتەی کرد.
مازَحَهُ: داعَبَهُ/ گاڵتەی لەگەڵ کرد.
مَزْح. مِزاح. مُزاح. مُزاحَة: هَزَل. مُداعَبَة/ گاڵتەو گەپ.
مَزّاح. مازِح: هَزْلِي. مُضْحِك/ قۆشمە، گاڵتەچی.
مزدوج (في زوج) مزراب (في زرب) مِزراق (في زرق)
مزع:
مَزَعَ: مَشى خفيفاً/ لەسەرخۆ ڕۆی، شـێنەیی بـو، هێـواش ڕۆیی.
– . مَزَّع القُطنَ: نَفَشَهُ باصبعه/ بەدەست شیکردەوە.
مَزّاع. مُمْزِع: بطيء/ لەسەرخۆ، هێواش ئەڕوا، سست.
مِزعَة: قطعة/ کوت، پارچە، کولو، کولوە لۆکە، کەرت.

مزق:
مَزَقَ: شَقَّ/ درا، هەلاهەلا بو، رێزال رێزال بو، شڕ بو.
مَزَّقَ: شَقَّ/ دڕی، دڕانی، شڕی کرد.
— شملهم: فَرَّقهم/ پەرت و بڵاوی کردنەوە، لەیەکی کردن، جیای کردنەوە.
— عرضهم/ ناوبانگی شێوانن، ناوی زڕانن.
تَمَزَّقَ: تَشَقَّقَ/ دڕا، شڕبو، شڕوڕ بو، شی بوەوە.
— القومُ: تَفَرَّقوا/ جیابونەوە، بڵاو (بونەوە، هیان لێکرد).
يُمَزِّق القلب: مُحْزِن/ دڵ ئەپچڕێنێ، جەرگ ئەبڕێ.
مَزَّق: شَقّ/ دڕاوی.
— . تَمزيق: شَقّ/ دڕاندن، هەلاهەلاکردن، رێزاڵ کردن.
مُمَزَّق: مُشَقَّق/ دڕاو، هەلاهەلا، رێزال رێزاڵ، ونجڕونجڕ.
مُزَقَة: عند ليب/ بلبل، شالور.
مزن:
مُزن سحاب ذو ماء/ هەوری بە باران.
حَبّ الـ — . مُزنَة: بَرَد/ تەرزە.
مُزنَة: مطرة بَرَد/ تەرزە بارین.
مزی:
مَزِيَّة. مازِيَة. إمتياز: فضل/ چاکە، جیاوازی.
— . — : فضيلة/ لێهاتویی، چاکێتی.
مس:
مَسَّ الشيءَ: لَمَسَهُ/ دەستی لێدا، بەری کەوت، لێیدا.
— تهُ المرض: أصابَهُ/ توشی نەخۆشی بو، نەخۆش کەوت.
— ت الحاجَةُ الى: الجأت/ ناچار (بو، ی پێی کرد).
مُسَّ: صارَ به مَسّ من الجنون/ تۆزێك شێتی لێی دا.
ماسَّ: لامَسَ/ بەری کەوت، دەستی لێدا.
تماسّ الشيئان: مَسّ احدهما الآخر/ بەریەك کەوتن، لەیەکیان دا.
مَسّ. مسَيس. مَساس. مُماسَسَة/ بەریەك کەوتن، لەیەك دان.
— : جنون/ شێتی، شێتۆکەیی.
عند مساس أو مسيس الحاجة: عند الضرورة/ کاتی پێویستی.
امَسّ. امَسّ الحاجة: في حاجة مُلِحَّة/ زۆر پێویستی، ناچاری.
مَسَّة: لَمْسَة/ دەست لێدان، بەریەك کەوتن، لێك دان.
ماسّ: لامس/ بەریەك کەوتو.
حاجة ماسَّة: ضرورية/ زۆر پێویستی، ناچاری.
تَماس: مُلامَسَة/ بەرکەوتن، بەریەك کەوتن، لەیەك دان، لێکەوتن.
مماس في الهندسَة: الخط الملامس/ بەرکەوتە، لێکەوت.
ممسوس: ملموس/ بەریەك کەوتو.
— . يُلْمَس: محسوس/ هەست پێکراو.
— : مجنون/ پەتیارە، شێت، وێت، شێتۆکە.
مسؤولية (في سأل) مساء (في مسو) مساحة (في مسح) مسافه (في سوف) مسام (في سم) مسبحه (في سبح) مستأهل (في اهل) مُستاء (في سوا) مستبد (بي بد) مستبيح (في بوح) مستحد (في حد) مستحيل (في حول) مستراح (في روح) مستشار (في شور) مستشفى (في شفي) مستطاع (في طوع)
مستعار (في عور) مستعد (في عد) مستعمرة (في عمر) مستعمل (في عمل) مستقبل (في قبل) مستقل (في قل) مستقيم (في قوم) مستلق (في لقي) مستمر (في مر) مستند (في سند) مستنقع (في نقع) مستهجن (في هجن) مستوى (في سوي) مستودع (في ودع) مسجد (في سجد)
مسح:
مَسَحَ. مَسَّحَ: جَفَّفَ بالمسح/ سڕی، وشکی کردەوە.
— . — : مَحَى. ازال الأثر/ سڕیەوە، پاکی کردەوە، لێی کردەوە.
— لوح الخشب بالفارَة/ لەرەندەی دا، رەندەی پیاهێنا، سافی کرد.
— بالزيت او الدهن/ چەوری کرد.
— الحذاء: نَظَّفَهُ/ بۆیاخی کرد، شەوقی پێ هەڵهێنا، سڕی، پاکی کردەوە.
— الارضَ: قاسها/ پێوای، پێوانەی کرد.
— الارضَ: غسلها/ پاکی کردەوە، شتی، سڕی.

- راسه. مَسَّحَهُ. ماسَحَهُ: تَمَلَّقَهُ/ (ريـايى، مـەرايى، مامەحەمــەيى، ماســتاو، قوزكەشــى)ى كــرد، خــۆى بردەپێشەوە.
تَمَسَّحَ بالماء: إغتسل/ خۆى شت.
- الشيء: مَسَحَهُ/ سرى، پاكى كردەوە، لێى كردەوە.
مَسْح: إزالة/ سرين، پاك كردنەوە، كوژاندنەوە، لێكردنەوە.
- بالدهن: تدهين/ چەوركردن، هەنون.
- الارض: قياسها/ پێوان.
- العملة بالاحتكاك: حَكّ/ ساف بون، كوژانەوە.
مَـسّاح الأراضـى: الـذى يمـسح الارض/ زەوى پێـو، پێوەر، مەساح.
- الاحذيـة: الـذى يـصبغ الحـذاء/ بۆيـاخ چـى، پێڵاوسڕ.
مِساحَة: قياس السطح المحصور/ روپێو، پێوانى رو.
- الاراضى: قياس/ پێوانى زەوى.
الـ - السطحية/ روبەر، روبەرى رو.
الـ - الجانبيَّة/ روبەرى تەنيشت.
الـ - الكلية/ روبەرى گشت.
علم الـ - / پێوەرزانى.
مِمْسَحَة الارض: خرقه المَسْح/ زەوى سڕ.
- الارجل: خرقه تُفْرَش/ بەرپێ، پێسڕ، پێڵاوسڕ.
مَمْسوح: مَمْحُو/ سڕاو، كوژاوە، نەماو.
مَسيح. مَمْسوح بالدهن/ چەوركراو.
- : السيد المسيح/ پێغەمبەر عيسا، مەسيح.
درْهم - او ممسوح/ دراوى ساف، كوژاوە، لوس بو.
مَـسيحى: نـصرانى/ گـاور، ديـان، خرسـتيان، فەلــە، عيسايى.
الدين الـ - . المسيحية/ ئايينى گاور، مەسيحى، ديان.
ماسِح. مَسِّيح: كَذّاب/ درۆزن،، ماستاوكەر.
مَسْحَة: اثر خفيف ظاهر/ شوێن، نيشانە.
- : شيء قليل/ كەمێك، شتێكى كەم، تۆزێك.
عليه مَسْحَة التهكم/ قسەى لە دولپە، خراپى لێ ئەڵێن.
تمساح: من الزواحِف/ تيمساح.
مسخ:
مَـسَخَ: حَـوّل الـصورة الى غيرهـا/ (شـێوە، روخـسار)ى وێنەكەى گۆڕى.
- صـورته: شَـوَّهَها/ وێنەكـەى (شـێوان، تێـك دا) ناشيرينى كرد.
- الطعامَ: اذهب طَعْمَهُ/ تامى نەهێشت، تامەكەى تێك دا.،
مَسْخ. مَسَخ: قَلْب الصورة/ وێنەو روخسار گۆڕين.
- . - : تَشْويه/ شێوان، ناشيرين كردن.
- . - : إنتقال روح الإنسان الى حيوان يُناسِبهُ/ گواستنەوەى گيانى مرۆڤ بۆ نـاو لەشـى ئاژەڵێك كـە بۆى بگونجێ.
مسْخ: تَحَوُّل، تَبَدُّل/ گۆڕان بۆ شێوەى ئاژەڵ.
مَسيخ. ماسِخ: لاطعم له/ بێتام، بێخوێ.
- . ممسوخ: مُشَوَّه/ شـێواو، تێك چو، وێنـە شـێواو تێك چو.
- : الاحمق/ گێل، كەر، كەودەن.
مَمْسوخ: قليل لحم الكفل/ سمت و كەفەڵ (لەڕ، پوچەڵ).
مَسْخَرَة (فى سخر)
مسد:
مَسَدَ الحَبْلَ: فَتَلَه/ باىدايەوە.
مَسَّدَ الشيء و عليه: أمَرّ يَدَهُ عليه/ دەستى پياهێنا.
- الجَسَدَ: دَلَّكَهُ/ شێلاى، هەنوى.
مَسَدْ: حبل محكم الفتل/ پەتى بادراو، كشتەك، گوريسى سفت.
تَمْسيد: إمرار الكَفّ بِشِدَّة على الجسم/ شێلان، دەست پياهێنان، هەنون.
مسر:
ماسورَة: انبوب/ لولەو قاميشى شمشاڵ، جوزەلە.
- البُنْدُقيَّة/ لولەى تفەنگ.
مسطرة (فى سطر)
مسك:
مَسَكَ. امسك الشيء و به: قَبَضَهُ/ گرتى، پێوەى نوسا.
- . - الكُرَة و العـصفور و كـل متحـرك: لَقَفَـهُ/ گرتيەوە.
- . - لِسانَه: صَمَتَ/ بێدەنگ بـو، زمـانى خـۆى گرت.
- . - البَطنَ: قَبَضَ/ گرفتى كـرد، قـەبز بـو، سـكى دەرنەچو.

— . — تَمَسَّك. إستَمْسَكَ به: تعلق او تَشَبَّثَ به/ پێوەی نوسا، پیاهەڵ واسرا، تێوەی ئالا، پیالکا.
— . — . — . — به: حفظَهُ/ پاراستی.
— ـهُ . — ـهُ و هو يَسْرُق: قَبَضه. قبض عليه/ گرتی، له دزیدا گرتی.
— ت . — ت النار الخشبَ: إشتعل/ داگیرسا، هەڵگیرسا، گرتی.
— الحسابَ / حسابی راگرت، حسابەکەی راگرت.
— يَدَهُ: إقتصد. قَرَّط/ دەستی گرتەوە، کەمی کردەوە.
امسك و إستَمْسَكَ عن: إنقطع او عَجَفَ عن/ لەخۆی کەم کردەوە.
— و — عن الطعام: عَجَفَ عن الطعام/ خۆراکی کەم کردەوە.
— و — به: تَعَلَّق به/ پێوەی نوسا، پیا هەڵواسرا.
— و — عن الأمر: كَفَّ عنه و إمتنع/ وازی لێهێنا.
— عن الكلام: سَكَتَ/ بێدەنگ بو.
— الله الغيث: منع نزوله/ خوا بارانی نەباران.
— ـهُ: قبضه/ گرتی، وەری گرت.
إستمسك بولَهُ: إحْتَبَسَ/ میزی گیرا.
تماسَك الشيئان: تلاصقا/ پێکەوە نوسان.
تَماسَكَ. إمتَسَكَ. تَمَسَّكَ به: تعلق به/ پێوەی نوسا، پیالکا.
ما تَماسَكَ: ما تمالك/ نەیتوانی، خۆی بۆ نەگیرا.
تَماسَكْتُ: ملكت نفسي/ خۆم بۆ گیرا، بێدەنگ بوم.
مابه تماسك. مافيه مُسْكَة: لا خير فيه/ سوبو کەڵکی نیە، بێخێرە.
إمتسك في المكان: ثبت فيه/ دایکوتا، مایەوە.
مَسْك: قبض/ پێوەنوسان، لکان.
— لَصْق/ پێوەنوسان، لکان.
— الدفاتر التجاريَّة/ دەفتەرو حساب راگرتن، قەڵەمچێتی.
— الحسابات/ حساب راگرتن، ژمێریاری.
مَسْكَة: مِقْبَض/ دەسك، قوڵف.

مُسْكَة. مُسُكَة. مَساكَة. مِساكَة: بُخل/ رژدی، گیری، پیسکەیی.
مَسُك. مُسكَة: بَخيل/ رژد، پارەپیس، گیر، قەمتەر، پیسکە.
مُسَكَة: شديد التمسك بالشيء/ خوازەڵۆکی، گیری.
مَسيك. مِسِّيك: بخيل/ رژد، گیر، قەمتەر، پیسکە.
— : لا يَنْضَح/ قرخ، نادەڵێنێ، لێی ناچێ.
إمساك: بُخْل/ رژدی، پارەپیس، گیری، پیسکەیی.
— النفس: إنقطاع عن/ وازلێهێنان، خۆگرتن.
— : قبض الامعاء/ قەبز بون، سك دەرنەچون، گرفت کردن.
— في رمضان: انقطاع عن الاكل و الشرب/ دەست هەڵگرتن، لە خواردن و خواردنەوە، بە رۆژو بون.
تَمَسُّك: تَشَبُّث/ لاخۆشەویست بون، تونگ گرتن.
تَماسُك: إلتئام/ یەك گرتن، پێکەوە نوسان.
— وتلاصُق/ گرتن و لکان، یەك گرتن و پیالکان، پیانوسان لکان.
مُتَمَسِّك مُتَماسِك: مُتَلَبِّد/ یەك گرتو، پتەو، سفت.
— بِحَقِّه/ کۆڵ نەدەر، ماف گرتو.
مستمسك: مستند. دليل/ بەڵگە، بەڵگەنامە.
ماسكة: آلة ماسكة/ گیرە.
— رحم: قرابة/ خزمایەتی، سیلەی رەحم.
مُسْك. قوت. غذاء/ خۆراك، خواردن.
مِسْك: طيب مَعروف/ بۆنی مسك.
مُمَسَّك: مُطَيَّب/ بۆن مسك، مسکاوی، بۆن خۆش.
صابون — / سابونی بۆن خۆش.
مُسْك. مُسْكَة. مايُمْسِك البدان من طعام و شراب/ ئاوگیر، خۆراك، قەبزکەر.
مِسْكَة: روث المواشي/ شیاکە.
— : جِلَّة الوقود/ تەپاڵە.
مُسْكان: عَرَبُون/ پێشەکی.
مسكين (في سكن) مسلة. مسلول (في سل) مُسلي (في سلو) مُسَم (في سم) مسمار (في سمر) مُسَنّ (في سن) مسند (في سند)
مسو:

نـازِلَ: واجَـهَ. قابَـلَ/ رويـەڕوی وەسـتـا، ئاوقـەدی بـو، زۆرانی لەگەڵ گرت، بەرەنگاری بو.
نُزُول: ضد صعود/ دابەزین، هاتنەخوار.
- : هُبوط/ هاتنەخوارێ، کەم بونەوە، نیشتنەوە.
- : حُلول/ لادان.
نزولاً علی رغبة فلان/ لەبەرخاتری.
نازِل: ضد صاعد/ سەرەوخوار، بەرەوخوار، دابەزیو.
إنزال. تنْزيل: ضد رَفع/ هێنانە خوارێ، دابەزاندن.
- . - : إفراغ/ داگرتن، بەتاڵ کردنەوە.
تنزيل. إستنزال: طَرح/ لێدەرکردن.
- . - : خَصْم/ داشکاندن.
- : حَدْر الشيء من عُلوٍّ إلى اسفل/ هێنانەخوارێ، داگرتن.
- المقام أو الدَرَجة/ پلە کەم کردنەوە.
تنازُل: تَرْك/ وازهێنان، دەست لێهەڵگرتن، نەویستن.
- : تَعَطُّف/ بەزەیی پیاهاتنەوە، دل پێسوتان.
- فی الحقوق/ واز لە ماف هێنان.
مُتَنازِل/ وازهێن.
- اليه/ واز بۆ هێن.
نَزْلة. نُزُول: مـرض كالزكـام/ سـەرمابون، هەلامـەت، درم.
- صَدْرِيَّة أو شَعْبِيَّة/ کۆکەو هەلامـەت، سەروسـنگ گیران.
- وافِدَة/ ئەنفلۆنزا.
- : المَـرَّة مـن النـزول. هبـوط. إنحـدار/ سـەرەو (لێژە، خوارە).
نازِلة: مُصيبة. كارِثة/ بەلا، کارەسات.
نُزُل. نَزْل: فندق/ ئوتێل، خان.
نِزال: قِتال/ زۆران بازی، دەستەویەخە.
منْزِل: دار. بيت/ ماڵ، خانو.
- : مسْكَن/ نیشتمان.
- المسافرين/ خان، خانوی پشو، میوان خانە.
بِمَنْزِلة: مَقام/ پلە، پایە، گەورەیی.
ممنْزِلة كذا: يُعادِ لە/ لەجێی، وەکو.
مُنْزَل: مُوحى بە/ فەرمایشتی خوا، نێرراو.
الكتب المنزلە/ نوسراوەکانی خوا، نێرراوەکان.

نزيل: ضَيْف/ میوان.
- : ساكن/ دانیشتو، نیشتەنی.
نزه:
نَزُهَ. تَنَزَّهَ عن: تباعَدَ/ دورکەوتەوە، پاك بوەوە.
- . - عـن فِعْـل دَنـيء: تباعَـد عـن المكـروه/ دورکەوتەوە لە خراپە، لەخراپە لایدا.
- : كان عفيفاً/ داوێن پاك بو.
نَزَّهَ الرجُلَ من: إعْتَبرَهُ مُنَزَّهاً عنه/ داینا بە پیاو چاك و دور لە خراپە.
تَنَزَّهَ: خَرَجَ للنُزْهَة/ چو بۆ (گەڕان، سـەیران)، گەشـتی کرد.
نـزه: عفيـف. شـريف/ چـاك، داوێـن پـاك، راسـت، بەناموس.
نزيه: عَفيف/ داوێن پاك، پاك، بەناموس.
- : لا يَقْبَل الرَشْوَة/ راسـت، دەسـت پـاك، بـەرتیل نەخۆر.
مُنَزَّهٌ عن كذا: بعيد عن. أسمى/ دورە لە و کردارە.
نَزاهَـة. نَـزَه. تَنَـزُّه عـن الـسوء: البعـد عـن الـسوء/ دوربون لە خراپەو داوێن پیسی، پاکێتی، داوێن پاکی.
نُزْهَة: فُسْحَة/ گەڕان، گەشت، سەیران، رابواردن.
امـاكِن الـ - : مكـان عُمـومي للنزهـە/ سـەیران گـا، گەشت گا، شوێنی رابواردن.
مُنْتَزَه. مُتَنَزَّه: مكان النُزْهَة/ باخچەی گشتی، سـەیران گا.
نزو:
نَزا: وَثَب/ بازدی دا، ئامبازی بو.
- الفَحْل على الأنثى: سفدها/ چاکی کرد، سواری بو، پیتکێی کرد.
- به قلبه الى: طَمَحَ و هـام/ ئاواتی بۆ خواست، بێزوی کرد، هەڵپەی بۆ کرد، بەهیوای بو، تامەزرۆی بو.
- عَنْهُ: تَفَلَّتَ و هرب/ دەرپەڕی، بۆی دەرچو.
نَزْو. نُزُوّ. نَزوان. وَثْب/ بازدان، ئامبازبون.
- . نِزاء. نُـزاء فحل الحيوان: تَسافُد/ چـاك كـردن، لێپەڕین، پیتکێ، سواربون، لاقەکردن.

– . – الحيوانــات: الــدوره النزويـــه. تهـــيج الحيوانات/ هاتنه فالْ، ئارەزو هەلْسان، بەكەلْ هاتن، بەبا بون.

نِزاء. نُزاء: تسفيد/ چاك كردن، كەلْدان، كەلْ گرتن، لێپەڕين.

نزوة: وَثْبَة/ بازد، ئامبازبون، قەلْەم بازد.

– الفكر: تَخَيُّل. تَصَوُّر/ خەيالْ پلاو.

نَزوان: سَوْرَه وحِدّة/ زەبرو زۆنگ، هەرەشەو گورەشە.

نس:

نَسّ الخُبْزَ او اللحمَ: يبس/ وشك بوەوە.

– الحطب أخرجت النار زبدهُ على راسه/ كەفى كرد (كە دار ئەخرێتە سەر ئاگرەوە سەرەكەى كەف دەكات).

نَسناس: إنسان وهمي/ مرۆڤى بەخەيالْ.

– : نوع من القرود/ مەيمونى كلك درێژ، سەگسار.

نسب:

نسبَ الى : عزى/ خستيه پالْ، گەڕانيەوە بۆ..

– الرجل: وصفه و ذكر نسبه/ باسى كرد، خێزانەكەى باسى كردو ناسانى، بنەو بنەمالْەى باس كرد.

– إليه كذا: إتَّهَمَهُ به/ تاوانى (خستەپالْ، كردەمل) گوناهبارى كرد.

ناسَبَ: وافَقَ/ گونجا، بۆى بو، لوا، شيا.

– : ماثل وشاكل و لائم/ لوا، بۆى لوا، لێى چو، وەك خۆى وابو، بۆى گونجا.

– : كان قَريبَهُ/ خزمى بو، خوێشى بو، خزم بون.

– هُ: صاهَرَهُ/ لە ژنەوە بو بەخزم، بونە خوێش.

تَناسَبَ الرجلان: صارت بينهما قرابَة/ بون بە خزمى يەكترى، بون بە خزم، بونە خوێش.

– الشيئان: تماثلا و تشاكلا/ لەيەك چون، بۆ يەك گونجان، بۆ يەك بون، پڕ بە پڕى يەكترى بون.

إنْتَسَبَ الى: مَتَّ الى/ گەڕايەوە بۆ، پەيوەندى هەبو لەگەلْ.

– الرجل: ذكر نسبه/ بنەمالْەو خێزانى خۆى ئاشكرا كرد.

إسْتَنْسَبَ الرجلُ: ذَكَرَ نَسَبَهُ/ بنەو بنەمالْەو بنەرەتى خۆى باس كرد.

– الشيءَ: وَجَدَهُ مناسباً مُلائماً/ بەكەلْك هات، گونجا، دەستىدا.

نَسَبٌ. نَسابَة: مُصاهَرَة/ پەيوەندى، خزمايەتى لە ژن و ژن خوازيەوە.

– . – : قَرابَه/ خزمايەتى، خوێشايەتى.

– رياضى/ لۆگاريتم.

سِلْسِلَة الـ – / زنجيرەى خێزان، بڕبڕە، بنەچە.

عَريق الـ – / خانەدان، وەجاخ زادە.

شَجَرَة الـ – / ليستەى (خێزان، باووباپيران).

نِسْبَة. نُسْبَة. نَسَب. عَزو/ خستنە پالْ، گەڕانەوە بۆ.

– . – : قرابَة/ خزمايەتى، خوێشايەتى.

– . – : تَعَلُّق و إرتباط/ پەيوەندى.

– . – : تَماثُل بين العلاقات/ لەيەك چون، چون يەك بون، لەيەك چونى پەيوەندى.

– . – : تَناسُب/ ڕێژە.

– . – : مُعَدَّل/ تێكڕا، رادە.

الـ – الثابته/ ڕێژەى نەگۆڕ.

الـ – المؤيَّة/ ڕێژەى سەدى.

بالـ – الى كذا: بالنظر اليه/ لەبەرئەوەى، بەهۆى، بەپێى.

بالـ – الى: بالقياس على/ بە گوێرەى.

نسيب: قَريب/ خزم، خوێش.

– : صِهْر/ خزم لە ژن و ژن خوازيەوە، زاوا.

– : عَريق السنب/ خانەدان.

تَناسُب: تَعَلق و إرتباط/ پەيوەندى.

– : تَماثُل/ ڕێژە، هاوڕێژە (بون، يى)، دوڕێژە.

– : تَعادُل/ گونجان، هاوسەنگ بون.

– طردى/ هاوڕێژەى ڕاستەوانەيى، دوڕێژەى يەكسان.

– عكس/ هاوڕێژەيى پێچەوانەيى، دو ڕێژەى پێچا.

مُناسِب: موافِق/ گونجاو، بۆ بو، لەبار، پڕبەپڕ.

– : لائق/ شياو، شايان، بەجێ.

غير – : غير موافق أو غير لائق/ ناشىّ، نابىّ، ناگونجێ، بۆی نابێ، لەبار نیە، نەشیاو.
مُناسَبَة: مُوافَقَة/ بۆبون، گونجان، شیان.
– : تَناسُب/ رێژە، هاورێژەیی.
– : سَبب/ بۆنە، هۆ، روداوێك، مەبەستێك.
– : خُصوص. إرتباط/ پەیوەندی، بۆنە.
بِهذه الـ – / بەم (هۆیەوە، بۆنەیەوە).
منسوب الى كذا: مَعْزو/ ئەخرێتە پاڵ، ئەگەڕێتەوە بۆ.
– اليه كذا: مُتَّهَمٌ بە/ خراوەتە پاڵی، پێی تاوان بار کراوە، ئەڵێن ئەوە.
– الى: يُنْسَب اليه/ لەوانە، ئەگەڕێتەوە بۆ ئەوان، لەو کۆمەڵ و تیرەو خێزانەیە.
– : مُعدل/ رێژە.
– البَحْر/ ئاستی ئاوی دەریا.
– الماء/ ئاستی ئاو.
مُتناسب/ هاورێژەیی، گونجاوی.
الوسط الـ – / نێوان هاورێژە.
غير – / ناهاورێژەیی، نەگونجاوی.
نست: ناسوت: الطبيعة البشريَّة/ خو رەوشتی مرۆڤ، سروشتی مرۆڤایەتی.
نسج:
نَسَجَ: حاكَ/ چنی.
إنسَجَ: حيكَ/ چنرا.
نَسْج: حياكة/ چنین، تەون کردن، چنراو.
نساجة: حرفة النَسّاج/ چنین، پیشەی چنین و تەون کردن.
نَسّاج: ناسج: الذي ينسج/ چنەر، تەون کەر.
نسيج: قُماش/ چنراو، کوتاڵ، قوماش.
– : كيفية النَسْج او تركيبه/ پێکهاتن، چنین.
– في التشريح/ ئەتەم.
– العنكبوت: بيته/ هێلانەی جاڵجاڵۆکە.
مِنْسَج: آلة نسج الأقمشة/ تەون، دەسگای جۆلایی.
– آلي/ مەکینەی تەون.
مَنسوج نُسج/ چنراو.
منسوجات: اقْمِشَة/ کوتاڵ، قوماش.
نسخ:
نَسَخَ. إنتَسَخَ: ابْطَلَ. أزالَ/ هەڵی وەشانەوە، لای برد، سڕیەوە، بەتاڵی کردەوە، تێکیدا.
– . – القانونَ أو الأمر: الغاه/ لای برد، هەڵیوەشاندەوە، پوچی کردەوە.
– . – الكتاب: نَقَلَهُ/ نوسخەی لەبەر (گرتەوە، نوسیەوە)، لەبەری نوسیەوە.
نسخَهُ: مسَخَهُ/ شێوەی گۆڕی، شێوانی، ناشیرینی کرد.
إستَنسَخ الكتاب: نقله و كتبهُ حرفاً حرفاً/ لەبەری (نوسیەوە، گرتەوە)، رونوسی کرد.
ناسخ: ابْطَلَ و حَلَّ مَحَلَّهُ/ ئەوی سڕیەوەو شوێنی گرتەوە، خستیە جێگەی.
تَناسَخَ: تَتابَعَ/ بەدوای یەکدا هاتن، بەدوایا هات.
– ت الأرواح: تَقَمَّصَتْ/ گیان چوە لەشێکی ترەوە.
– : نسَخَ أحدهما الآخر/ یەکێکیان ئەویتریانی پوچ کردەوە.
نَسْخ: إبطال/ هەڵوەشاندن، سڕینەوە، بەتاڵ کردنەوە، پوچ کردنەوە.
– : نَقْل/ نوسخە لەبەر (نوسینەوە، گرتنەوە).
– : إنتقال النفس من بدن الى بدن/ گیانێك لە لەشێکەوە بچێتە لەشێکی ترەوە.
خَطّ الـ – . الخَطّ النُسخي/ جۆرە نوسینێکی خەت خۆشیە، خەتی نوسخ.
نُسْخَة: صورة منقولة/ رونوس، لەبەرگیراو، نوسخە.
– : عَدَد/ دانە، ژمارە.
– : خَطِيَّة/ دەست نوس.
– : طبق الأصل/ دانەی دەق نوس، نوسخەی دەق نوس.
ناسِخ: مُبْطِل/ هەڵوەشێن، تێکدەر.
– . نَسّاخ: ناقل المكتوب/ لەبەرگرەوە، ئەینوسێتەوە.
إستنساخ: ناقل الكتاب/ رونوس، لەبەرگرتنەوە.
تَناسُخ الأرواح: تَقَمُّص/ گیان لە لەشێکەوە بچێتە لەشێکی ترەوە.
– : تَتابُع/ بەدوایی یەکدا چون.

مَنسوخ. مُنَسَّخ: اِبطِل/ هەڵوەشاو، تێك چو، بەتاڵ کراو.
— . — : منقول/ لەبەرگیراو، لەبەر نوسراو، نوسخە.
نسر:
نَسَرَ: نَسَّرَ: مَزَّقَ/ دڕانی، هەڵیوەشان.
— . — : حَلّ. فَكَّكَ/ هەڵی وەشان، شی کردەوە، خاوی کردەوە.
تَنَسَّرَ. إنْتَسَرَ طرف الحبل. إنْتَشَرَ/ شیبووەوە، خاوبووەوە.
— : تَمَزَّقَ/ دڕا، هەڵوەشا.
— الثوبُ: إهتَرَى/ پوا، رزی، شیبووەوە، پوکایەوە، هەڵوەری.
— الجرحُ: سالت مِدَّته/ کێمی لێهات.
نَسْر: اكبر الطيور/ سیسارك، سیسارکە کەچەڵە، سەرگەڕ.
— الحافِر: لَحْمَة في باطنه/ گۆشتی ناوسم.
الـ — الفَحّاح/ هەڵۆ.
نَسْرَه: قطعَة/ پارچە، کوت.
— خَشَب: قطع صغيرة من الخشب/ تەلاش، تەڵەزم.
نُسارِيَّة: عُقاب/ داڵ.
نَسرين: نبات كالنرجس/ نەسرین.
ناسور: مرض/ ناسۆر.
— استي أو شرجي/ ناسۆری کۆم.
مِنْسَر الطائر: منقار/ دەنوك.
نسغ:
نُسْغ النبات: لَبَنَهُ. سائل يجري في ساق النبات/ ئاووگ.
الـ — الصاعد/ ئاوگی (بەرزەڕۆ، سەرکەوت).
الـ — النازِل/ ئاوگی (نزمەڕۆ، داکەوت).
نسف:
نَسَفَ. إنْتَسَفَ البناءَ: قَلَعَهُ/ روخانی، رمانی، هەڵی کەند، تێکی دا، وێرانی کرد.
— . انْسَفَ. بَدَّدَ/ پەرش و بڵاوی کردەوە، هەڵیوەشان.
— بالمِنْسَف: غَربَلَ/ بێژایەوە، هەڵیتەکان.
نُسافَة المِنْسَف: مايسقط من الغربال/ بن بێژنگ.
نَسّافَة: سفينة حربية/ کەشتی جەنگ.
مِنْسَف. مِنسفَة: غربال كبير/ کەو، بێژنگ.
مِنْسَفَة: آلة يُقلَع بها البناء/ رمێنەر، خانو رمێن.
نسق:
نَسَقَ. نَسَّقَ: رَتَّبَ/ ڕێکی خست، رازانیەوە.
— . — : نَظَمَ/ هۆنیەوە، کردی بە پەتەوە.
إنْتَسَقَ. تَناسَقَ. تَنَسَّقَ: تَرَتَّبَ. إنْتَظَمَ/ ڕێك (بو، و پێك بو)، رازایەوە.
نَسَق. تَناسُق: ترتيب/ ڕێك و پێکی، پێوەدان، رازانەوە.
— : نظام/ ڕێگە، شێواز، ڕژێم.
نَسْق. تَنسيق: ترتيب/ ڕێك خستن.
مُنَسَّق: مُرَتَّب/ ڕێك خراو، ڕێك و پێك، رازاوە.
نسيق. مُتَسَّق: مُتَناسق الترتيب و الاجزاء/ ڕێك و پێك، شیاو، گونجاو، لەبار.
نسك:
نَسَكَ. تَنَسَّكَ. تَزَهَّدَ و تَعَبَّدَ/ بو بە سۆفی، دەستی دایە سۆفێتی و خواپەرستی.
— الثوبَ: غسله و طَهَّرَهُ/ شتی، پاکژی کرد.
نَسُكَ: صار ناسكاً/ بو بە سۆفی خواو ئایین پەرست.
نُسك. نُسُك: تَعَبُّد/ خواپەرستی، ئایین پەرستی سۆفێتی، گۆشەگیری.
— : ذَبيحَة/ قوربانی.
— : دَمّ/ خوێن.
ناسك: مُتَعَبِّد/ خواپەرست، ئایین پەرست، سۆفی، گۆشەگیر.
مَنْسك: صومَعَة. خُلْوَة/ کونجی خواپەرستی.
مَناسك الحَجّ: عباداته/ شێوازی حەج.
مَنسوك. ثوب منسوك: مغسول و مطهر/ شۆراو، پاکژ.
نسل:
نَسَلَ. انْسَلَ: وَلَدَ/ (منداڵ بەچە)ی بو (نەوە، وەچە)ی خستەوە

– . – الريشَ او الصوفَ: اسقطه/ فڕێیدا، وەرانی تولەك بو.

– . – . نَسَّلَ: حَلّ/ كردیەوە، شیكردەوە.

تَناسَلَ القومُ: توالدوا و إنسَلَ بعضهم بضعضا/ زاوزێیان كرد، وەچەیان خستەوە.

– من فلان: انحدر من/ لەو كەوتووەتەوە.

نَسْل: ذُرِيَّة/ وەچە، بەچە، منداڵ، نەوە، وەجاخ.

من – : سليل/ لەخێزان و نەوەی..

إنقراض الـ – / ناو كوێر بونەوە، نەوە نەمان، رەگەز برانەوە.

نَسْل. تَنْسيل: حَلّ/ وەرین، لێبونەوە، شیبونەوە.

تَناسُل: وِلادَة. توليد. توالد/ زاوزێ، وەچەو نەوە خستنەوە.

اعضاء الـ – / ئەندامی زاوزێ، زائەندام.

تَناسُلي: جِنس/ زائەندامی، پەیوەندی هەیە بە زاوزێوە.

مرض – / نەخۆشی زائەندام.

نَسُولَة: تُقْتَنى للنسل/ كەڵ، نێرەوەز، نێرەی چاك، ئاژەڵی تەرخان كراو بۆ زاوزێ.

نُسال. نُسالة. نَسيل: ما يَسقُط من الريش او الشعر عند النسل/ تولەكی و روتانەوە كاتی زاوزێ، توك و پەڕی وەریو.

– الحِبال و امثالها/ پروش.

نسم:

نَسَمَت. نَسَّمت. تَنَسَّمَت الريح: تَحَرَّكت و هَبَّت/ با هەڵی كرد، كزەی با هات، شەماڵ هات، شنەی شەماڵ هات.

نَسَمَ. نَسِمَ الشيءُ: تَغَيَّرَ/ گۆڕا.

نَسَّمَ الأسيرَ: أطْلَقَهُ/ بەریدا، ئازادی كرد، سەرفرازی كرد.

– في الأمر: إبتدأ/ دەستی پێ كرد دەستی دایە.

تَنَسَّمَ: تَنَفَّسَ/ هەناسەی (دا، وەرگرت).

– المكانُ بالطيب. ارجَ/ بۆنی خۆش بو، شوێنەكەی بۆن خۆش كرد.

– الخَبَرَ: تَشَمَّمَهُ/ هەواڵی (بیست، زانی)، مرومۆشی هەواڵی كرد.

نَسَمْ: نَفَس الروح/ هەناسە.

نَسَمَة: إنسان/ مرۆڤ.

– : كل مخلوق حَيّ/ گیانەوەر، زیندەوەر، گیان لەبەر.

– هواء: هَبَّة هواء/ كزەی با، كزە، شنە.

– : رَبو/ نەخۆشی تەنگەنەفەسی.

نَسيم: ريح لَيِّنَة/ شەماڵ، كزەبا، سروە، شنە، بای ماشەڵان.

مَنْسِم البعير: خُفّ/ سمی وشتر.

نسو:

نَسا: عرق من الورك الى الكعب/ دەماری لاق.

مرض عرق الـ – / دەردە لاق، كەژۆك.

نِسْوَة. نُسْوَة. نِساء. نِسوان: جمع إمراة/ ژنان، ئافرەتان، چەند ئافرەتێك.

نِسْوي. نُسْوي. نِسائي: نسبة الى النِسْوَة و النُسْوَة/ ژنانە، هی ئافرەتان.

نسي:

نَسِيَ: ضد تَذَكَّرَ/ بیری چو، بیری چوەوە، لەبیری چو، لە یادی (چو، كرد).

– : غَفَلَ عن/ فەرامۆشی كرد، گوێی نەدایە، لەبیر خۆی بردەوە.

نَسَّى. انْسَى: حَمَلَ على النسيان/ لەبیری بردەوە.

تناسى: تظاهَرَ بالنسيان/ خۆی وا پیشان دا كە (لە بیری نەماوە، بیری چۆتەوە).

– : حاوَلَ ان يَنْسَى/ ویستی (لە بیری بچێتەوە، لەبیر خۆی بەرێتەوە).

نَسْي. نِسيان: سَهو. غَفْلَة/ لە بیرچونەوە، لەبیر كردن، لەیاد كردن.

نِسيان. داء النسيان: مَرض النَسَّى/ دەردی (بیرچونەوە، لەبیر نەمان).

– : صَفح/ لە دڵ دەرچون، لە بیرچونەوە، لێبوردن.

اصْبَحَ في زوايا النسيان/ لە بیرچوەوە، لە بیرا نەماو.

نَسّاء. نَسِيّ. نَسْيان: كثير النسيان/ بیر خراپ، شتی زۆر لەبیر ئەچێتەوە.

مَنْسي: مانسيَ/ له بیرهوهچو، له بیرچوهوه، له بیر نهماو، بیرکردو

– . منْسو: الذی أصیب نساه/ کهزۆکیهتی، توشی دهرده لاق بو.

أنْسي. نَسا: عِرق فی الساق/ دهمارێکه له لاقدا

نش:

نَشَّ: ازَّ/ هاته کولّ، قولّپه قولّپی هات، دهنگی کولّانی هات، کولا.

– : جَفّ/ وشکی کرد، وشك بو.

نشیش: صَوت الماء و غیره إذا غَلیَ/ قولّپه قولّپ، دهنگی کولان.

ورق نشّاش. ورق نشّاف/ کاخهزی ناوهڵچنه.

نَشْنَشَ. تَنَشْنَشَ: کان خفیفاً فی حرکاته/ (رۆح سوك، سوکهڵه، بزێو، دهست سوك) بو.

– . – : إنْتَعَش/ بوژایهوه.

– ت القدر: بقبقت عند الغلیان/ قولّپی دا، قولّپهقولّپی هات، کولا.

نَشْناش: خفیف الید عند العمل/ دهست سوك، سوکهڵه، چابوك.

نشا:

نَشَأَ. نَشُؤَ: حدَث/ رویدا.

– . – : نَما/ گهشهی کرد، گهوره بو.

– . – : بَدَأ/ دهستی پێکرد.

– . – : نَتَجَ/ پهیدابو، دروست بو، پێك هات.

– . – الولد: شَبّ و قَرُبَ من الإدراك/ گهوره بو، دهستی بهخۆیدا هێنا، فامی کردهوه.

– . – من کذا: نَتَجَ. ظَهر/ له فلان شتهوه (رویدا، دهستی پێکرد، ههڵ گیرسا).

نَشَّأَ. أنْشَأَ: رَبّی/ پهروهردهی کرد، بهخێوی کرد.

أنْشَأ: أوْجَد. أحْدَث/ دایمهزران، دۆزیهوه، پهیدای کرد، پێکی هێنا.

– : بدَأ/ دهستی پێکرد.

– : بَنی/ دروستی کرد، پێکی هێنا.

– : أسّس/ دایمهزران.

– الحَدیث: ألّفهُ/ قسهی ههڵبهست، دروستی کرد، وتاری نوسیهوه.

– من المکان: خَرج منه/ لێوهی دهرهات، تیا پهروهرده بو، تیا گهوره بو، خهڵقی ئهوێ بو.

إسْتَنْشأ الأخبار: تتبّعها و إستقصاها/ گوێی ههڵخست، بهشوێن ههواڵ گهڕا، دوای دهنگ و باس کهوت.

نشء. نُشوء. نشأة: حدوث/ رودان، پهیدابون.

– . – : تولّد/ پهیدابون، لهدایك بون، دروست بون، وهچه، وهچه خستنهوه.

– . – : نمو و إرتقاء/ پهروهرده بون، گهشهکردن، گهوره بون.

نظریّة الـ – و الإرتقاء/ بیردۆزی پهیدابون و گهشهکردن.

نَشأة: شبیبة/ لاو، گهنج، جوان.

الـ الحدیثة: الجیل الجدید/ نهوهی نوێ، وهچهی تازه.

ناشِيء: حادث/ روداو، پهیدابو، پێك هاتو.

– : نامٍ/ پهروهرده، گهشه، گهوره.

– : الولد إذا جاوز حدّ الصِغر/ ههرزهکار.

– من کذا: ناتج/ لهوهوه پێك هاتوه، ئهنجام و بهرههمی ئهوه، بههۆی ئهوهوه روی داوه و پێك هاتوه

– : جدید. حَدیث/ نوێ، تازه.

إنشاء: إحداث. إیجاد/ دۆزینهوه، پێك هێنان، داهێنان.

– : بناء. ترکیب/ دروست کردن، دامهزراندن.

– : تألیف/ رێك خستن، نوسین، دانان.

– : موضوع إنشائی/ وتار، دانراو.

– : نصّ. أسلوب التألیف/ شێوازی نوسین، دهستهوازه، شێوهی دانان، دهق.

مُقاولة إنشائیّة/ بهڵێن دارێتی دروست کردن، قۆنتهرات.

مَنْشأ: مصدر/ سهرچاوه، بنهڕهت، بنچینه، دروستگه

– : مکان النشوء/ نیشتمان، شوێن و جێگهی تیا پهیدا بون و گهشه کردن و پهروهرده بون.

مُنْشِيء: مُؤسّس/ دامهزرێنهر، پێکهێنهر، دروستکهر.

– : مُوجد/ دۆزهرهوه، پهیداکهر، بونیار، دروستکهر، دانهر.

— : مُحَرِّر. مُؤَلِّف/ دانەر، نوسەر.

مُنْشَأة: مُؤَسَّسَة/ دامەزراوە، دەستگا، دەزگا.

**نشب:**

نَشِبَ فیه: عَلِقَ/ تێوەی ئالا، پیالکا پیاهەڵ زنا.

— العظم فی حلقه: علق فیه/ لە قورگی گیرا.

— فی الأمر: إشتبك/ تێ هەڵچو، تێوەئالا، تـوش بو.

— الظفرُ فی اللحم: نَبَتَ/ نینۆکی لە گۆشت چەقی.

— ت الحرب بینهم. ثارت و إشتبکت/ هەڵگیرسا، دایان بەیەکدا، بو بەشەڕیان، جەنگیان لە نێواندا بەرپا بو.

نَشَّبَ. أنْشَبَ: عَلَّقَ/ هەڵیواسی، تێوەی ئالان، توشی کرد، کردی بە کولکیەوە.

تَنَشَّبَ فیه: تَعَلَّقَ/ پیا هەڵواسرا، تێوەی ئالا.

نشوب حرب/ جەنگ (هەڵگیرسان، بەرپابون).

ناشب. ظفر ناشب: نام الی الداخل/ نینۆکی (لە گۆشت چەقیو، دەرنەهاتو).

نُشّاب. نُشّابة: سهم/ تیر.

نُشّابة الفطائری: شوبك طویل/ تیرۆك، تیرۆکی درێژ.

نشّاب: الرامی بالنشاب/ تیرهاوێژ.

**نشج:**

نَشَجَ: غصّ بالبکاء/ دایە پرمەی گریان، هەنسکی هەڵدا.

نشیج: غصّ/ پرمەی گریان، هەنسك هەڵدان، قوڵب دان، ناڵین.

**نشد:**

نَشَدَ. أنشدَ: طلب: بحث عن/ هەواڵی پرسی، بۆی گەڕا.

— هُ. ناشدَهُ الله و بالله: حلّفهُ. إستحلفه/ سوێندی دا.

أنشدَهُ الشعرَ: قرأهُ علیه/ هۆنراوەی (بەسەردا هەڵدا، لەسەر خوێندەوە).

أنشدَ: غنّی/ گۆرانی وت، دەنگی لێ هەڵبڕی، چریکانی، تێی چڕی).

نَشْد. نِشدان: طَلَب/ داواکردن، هەواڵ پرسین، سوسەکردن، پرسین.

ناشد: طالب/ داواکەر، هەواڵ پرس.

نشید. نشیدة. أُنشودة: اغنیة. ترنیمە/ گۆرانی، ئاواز، سرود.

— وطنی/ سرودی نیشتمانی.

مُنْشِد: مُغَنٍّ/ گۆرانی بێژ، دەنگ بێژ، سرود بێژ.

مُناشدة: قسَم/ سوێندان، سوێند خواردن.

نُوشادر. نُشادر: امونیا/ نەوشادر.

**نشر:**

نشر. نَشَّرَ: بَسطَ. مَدَّ/ ڕایخست، بڵاوی کردەوە.

— . — : ضد طوی/ کردیەوە.

— . — الغسیل: عَلَّقَهُ و بَسطَهُ/ هەڵیخست.

— الخَبرَ: اذاعَهُ/ هەواڵی بڵاو کردەوە، ڕایگەیاند، جاڕیدا.

— الخشبَ: قطعة بالمنشار/ داری بڕیەوە.

— العلمَ: رَفعَهُ/ ئاڵای هەڵ کرد، بەرزی کردەوە.

— الکتاب: طَبَعَهُ/ نوسراوی چاپ کرد، دەری کرد، بڵاوی کردەوە، پەخشی کرد.

— إعلاناً عن: اعلنه/ هەواڵی بڵاو کردەوە، ڕایگەیاند.

— . أنشرَ الله الموتی: احیاهم/ خوا زیندوی کردنەوە.

إنْتَشَرَ. تنشَّرَ: إنبسط/ بڵاوبوەوە، کرایەوە، ڕاخرا، تەنیەوە، تەشەنەی کرد.

— الخَبرُ: ذاعَ و فشا/ هەواڵ و دەنگ و باسەکە ڕاگەیەنرا، زانرا، بڵاوبوەوە.

— المرضُ: فشا/ نەخۆشی داکەوت، بڵاوبوەوە، تەنییەوە، تەشەنەی کرد.

نَشْر الأخبار و غیرها: إذاعة/ بڵاوکردنەوە، ڕاگەیاندن.

— الکتاب أو الإعلان أو الأخبار: طبع/ چاپ کردن، دەرکردن، پەخش کردن.

— الخشب: قَطْع/ دار بڕینەوە، شەق کردن.

یوم الـ — أو النُشور: القیامة/ ڕۆژی (زیندوبونەوە، حەشر، قیامەت).

نَشْرَة: إعلان/ بۆ زانین، بۆ ئاگاداری، بۆ بڵاوکردنەوە، پەخشنامە.

— يومية او اسبوعية/ پەخشنامەی رۆژانەو هەفتانە.
— رسمية/ پەخشنامەی میری.
نُشارة الخشب: ما يسقط من الخشب اثناء النشر/ ئاردە (دار، شار)، تەلاش.
نَشّار الخشب: آلة النَشر/ دار برەوە، گردە بڕ، بڕەر، شەقە مشار.
ناشِر: الذی یَنشر/ بلاوکەرەوە، راگەێن.
— الكتب: طابع الكتب و ناشرها/ چاپ کەرو بلاوکەرەوەی پەرتوك، دەسگای پەخش، چاپ کاری پەراو.
إنتشار: توزیع و تفرق/ بلاوبونەوە، تەنینەوە، تەشەنەکردن.
— المرض: تَفَشٍّ/ داکەوتن، نەخۆشی بلاوبونەوە، تەشەنە کردن، تەنینەوە.
مَنشار: آلة النَشر/ مشار، شەقەمشار، شەقەی دو دەستەکی، دار برەوە، گردەبڕ.
مَنشور: مقطوع بالمنشار/ براوە، داهاتو.
— : مُنتَشِر/ بلاو، بلاوکراوە.
— . نَشْرَة/ پەخشنامە.
— . مَوشور: جسم هندسی/ پوازك، پوازكی ئەندازەیی، سیپالو.
— ثُلاثی/ پوازکی سیانە.
— عمودی/ پوازکی وەستاو.
— مائل/ پوازکی لار.
مَنشوری: موشوری/ پوازکی، وەکو پوازك.
منتشر: مُمْتَدّ/ راخراو، داخراو، بلاو، فراوان.
— : شائع/ باو، زانراو، بلاوەبو، قاو.
نشز:
نَشَز: إرْتَفَعَ/ بەرزبوەوە، هەلسا، دەرپەڕی.
— ت المراة بزوجها و منه و علیه: إستعصت علیه/ ئافرەت لە مێردەکەی (یاخی بو، نەیویست، دەستی لێ هەلگرت، بەلەسە بو، هەلگەڕایەوە).
نَشَز: مكان مرتفع/ شوێنی بەرزو بلند، بەرزایی.
ناشِز. نَشاز: ناتیء/ دەرپەڕیو، بەرز، دەرپۆقیو، قۆقز، هەل تۆقیو.
زوجَة — او ناشِزة: عاصِیَة/ ئافرەتی یاخی و بەلەسە لە مێردەکەی.
نُشوز الزوجة: عُصیان: تَمَرُّد/ یاخیبو بەلەسەبون لە مێرد، دەست هەلگرتن، هەلگەڕانەوە.
نشط:
نَشَطَ. نَشَّطَ الحَبل: عَقَدَهُ/ گرێیدا.
— . — العُقْدَةَ: شَدَّهُ/ گرێکەی توند کردەوە.
نشطَ تَنَشَّطَ: طابت نفسه/ دلی (خۆش بو، کرایەوە)، گەشایەوە، خۆش نود بو.
— فی عمله او الی عمله: خَفَّ و اسرعَ/ بە گورجی و چابوکانە ملی نا بۆ ئیش، گورج و گۆل بو، دەست و بردی کرد.
نَشَّطَ. انْشَطَ: صَیَّرَهُ نشیطاً/ چابوکی کرد، دەست و بردی پێ کرد، هانیدا.
— . — : قَوّی عَزْمَهُ/ غیرەتی نایەبەر، ورەی دایە.
تنشیط: تحریض. تَقْوِیَة/ مان دان، غیرەت نایەبەر، گورج کردن، بەهێز کردن، ورە پێدان.
نَشاط: همّة. خِفَّة/ چالاکی، چابوکی، گورجی، چوستی، گورج و گۆلی، رۆح سوکی.
نشیط: ناشط الی عمله: هَمّام/ گورج، گورج و گۆل، بە جنگ، چابوك، چالاك.
— : خفیف الحركة/ سوکەلە، بزێو، رۆح سوك، زرنگ.
— : طَیِّب النفس/ دل خۆش، دل فراوان، شادان.
سوق — ـة. رائِجة/ بازاڕی (پڕجولەو کڕین و فرۆشت، گەرم).
اُنشوطة: عُرْوَة/ گرێ، گرێ قولفە.
— الشَنْق: حَبْل المشنقة/ پەتی سێدارە.
نشع:
نَشَعَ. إنْتَشَعَ الشیءَ: إنتزعه بعنف/ رایپسکان، فڕانی.
— الماءُ: نَزَّ. نَثَّ/ دەلانی، دایدا، پالاوتی.
نَشَعَهُ. انشَعَهُ الدواءَ: جعله فی فمه/ کردی بە دەمیەوە، تکانیە دەمی.
نَشْعذ: نَزازَة/ پالاوتن، دادان، دەلاندن.

مُنَشَّع: مُشَبَّع بالماء/ تێر ئاو، پاراو.
نشوع: نُشُوق/ برنوتی.
— : كل ما يَرِّد النفس/ ئەوەی هەناسە ئەهێنێتەوە بە بەرا.
نشف:
نَشَفَ نَشِفَ. تَنَشَّف الثوبُ العَرَقَ: شَرِبَهُ. إمتصه/ مژی، هەڵی مژی.
— . — الماءُ و البئرُ: جَفَّ/ وشکی کرد، وشکایی داهات.
— . — المُبْتَلُّ: جَفَّ/ وشك بووەوە، وشکەوە بو.
— . نَشَّفَ الماء: أزاله بالمسح/ سڕی، وشکی کردەوە.
تَنَشَّفَ: مَسَحَ الماء عن جَسَدِهِ/ خۆی وشك کردەوە.
نَشَف. نُشوفَة: نضوب الماء. جفاف/ وشك (بونەوە، کردن).
تَنْشيف: مَسْح/ وشك کردنەوە.
ناشف: جاف/ وشك، برنگ، وشك و برنگ.
— : صلب/ رەق، تونگ، تۆڵ، توندوتۆڵ.
— . نواشف. اكله ناشفه/ وشكە، خواردنی وشکە.
مِنْشَفَة الوجه: قطيلة/ خاولی.
نَشّاف. ورق نَشّاف/ ئاو هەڵچنە.
نشق:
نَشِقَ. تَنَشَّقَ. إسْتَنْشَقَ الهواءَ او الرائحة: شَمَّها/ هەناسەی وەرگرت، بۆنی کرد، هەڵیمژی.
تَنَشَّقَ. إسْتَنْشَقَ الماءَ في أنفه: صَبَّهُ فيه/ ئاوی کرد بە لوتیا، ئاوی لە لوتی وەردا.
— . — السَعوط أو النشوق شَمَّهُ/ برنوتی هەڵمژی.
نَشْق. تَنَشُّق. إستنشاق: شَمّ/ بۆن کردن، هەڵمژین، هەناسەوەرگرتن.
نشوق: سَعوط/ برنوتی.
مَنْشَق: انف/ لوت، کەپو، برناخ، برناخە.
نشل:
نَشَلَ. إنْتَشَلَ: نزع و خَطَفَ بسرعة/ رای پسکان، پڕی پیاکرد، فڕانی، بردی.
— . — : خَلَّص. أنْقَذَ/ رزگاری کرد، فریای کەوت، گەیی بە هانایا.
— : سَلَبَ/ دزی، فڕانی، جەردەیی کرد.
— جيبه: سَلَبَهُ/ گیرفانی بڕی.
نَشْل: سَرِقة الجيُوب/ گیرفان بڕین.
نَشّال: سارِق الجيوب/ گیرفان بڕ.
نشم:
نَشَمَ اللحمُ: إنْتَنَّ قليلاً/ بۆگەنی کرد، تامی گۆڕا، تێك چو.
نشو:
نَشِيَ. إنْتَشَى: سَكِرَ/ سەرخۆش بو، مەست بو.
— الخَبَر: تَخَبَّرَهُ/ گوێی هەڵ خست، چوە بنج و بناوانی هەواڵەکە.
نَشّى القماشَ: عالجَهُ بالنشاء/ نیشاستەی لێدا، بە نیشاستە دەقی پێ گرت.
نَشْو. نَشْوَة: سُكر/ سەرخۆشی، مەستی.
نَشْوَة: أول السُكر/ گرتن، سەرەتای مەستی، سەرگەرم بون.
— الطرب: إبتهاج/ خۆشی، بەزم.
نَشْوان: سكران/ مەست، سەرخۆش.
— : طروب/ دڵخۆش، لەبەزمایە.
نَشا. نَشاء/ نیشاستە.
— . نَشْوَة: رائِحَة/ بۆن.
نَشْوَة: سُكر أو اوله/ سەرگەرمی، سەرەتای سەرخۆشی.
مُنَشّى: فيه نَشا/ نیشاستاوی.
قميص — / کراسی یەخە رەق و نیشاستاوی.
نَشَوي: مِن النَشا/ لە نیشاستە دروستکراو.
النَشَويات/ نیشاستەمەنی.
نَشيان: مُلْتَقِط الأخبار/ گوێ هەڵخەر، هەواڵ (زان، دۆن).
نص:
نَصَّ. نَصَّصَ: رَصَّ/ خستیە سەریەك، ریزی کرد.
— الحديثَ: أسْنَدَهُ الى قائله/ قسەو وتارەکەی گەڕانەوە بۆ خاوەنەکەی، دایەوە پاڵ وتیارەکەی.

ن

- **الكلام او الرسالة: هَذَّبَهُ و سَطَّرَهُ**/ دەقی وتە یا نامیلکەکەی پوختەکرد، ڕێك نوسیەوە، ڕێکی خست.
- **علی: عَيَّنَ. حَدَّدَ**/ دیاردی کرد، بڕیتی بو لە.

**نَصّ: تحدید المعنی**/ واتا و مەبەست دەرخستن.
- **الکتاب: خلاف الشرح**/ دەق، ناوەڕۆك، نوسراو.
- **: شَرط**/ مەرج، مەبەست.
- **: عِبارَة. اسلوب التعبیر**/ شێواز، تێکست، شێوەی دەربڕین.

**مَنصوص علیه: مُعَیَّن**/ دیاری کراو، ناسراو، دەرخراو، باسکراو.

**مِنَصَّة: کرسی**/ کورسی، تەخت.
- **الخطابَة: مِنبَر**/ دوانگە، مینبەر.
- **التصویر: حامل جهاز التصویر**/ سێپا، سێپای وێنەگەری.
- **القُضاة**/ کورسی داوەر.

**نُصَّة. ناصیة: قُصَّة شَعر**/ پەرچەم، لیسپەقژ.

**نصب:**

**نَصَبَ: رَفَعَ. أقام**/ دای مەزران، بەرزی کردەوە، دروستی کرد.
- **الخَیمَة: ضَرَبَها**/ (رەشماڵ، چادر، دەوار)ی هەڵ دا.
- **الشجرة: غرسها**/ دایچەقان، ڕوانی، لێی دا، درەختی ناشت.
- **شرکاً: وَضَعه**/ (تەڵە، داو)ی نایەوە.
- **هُ المرضُ او الهمُ: اتْعَبَهُ**/ شەکەتی کرد، پەرێشانی کرد، ماندوی کرد.
- **علیه: غَشَّهُ**/ فێڵی لێ کرد، گزی لێکرد، دەستی بڕی، پێی رابوارد، ساختەی لەگەڵ کرد.
- **له و ناصَبَهُ الشَرَّ: اظهَرَهُ له**/ خۆی بۆ نایەوە، شەڕی پێ فرۆشت.
- **له: عاداه**/ (بەربەرەکانی، دوژمنایەتی) لەگەڵ کرد.
- **له الحربَ: اقامها علیه**/ جەنگی بەرامبەر بەرپاکرد، چو بەگژیا، شەڕی پێ فرۆشت.
- **. نَصَّبَ: وَلّی مَنصباً**/ دایمەزران، کاری پێ سپارد، دامەزرا، کاری پێ سپێردرا.

**ناصَبَ: عادی و قاوم**/ دوژمنایەتی لەگەڵ کرد، بەرەهەڵستی کرد.

**نَصَّبَ اذنیه: رفعها. ارْهَفَهُما**/ گوێ (قولاخ بو، ی هەڵ خست).

**نَصِبَ: جَدَّ و إجْتَهَد**/ کۆششی کرد، رەنجی دا، چەوسایەوە، کۆشا، تێکۆشا.
- **: تعب و اعْیا**/ شەکەت، بو ماندو بو، وڕ بو.

**انْصَبَ: اتْعَبَ**/ شەکەتی کرد، چەوسانیەوە، ماندوی کرد.
- **: جَعَلَ له نصیباً**/ بەشی دا، بەشی تێخست، بەشدار کرد.

**إنْتَصَبَ: قام**/ ڕاست بوەوە، هەڵسا، بەرزبوەوە، رەپ بو.

**نَصْب: إقامَة. رَفع**/ دامەزراندن، دروست کردن، هەڵسان، بەرز کردنەوە.
- **: داء. مرض**/ دەرد، نەخۆشی، خەستەیی.
- **: إحتیال. سَرِقَة**/ گزی، فێڵ، دزی، ساختەچێتی، داونانەوە.
- **. نُصُب. نُصْب: الشیء المنصوب**/ دامەزراو، هەڵساو، دروستکراو، پەیکەر.
- **البندقیة**/ خستنە سەرپێ.
- **الشَرَك**/ داونانەوە.

**نُصُب. نُصْب: صَنَم**/ پەیکەر، بت، کوتەڵ.
- **. - تذکاری: الشيء المنصوب**/ یادە پەیکەر، پەیکەری یادداشتی.
- **. - عینی: امام عینی**/ (بە پێش، بەبەر) چاومەوە، لەبەرچاوم دا، لەبەردەمما.

**وَضَعَ الأمرَ - . - عینیه**/ خستیە (بەرچاوی، بەردەمی).

**إنتصاب: قیام**/ هەڵسان، بەرزبونەوە، ڕاست بونەوە، ڕەپ بون.

**مَنْصَب: مقام**/ جێ، جێگە، نزرگە، جێو ڕێ، شوێن.
- **: وظیفة**/ کار، فرمان، ئیش.

**ارباب المناصب**/ خاوەن (جێو فرمان، جێو ڕێ، پایە).

**منصوب: مُقام**/ دامەزراو، هەڵساو.

مُنْتَصِب: قائم/ قنج، قنج و قيت، هەڵساو، رەپ، راوەستاو، قوت، قيت.

نصيب: حصَّة/ بەش.

— : حَظّ/ شانس، بەخت.

يا — : قُرعَة/ پيانقۆ، پشك هەڵدان، خۆو بەختى، يانسيب.

نَصَبٌ: كَدّ/ كۆشش، رەنجدان، تێكۆشان، چەوسانەوە.

— : تَعَب. اعياء/ شەكەتى، هيلاك بون، ماندويى.

— : عَلَم منصوب/ ئالاى هەڵكراو، بەياخى هەڵكراو.

نُصْبَة: مَعْلَم الطريق/ رێپيشان دەر، رابەر، رێنيشان.

نُصْبَة: علامَة النَصْبَة/ سەر.

نِصاب: اصل/ بنەڕەت، سەرەتا، دۆخ.

— السكين: مِقْبَض/ دەسك.

— السيف و الخنجر: مِقبض/ مشتۆ.

الـ — القانوني: إكمال العدد/ ژمارەى تەواوى ياسايى.

رَدّ كذا الى — ـه: رَدَّهُ الى ماكان عليه/ گەڕانيەوە بۆ دۆخى خۆى، وەك خۆى لێكردەوە.

نَصّاب: مُحتال. دَجّال/ فێڵباز، تەڵەكەباز، ساختەچى، كەڵەكچى، گزى كار.

مِنْصَب: حديد تحت القدر/ سێپا، سێكوچكە.

نصت:

نَصَتَ. أنْصَتَ لـه: اصغى/ گوێى (لێگرت، بۆ شل كرد).

تَنَصَّتَ: تَسمَّعَ خِفيَةً/ بەدزيەوە گوێى گرت، گوێى (گرت، هەڵخست)، خۆى لێگرت.

نَصْت. نُصْتَة: تَسَمُّع/ گوێ (لێگرتن، لێبون).

تَنَصُّت: تَصَنُّت/ گوێ (گرتن، هەڵخستن)، خۆ لێگرتن.

مُتَنَصِّت: مُتَصَنِّت/ گوێ گر.

نصح:

نَصَحَ الرَجُلَ و لـه: قَدمَ لـه نَصيحَة. وَعظَة/ ئامۆژگارى كرد، پەندى دادا.

— الرَجل و له المَودَّة: اخلصها/ دڵسۆز (بو، بو لەگەڵى، ى كرد، ى لەگەڵ نواند).

ناصَحَ: تبادل النُصْح/ ئامۆژگارى يەكتريان كرد.

إسْتَنصَحَ: طلب نَصيحة/ راوێژى پێكرد، پەندو ئامۆژگارى لێ خواست.

نُصْح. نَصيحَة: مَشوره. مَوْعِظَة/ ئامۆژگارى، راوێژ، تەمێ، پەند، فەرمايشت، فەرمودە.

ناصِح: مُقَدِم النَصيحَة/ ئامۆژگار.

— . نَصوح: صادِق/ راست، دڵسۆز، راستگۆ.

نصر:

نَصَرَ. ناصَرَ: أعان/ يارمەتىدا، ياريدەىدا، پشتى گرت.

— ـهُ من عَدُوِّهُ: نَجّاهُ منه/ لە دوشمن رزگارى كرد، فرياى كەوت.

— ـهُ على عَدُوِّه: اعانه عليه/ يارمەتىدا، پشتگيرى كرد، بەسەر دوشمنا زاڵى كرد.

— الله فلاناً: اعانه و اعطاه/ خوا سەرى خست و پێى بەخشى، خوا دايە.

نَصَّرَ: جعله نَصرانياً/ كردى بە (گاور، فەلە).

تَنَصَّرَ: صارَ نَصرانياً/ بو بە (گاور، فەلە).

— لـه. ناصَرَهُ: سَعى فى نصره/ دەستى يارمەتى بۆ درێژ كرد، ياريدەى دا، بۆى تێكۆشا، چو بە هاواريەوە، پشتگيرى كرد.

تناصَروا: تَعاوَنوا يارمەتى يەكتريان دا، پشتى يەكتريان گرت، هاوكارى يەكتريان كرد.

إنتَصَر: غلب و فاز بالنصر/ سەركەوت، برديەوە، زاڵ بو.

— على ضِدِّه: غلبه/ زاڵ بو بەسەر دوشمنيا، سەركەوت بەسەريا، شكانى.

— من ضِدِّه: إنتقم منه/ تۆڵەى لێسەندەوە.

ناصِر. نصير. نَصار. نَصور: مُعين/ پشتگير، دەست گير، يارمەتى دەر، دۆست.

من انصار: من أعوان. موالٍ/ سەر بە، لەگەڵ.

نَصر. إنتصار: فَوْز. غَلَبَة/ سەركەوتن، بردنەوە، زاڵ بون.

— . نُصْر. نُصْرَة مَعونَة/ يارمەتى، باربو، هاريكارى.

إنتصار: ظَفَر/ سەركەوتن، دەستكەوتن، بردنەوە.

مَنصور. مُنْتَصِر: فائز. ظافر/ سەركەوتو، براوە.
نصرَة: اسم المرّة من نصر/ يارمەتى دانێك.
نَصْرَة: حُسْن المَعونَة/ يارمەتى و پشتگيرى دلسۆزانە.
نَصراني: مسيحي/ گاور، ديان، خرستيان، فەلە.
النَصْرانِيَّة: الديانة المسيحية/ ئاينى گاور.
تَنْصير: عماد/ بە گاور كردن.
نصع:
نَصَعَ الأمْرَ و الحَقّ: وَضَحَ/ ئاشكرا بو، دەركەوت، رون بوەوە.
– . انْصَعَ بالحَقّ: اقَرّ بە/ دانى پيانا، دركانى، چوە ژێرى.
ناصع. نَصيع. واضِح/ ديار، ئاشكرا، رونەوەبو.
– . – : خالِص/ پوخت، رون، ساف.
– البياض: خالِص. صافٍ/ سپى، بێخەوش، بێگەرد.
حَقّ – : ظاهِر/ مافى رەواى ئاشكراو بێخەوش.
دليلٌ – : واضِح/ بەلگەى بێ پێچ و پەنا، ئاشكرا.
حُبٌّ – : خالص من كل لؤم/ دلدارى پاك، بێخەوش.
نصف:
نَصَفَ: بَلَغَ النِصف/ گەيشتە (ناوەڕاست، نيوەى)، نيوەيى كرد.
– الشيءَ: اَخَذ نِصْفَهُ/ نيوەى برد.
– . نَصَّفَ الشيءَ: قَسَّمَهُ نصفين/ كردى بە (دو كەرتەوە، دو بەشەوە)، لەتى كرد.
– . – إنتصف النهار: بلغ نصفه/ رۆژ گەييە نيوەى، بو بە نيوەڕۆ.
– . انتصف الرَجُلَ: عامله بالعدل/ بەداد بو لەگەلى.
– . – الرَجُلُ: كان عادلاً/ بە داد بو، راست بو.
– . – . تَنَصَّفَ الرجلَ: خَدَمَهُ/ خزمەتى كرد، بە تەنگيەوە هات.
تَنَصَّفَ. إنتَصَفَ. إسْتَنْصَفَ: طلب الإنصاف/ داواى دادى كرد.
– . – . منه: إنتقم/ تۆلەى لێسەندەوە.

ناصَفَ: إقتَسم مُناصَفَةً/ بەشى كرد، لە ناوەڕاستدا بەشى كرد، كردى بە (نيوەيى، دوبەش).
نِصف اَحَد قسمي الشيء/ نيو، نيوە، لەت، كەرت.
– : مُتَوَسِّط/ ناوەڕاست، نيوە، ناوەند.
– . نَصَف. متوسط العُمُر/ ناوەڕاستى تەمەن، ناوەندى تەمەن.
– . مُنْتَصَف: وسط/ ناوەڕاست، ناوەند.
– دائرة/ نيوەبازنە.
– ساعَة/ نيوسەعات.
– قُطر/ نيوەتيرە.
– او منتصف النهار/ نيوەڕۆ، ناوەڕاستى رۆژ، ناوەندى رۆژ.
– او – الليل/ نيوەشەو.
– او – الشتاء/ ناوەڕاستى زستان.
– او – الصيف/ ناوەڕاستى هاوين.
– او – الطريق/ چەقى رێگا، ناوەڕاستى رێگا.
– عُمُر: مستعمل/ بەكارهێنراو، نيوەتەمەن.
– . نَصَف. نَصَفَة عَدْل/ داد.
إنصاف: عَدل/ داد.
بـ – : بالعدل/ بە دادانە، داوەرانە.
تنصيف: شَطر/ لەت كردن، كردن بە دو بەش، لە ناوەڕاستدا (لەت كردن، بەش كردن).
مُناصَفَة: بالتساوي/ بە نيوەيى.
مُنصِف: عادل/ بەداد، داد (گەر، وەر، پەروەر، پەرست، مەند).
مُنَصِّف: شاطر/ لەت كەر، دوكەرت كەر.
مُنْتَصَف: وَسَط/ ناوەڕاست، ناوەند.
مَنْصَف. مِنصَف. ناصِف: خادِم/ ئيشكەر، بەردەست.
نصيف: كل ما غَطّى الراس/ سەرپێچ، سەربەست، كلاو، مێزەر، پەچە.
نصل:
نَصَلَ. تَنَصَّلَ من كذا: تَخَلَّصَ/ رزگارى بو، قوتار بو، خۆى (رزگار كرد، كێشايەوە).
– . – من كذا: خَرَجَ/ دەرچو، دەرهات.

- اللونُ: تَغَيَّر/ چوەوە، گۆڕا، ڕەنگی گۆڕا، تێك چو.
تَنَصَّلَ من: تَبَرَّأ/ سەرفراز بو، رزگاری بو قوتار بو.
نصل الرمح و السهم: سِنانُهما/ نوك، نوکەرم.
- السكين: حدته/ دەم، دەمەچەقۆ.
- المغزل: حديدته. سُرْسُور/ قولاپی سەرەتەشی، بەردوخ.
- الريشه/ لاسكی پەڕ.
- الورقه/ دارك، دەمار.

**نصو:**
ناصِيَة: شَعر مُقَدَم الراس/ پەرچەم.
- : مُقَدَم الراس/ پێشەسەر، ناوچەوان.
- : رُكن/ قوژبن، گۆشە، کونج، قورنە.
نصيب (فی نصب)

**نض:**
نَضَّ الماءُ: رَشَحَ. سال قليلاً قليلا/ تکا، دڵۆپا، پالاوتی.
نَضْنَضَ: حَرَّك/ جولانی، بزوانی.
نَضّ: نَقد/ دەستی، دراوی دەستی.
نَضّاً: نقداً/ بەدەستی.
نضال (فی نضل)

**نضب:**
نَضَبَ الماءُ: غار فی الارض/ زەویەکە قوتی دا، چوە ناو زەویەکەوە.
- النهرُ: ذَهَبَ ماءُهُ/ وشکی کرد، وشك بو، وشکایی دامات، ئاوی تیا نەما.
- الشيءُ: نَفَذَ/ نەما، تەواو بو، بڕایەوە، کۆتایی هات، بنەبڕ بو.
- : ماتَ/ مرد، کۆچی کرد، گیانی دەرچو.
- ماءُ وجهه: اصبح لا يستحی/ شەرمی تکا، ئابڕوی نەما.
لا يَنْضَب: لا يَفْرَغ/ لێی ناچێ، بەتاڵ نابێتەوە، تەواو نابێ، نابڕێتەوە، کۆتایی نایەت.
نُضوب: نَفاذ/ تەواوبون، نەمان، بڕانەوە، کۆتایی هاتن.
ناضِب: لا ماء ولا خير فيه/ وشك، بێکەڵك، بێفەڕ، تەڕایی تیا نیە.
- : غير مُثمر او مُنتج/ بێبەر، بێکەڵك، بێبەرهەم.

**نضج:**
نَضَجَ الثَمَرُ: أدرك. إستوی/ پێگەیی.
- الطبخُ: إستوی/ دەمی کێشا، پێگەیی.
- الأمرُ او المشروع. اكمل. تَمّ/ تەواو بو، هاتەبەرهەم.
انْضَجَ الثمر او الطبخَ: جعله ناضجاً/ پێی گەیاند.
نَضْج. نُضْج بلوغ إدراك. كمال النمو/ گەورەبون، بزەڵەبون، خۆش بون، پێگەیین.
- . - : إستواء/ کولان، دەم کێشان، پێگەیین، گەیین، گەیشتن.
ناضِج. نضيج للثمر و الحبوب/ گەییو، بەکام، زەرد، دەنك کردو، پێگەییو.
- . - للطبخ/ دەم کێشاو، پێگەییو، کوڵاو.
- . - الرای: محکم/ کارامە، رادروست، تێگەیشتو.

**نضح:**
نَضَحَ بالماءُ. رَشَّ/ ئاوی (پیاکرد، لێپرژان، ئاو (رشێنی کرد، پرژێنی کرد).
- بالماء: بَلَّلَ/ تەڕی کرد، لەئاوی هەڵکێشا.
- عَطَشَهُ: سَكَنَهُ/ تینوێتی شکان.
- الإناءُ: رَشَحَ/ لێی تکا، دەڵانی، ئاوی لێچو، پالاوتی.
- الجسدُ. عَرِقَ/ ئارەقی (کردەوە، دەردا).
- الشِواءُ بالدهن: سأسأ/ رۆنی لێتکا، چزەچزی کرد.
- العَرَقُ و کل سائل: خَرَجَ/ دەریدا، دەرمات، لێ چو.
نَضْح: رَشّ/ ئاو (پیاکردن، رشتن، رشێن).
- : رَشح/ ئاودەردان، دەردان، لێچون، پالاوتن، دەڵاندن.
نَضّاحَة. مِنْضَحَة: مِرَشَّة/ ئاوپرژێن.

**نضد:**

نَضَدَ. نَضَّدَ: رَكَمَ/ كۆمەڵی كرد، كۆی كردەوە، كەڵەكەی كرد، هەڵیپەسارد، پەسیسەی كرد.

— . — : نَسَّقَ/ ڕێكی خست.

**نَضَد. مَنْضَدَة: سرير الرقاد/** چەرپایە، قەرەوێڵە، تەخت.

**مَنْضَدَة: مائدة. مكتب/** مێز.

**نَضيدَة: حَشيَه. وسادة/** سەرین، بالیف، دۆشەك.

**نضيد. مَنضود. مُنَضَّد: مُرَصَّف. مضموم بعضه على بعض/** ڕێكخراو، هەڵ پەسێرراو، كەڵەكراو.

**نضر:**

**نَضَرَ. نَضِرَ. نَضُرَ. انْضَرَ الوجه و النبات: نَعِمَ و حَسَنَ وكان جميلاً/** جوان بو، گەشایەوە.

— . — . — **اللون: زَهَا/** شەوقی دایەوە، بریسكایەوە.

**نَضِر. نضير. ناضِر: زاهي. مُزدَهِر/** گەشاوە.

**ناضِر: ناعم او حَسَن/** نیان، نەرم و نیان، نوێ، تازە، جوان.

**لون — : شديد/** ڕەنگی تێر، تۆخ.

**نَضرَة. نَضارَة. زهاء/** گەشاوەیی، نەرم و نیانی.

— : **غنى/** ساماندارێتی، خۆشی، دەوڵەمەندی، دارایی.

**نَضارَة الشباب/** (سێرەی، هەرەتی) لاوی، تافی گەنجێتی.

**نُضار. نضير: ذَهَب/** زێڕ، ئاڵتون.

**نضل:**

**نَضَلَ: غلبَ/** پێشكەوت، زاڵ بو، سەركەوت، بردیەوە.

**ناضَلَ: بارى/** گرەوی كرد، پێش بڕكێی كرد.

— **عنه: حامى و جادل و دافع عنه/** بەرگری لێكرد.

— : **جاهَدَ كافَحَ/** خەباتی كرد، ڕەنجی‌دا، تێكۆشا.

**تناضلوا: تفاخَروا/** خۆیان هەڵكێشا.

— : **تبارو في النضال/** پێش بڕكێیان كرد، گرەویان كرد.

**نِضال. مُناضلة. مُنازَعَة. مُغالَبَة/** پێش بڕكێ، گرەو.

— — : **جهاد. كفاح/** خەبات، تەقەلا، تێكۆشان، ڕەنج دان، كۆشش.

**نط:**

**نطَّ: وَثَبَ. قَفَزَ/** بازیدا، قونەی كرد، هەڵقونی.

— **الحبْلَ: لعب بالحبل/** پەت پەتێنی كرد، بە پەت باری كرد.

— **على: سَفَدَ/** سواری بو، پەڕی، كەڵیدا، لێی نیشت.

**نَطَّطَ: جعله يَثب/** بازی پێدا.

**نَطَّة: وَثْبَة/** باز، هەڵقونین.

**لُعْبَة الـ — : دُبَّاخ/** دایماسۆن، سنگەوباز، كەوشەك.

**نَطَّاط: وَثَّاب/** بازدەر.

**نطح:**

**نَطَح. ضَرَبَ براسه او بقرنه/** قۆچی (لێدا، وەشان)، كەللەی لێدا.

**تَناطَح. إنْتَطح الكبشان: نَطَحَ احدهما الآخر/** شەڕەقۆچیان كرد، یەكتریان دایە بەر (قۆچ، كەللە).

**نَطْح: ضَرب براس او بالقرن/** كەللە لێدان، شەڕەقۆچ، قۆچ (وەشاندن، لێدان).

**نَطَّاح: الضارب بالراس او القرن/** كەللەوەشێن، قۆچ وەشێن.

**نَطيح. منطوح: مضروب/** بە كەللە لێدراو، قۆچ لێدراو.

**ناطِحَة السَحاب: صَرْح/** ئاسمان قۆچ، بالاخانەی زۆر نهۆم.

**نطر:**

**نَطَرَ: حَرس/** ئێشكی گرت، پاسی كرد.

— : **إنْتَظَرَ/** چاوەڕێی كرد.

**نطر. نطارَة: حراسَة/** ئێشك گرتن، پاسەوانی.

**ناطِر. ناطور: حارس/** ئێشك گر، پاسەوان.

**نُطَّار: فَزّاعَة خَرَّاعَة/** داهۆڵ.

**نطس:**

**نَطِس. نَطُس. نطاسي عالم/** زانا، زۆرزان، تێگەیشتو.

**نَطَّاسي: طبيب حاذِق/** پزیشكی (شارەزا، كارامە).

**نطع:**

**نُطِعَ. اُنْتُطِعَ لونه: إمْتَقَعَ. تَغَيَّرَ/** ڕەنگی گۆڕا، هەڵبزركا.

تنطّع: تأنّق/ ئارايشتى خۆى‌دا، دەستى بە خۆى‌دا هێنا، خۆى (كەشخە كرد، رازاندەوە، قۆز كرد).

نطْع. نطَع. نطع. بِساط من جلد/ كەوڵ.

– : مُقدَم سقف الحلق/ پێشى مەلاشو.

نَطّاع: الذى يُجلِد الدفاتر/ بەرگ تێگر، شیرازەبەند.

نطف:

نطفَ الماءُ: سالَ قليلا قليلاً/ بەهێواشى و كەم كەم لەبەرى رۆى.

نُطفة. نُطافة: قليل من الماء/ ئاوى كەم، كە لە ناو قاپا ئەمێنێتەوە.

– : ماء صافٍ/ ئاوى رون.

– : ماء الذكر و الأنثى/ تۆو، تۆم، تۆماو، سيمەن، تووى پياوێتى.

ناطِف: سُكَّر مَعْقود لتزيين الفطائر/ سەرتوێژ، كرێم.

نطق:

نَطَق: تَكَلَّم/ قسەى كرد، وتى، دوا، ئاخاوت، وێژاى.

نطَّق. أنطَق: جعله ينطق/ قسەى پێ كرد، دوانى، هێنايە دو.

– : حَزَّم/ پشتێنى پێ‌بەست.

ناطقه: كلمهُ/ دوانى، قسەى لەگەڵ كرد.

تمَنْطق تَنطَّقَ: تحَزَّم/ پشتێنى بەست.

إستَنْطقَ طلب منه النُطْق/ قسەى پێ كرد.

– المُتهَم بتعذيبه: اجبره على التكلم/ بە سزادان ئاوان بارەكەى هێنايە قسە، بە زۆر قسەى پێ كرد، پێ دركان.

نُطق: كلام/ ئاخافتن، قسە، وتن، گوتن، ورتەكردن.

– خارجي: لَفْظ/ وشە لە زار هاتنە دەرەوە، قسەكردن.

– داخلي: فهم/ بير، هۆش، تێگەيشتن، ئەقڵ، ژيرى.

فاقد الـ – : اخرس/ لاڵ، قسەناكا.

ناطق: يتكلم/ قسە ئەكا، قسەكەر، ژيربێژى، وێژەر.

إستنطاق: إستجواب/ دواندن، هێنانە قسە، قسەپێكردن.

مَنطِق. نُطق: كلام. حديث/ قسە، ئاخاوتن، ژيربێژى، ژيرى، بيرسا.

علم الـ – : علم اصول الكلام/ قسەزانى، ژيرى زانى، ژيربێژى.

مَنْطقى. منطيق. عَقْلى او مُخْتص بعمل المنطق/ قسەزان، ژيرى زان، ژيربێژى.

منطوق: خلاف المفهوم/ وتراو، سەرباس، وتە، گفتە، بێژە.

– الحُكم: نَصّ قرار الحُكم/ دەقى بريار.

مِنطيق: فصيح/ زمان پاراو، رون، ئاشكرا، پەتى.

– : بليغ/ قسەزان، زمان پاراو، بگو.

مُستَنْطِق مُستجوِب/ قسەپێكەر.

نطاق: زِنّار: حزام/ پشتێن، پشتوێن، شۆرتكە.

– : حَدّ. تُخْم/ بوار، سنور، چێوە، تخوب.

– . منْطقة: دائرة/ هەرێم، ناوچە، مەڵبەند.

– : نُقْبة/ تەنورەى ژنان.

منطقَة: دائرة/ بازنە.

– : إقليم/ هەرێم، ناوچە، ديار، ئيقليم.

– النجاة من الغَرَق/ پشتێنى رزگارى لە خنكاندن.

– حرام: غير مسموح/ ناوچەى قەدەغە.

– نفوذ/ ناوچەى هێزو دەسەڵات.

نظر:

نظَر: رأى/ چاوى پێكەوت، بينى، چاوى لێوە بو.

– الى: رمق/ سەيرى كرد، تەماشاى كرد، روانى.

– الى الشيء. تأمله/ تێى وردبووەوە، تێى روانى، سەرنجى دا، لێى راما.

– فى الأمر: فحصه و فكَر فيه/ بيرى لێكردەوە، لێى كۆڵييەوە، لێى راما.

– بينَهم حكَم/ فەرمان رەوايى كردن، كەوتە بەينيانەوە.

– لَهُم: إهْتَمّ بأمرهم/ چاودێرى كردن، چاوى لێيانەوە بو.

– فلاناً: اصغى اليه/ گوێى لێگرت.

ناظَر: صار نظيراً له/ وەك ئەوى لێهات، يەكسان بو، چون يەك وەستان.

– كذا: قاربهُ/ لێى نزيك بووەوە.

– : نافس/ بەربەرەكانێى كرد.

– : جادَل/ مشت و مرى كرد.

— : أشرف على/ سەرەوكاری كرد، چاودێری كرد.
— كذا بكذا: جعله نظيرهُ/ وەك يەكی لێكردن، يەكسانی كردن.
تناظرا: تجادلا/ مشت و مڕیان كرد.
— : تقابلا/ بەرامبەر يەك بون، روبەرو (وەستان، بونەوە)، ئاوقەدی يەك بون.
تنظَّر. إنْتظرَ. إسْتَنْظَرَ: تأمّلَ/ تێڕوانی، سەرنجی دايە.
— . — . — : تأنّى عليه و إنتظره/ چاوەڕوانی كرد، چاوەڕێی كردو بە ئارام بو.
إنتظر. إستنظر: توقَّعَ/ بەتەما بو، پێش بينی كرد.
— — : ترقّبَ. تطلّعَ/ چاوەڕێی كرد، چاوی لە ڕێوە بو، چاوەڕوان بو.
— . — : صَبرَ/ بە ئارام بو، دانی بەخۆيا گرت، ئارامی گرت، توێتكەی خوارد.
نَظَر: بَصَر/ بينين، بينايی، سۆما، روانين، تێڕوانين.
— : بَصيرَة/ زرنگی، پێش بينی، دوربينی.
— : رعاية أو إعتبار/ ئاگاداری، چاودێری، رەچاو كردن.
— : إلتفات. ملاحظة/ چاودێری، بەتەنگەوە هاتن، تێبينی، ئاوڕ لێدانەوە.
— : فضل/ پياوەتی، جوامێری.
— : حمى/ پاراستن.
غضّ الـ — / چاوپۆشين.
مطْمع — / چاو لە دوا.
وجهة — / تێڕوانێتی، هەڵوێست.
بعيد أو طويل الـ — : ناظر لبعيد/ دوربين.
قصير الـ — / نزيك بين، كورت بين.
مَسْئلة فيها — : تحتاج الى تَمَعُّن الفكر/ كارەكە تێبينی و لێكۆڵينەوەی ئەوێ.
بصَرف الـ عن/ لەگەڵ ئەوەشدا، بەبێ گوێدان، ئەگەرچی.
إعادة — / پياچونەوە.
فی نظری: فی تقديری/ بە مەزندەی من.
نظراً الى بالنظر الى/ بەگوێرەی، ئەگەرچی، لەگەل ئەوەشدا، بەپێی.

نظری: مختص بالنظر/ بينايی زان.
— : ضد عملی/ زاری، بەدەم، بە دەمی، بيردۆزی، تيۆری.
نظرياً: ضد عملياً/ هەر بە قسە، بەدەم.
نظرة: المرّة من نَظَرَ/ سەيركردن، تێڕوانين.
— : لمْحة/ سەرنج، سەرنجێك، چاوپياخشانێك، نيگا.
— : رحْمة/ بەزەيی، ئاوڕلێدانەوە، دڵسۆزی.
— الى الماضی/ لە روانگەی رابوردوەوە، ئاوڕدانەوە لە رابورد، بير لە رابوردو كردنەوە.
الـ — الضيِّقة/ كورت بينی
نَظريّة: قضيَّة تحتاج الى بُرهان/ بيردۆز.
— : رأی. مَذهب/ باوەڕ، را، رێباز، رێڕەو.
نَظّار: شديد النظر/ دوربين، بيرتيژ.
نَظّارَة: متفرجون/ سەيركەران.
— : عُوينات/ چاويلكە، عەينەك.
— حربية/ دوربين، دوربينی سوپايی.
— مُكبِرَة/ ميكروسكوب، وردبين.
أبو — . ذو — / چاويلكە لەچاو.
ناظر: عيْن/ چاو
— : راءٍ/ سەيركەر، بينەر.
— : مُدير/ بەڕێوەبەر، چاودێر، سەرپەرشت.
ناظرة: عيْن/ چاو.
— : رئيسة/ (بەڕێوەبەر، چاودێر)ی ئافرەت.
منْظر. مَنْظرَة: مشْهد/ ديمەن.
— : طلعة/ روكار.
منْظر. منظار: نَظّارَة/ چاويلكە، عەينەك.
منظار: مرآة/ ئاوێنە.
مَنْظور: يُرى/ بينراو، ديار، ئەبينرێ.
— : مَرئی/ ئەبنيرێ.
— : مُنْتظر: مُؤمّل/ چاوەڕوان كراو.
— : يرجى خيْرهُ/ دوايار، خێری لێ چاوەڕوان ئەكرێ.
— : محْسود/ چاو لەدو.
— : مُصاب بالعين/ بە چاوەوە بو.
غير — : لايُرى/ ناديار، نابينرێ.

إنتظار إستنظار: تَوَقُّع/ چاوە (چاو، روان، روانی، رێ) کردن.
— . — : ترقُّب/ چاودێری، چاولێوەبون.
علی غیر — / لەناکاو، لەپڕ، چاوەڕوان نەکراو.
غرفة الـ — / ژوری چاوەڕێ.
نظیر: مثیل/ هاو، هاوتا، یەکسان، هاوجوت، هاوشان.
— : مثل/ وەکو، لەوێنەی، وەك.
لیس لە — / بێهاوتا.
تنظیر: مُقارنة/ بەراورد، بەراورد کردن.
مُناظِر: مثل/ وەکو، چون یەك.
— : مُنافس/ بەربەرەکار.
مُناظَرَة: مُنافسة/ بەربەرەکانی.
— : جدال/ مشت و مڕ، چەن و چونی، وت و وێژ.
مُنْتَظر: مُتوقَّع/ چاوەڕوان کراو، بەتەما بو.
نظف:
نظفَ الشيء: کان نظیفاً/ پاك بو، خاوێن بو.
نظَّفَ: طهَّر/ پوختی کرد، پاکی کردەوە، خاوێنی کرد.
تنظَّفَ الشيءُ. صار نظیفاً/ پوخت بوەوە، پاك بوەوە خاوێن بوەوە.
— الرجُلُ: تنزَّهَ عن المساويء/ خۆی پاك کردەوە لە هەمەو خراپەیەك.
نظافة: ضد وساخة/ پوختی، پاکی، خاوێنی، تەمیزی، پاك و تەمیزی.
نظیف: ضد وَسَخ/ پوخت، خاوێن، پاك، تەمیز، پاك و تەمیز.
— الأخلاق أو الصفات/ رەوشت و خو پاك.
تَنْظیف: تطهیر/ پاك سازی، پوخت کردنەوە، پاك کردنەوە، خاوێن کردنەوە.
مُنظَّف/ پوخت کراو، خاوێن، پاك، خاوێن کراو.
مُنظِّف/ خاوێن کەر.
نظم:
نَظَم نَظْمَ. رتَّب/ رێکی خست،
— — فی خیط: جَمَعَ/ هۆنیەوە، کردی بە پەتەوە.
— الشعْرَ: ألَّفهُ/ هۆنراوەی دانا، هەڵیبەست، رێکی خست.
— . — الأمْر: أقامَهُ/ پێکی هێنا، دایمەزران، رێکی خست، بەرپای کرد.
إنتظم. تَنظَّم. تناظم: ترَتَّب/ رێك (بو، کرا، خرا).
— . — الخرَز: تألفت فی سلك/ هۆنرایەوە، کرا بە پەتەوە.
— . — الأمرُ: إستقام/ پێك هات، دامەزرا، جێگیر بو، سەقام گیر بو.
نظم. تنْظیم: ترتیب/ رێك خستن.
— : شعْر/ هۆنراوە، هەڵبەست.
— الشعر: تألیفه/ هەڵبەستن، هۆنراوە (دانان، رێك خستن).
— الخرَز: جمعها فی مسلك/ هۆنینەوە، کردن بە پەتەوە.
نظام: ترتیب/ رێك خستن، رێك خراو.
— سیاسی: نسَق/ رژێم، یاسا، یاسای رامیاری.
— نسَق/ شێواز، رێو شوێن، پێڕەو.
— : الطریق و العادة/ رێباز، نەریت، رێڕەو.
الـ — الشمسی/ کۆمەڵەی خۆر، رژێمی خۆر.
الـ — العسکری/ رژێمی سەربازی.
نظامی: مُرتَّب/ رێك و پێك.
ناظم: شاعِر/ هۆنەر.
— مُرتب/ رێك خەر، هۆنەرەوە.
— : مُنَظِّم: مُدبِّر/ رێك خەر، پێك هێنەر، سەرەوکاری کار.
إنتظام: ترتیب/ رێك و پێکی.
مُنظَّم. منظوم. مُرَتَّب. أنیق/ رێك و پێك، هۆنراوە، رێك خراو.
مُنظَّمَة: جمعیة/ کۆمەڵە، رێك خراوە.
— انسانیة/ رێکخراوی مرۆ دۆستی.
منظوم: خلاف الکلام المنثور/ هۆنراوە، هەڵبەست.
مُنظِّم: مُرتِّب/ رێك خەر، بە سەلیقە، پێك هێنەر.
مُنْتَظم: مُرتَّب/ رێك و پێك، رێك خراو.
غیر — : شاذ/ نارێك، ناوازە.
نعب:
نعب الغُرابُ: صَوَّت/ قغی کرد، وتی قغ، قراندی.
— : أنذر بالبیْن/ نوقلانەی لێدا.

– المؤذن: مَدّ عُنُقَهُ و حَرَّكَهُ في صياحه/ مەلای بانگدەر ملی درێژ ئەکردو بەم لاولادا بایئەدا.

**نَعَب. نَعيب:** صياح صُراح/ قڕاندن، قـغ، قغی قەڵەرەشکە.

**نَعّاب:** نقّاق/ قڕێنەر، قغەکەر.

– : فرخ الغُراب/ بەچکەی قەلە رەشکە.

**نعت:**

**نَعَت.** وصَفَ/ پیا هەڵدا، باسی کرد.

**نَعْت:** وَصْف/ پیا هەڵدان، باس کردن.

– : صِفَة/ رەوشت، خو.

**نعج:**

**نَعْجَة:** انثى الضأن/ مەڕ.

**نعاج/** مێگەل.

**نعر:**

**نَعَر:** صاحَ و صَوَّت بأنفه/ مرانی، مشەمشی کرد، منگەی هات.

– الثور: جَأَرَ/ بۆڕانی.

– العِرقُ بالدم: فار منه الدَمُ/ خوێن فیچقەی کرد.

**نَعْرَة:** صوت من الأنف/ مشەمش، منگەمنگ، منگاندن.

**نُعَرَة:** ذُبابَة الخيل أو الحمير أو الغنم/ مێشەکەرانە، مێشە سەگانە.

– : خَيْشوم/ کەپو، لوت، برناخ، برناخە.

**نَعَرة. نُعَرة:** كِبر و خُيَلاء/ ترۆفین، لوت بەرزی، کەش و فش، لەخۆبایی بون.

– . – قوميَّة. مُغالاة في الوطنية/ نیشتمان پەروەرێتی، رەگەز پەرستی.

**نَعّار:** صَيّاح/ قیرەکەر، قیژەکار، نەڕەکار.

– : طائر حسن الصوت/ مەلێکی دەنگ خۆشە، کەناری.

**نَعّارَة:** مصراع او خُذروف مُصَوِّت/ مزراحی قۆرقۆرە.

**نعير:** صُراخ. صِياح/ قیژە، هاوار، نەڕە، دەنگەدەنگ.

– الثيران: جُؤار/ بۆڕە، بۆڕاندن.

**ناعور. ناعورة:** آلة لرفع الماء/ ئاوسەرخەر، گەردونی، ناعور.

**نعس:**

**نَعَس:** اخذته فترة في حواسه فقارب النوم/ باوێشکی دا، خەوی هات.

– : نام/ خەو بردیەوە، وەنەوزی دا.

– ت. تناعَسَت السوق. كسدت/ بازاڕ (وەستا، ساردبووەوە).

**تناعس: تَناوَم:** تظاهر النُعاس/ خۆی خەواڵو کرد.

**انْعَسَ. نَعَّسَ:** حَمَّل على النُعاس/ نوانی، خەواندی، خەواڵوی کرد، هێنایە خەو.

**نُعاس** وسَن/ خەوهاتن، خەوبردنەوە، وەنەوز.

**نَعْسان. ناعس. ناعسة.** وسنان/ خەواڵو.

**مُنَعِّس:** مُنَوِّم/ خەوهێن، نوێنەر.

**نعش:**

**نَعَش:** نَعَّشَ انْعَشَ. رَفَعَ. اقام/ هەڵیسان، بەرزی کردەوە، راستی کردەوە.

– . – . – : أحيى/ زیندوی کردەوە، هێنایەوە هۆش.

– . – . – : نَشَّطَ/ بوژاندیەوە، خستیەوە گەڕ.

**إنْتَعشَ من سَقطَة:** قام/ هەڵسایەوە، بوژایەوە.

– من مرض: شُفِيَ/ چاك بوەوە، هەڵسایەوە.

– : نَشَطَ/ بوژایەوە، فراژێ بو، ئامی تێگەڕایەوە، کەوتەوە جوڵەو گەڕ، خوزی تێگەڕا.

**إنعاش:** إحياء/ ئاە تێگەڕاندن، بوژاندنەوە، زیندوکردنەوە.

**غُرفَة الـ –** / ژوری بوژاندنەوە، ژینگە.

**إنتعاش:** إسترداد/ بوژانەوە، هێز پیاهاتنەوە، خوز تێگەڕان.

**مُنْعِش:** مُحْيي. مُنَشِّط/ بوژێنەر، زیندوکەرەوە، جوڵێنەر.

**نَعْش:** سرير او خشبة الميت/ دارتەرم، داربەست تەرم، تابوت، داربازە، دوداره.

**بَنات – الكبرى:** الدب الأكبر/ حەوتەوانەی گەورە.

**بنات – الصغرى:** الدب الأصغر/ حەوتەوانەی بچوك.

**نعق:**

**نَعَق الغُرابُ:** نَعَب/ قڕانی، وتی قغ.

نَعيق. نَعيق الغُراب/ قراندن، قره، قیره، قغ.
نعل:
نَعلَ. نَعَّلَ. انْعلَ: أَلْبَسَهُ نَعْلاً/ (سۆل، پێڵاو)ی کردە پێی.
- . - . - الحصانَ: البسه النعل/ ناڵی کرد.
نَعلَ. تَنعّلَ: لَبِس النعل/ (سۆل، پێڵاو)ی لە پێ کرد.
نَعْل: حِذاء/ سۆل، پێڵاو.
- الحذاء: أسفل الحذاء/ بنی پێڵاو، دەبان.
- الدابَّة: طبق من حديد/ ناڵ.
- : صندل/ سۆل.
- : حديد في أسفل غمد السيف/ ئاسنی ژێر مشتۆ.
نَعّال: الذي يشتغل النَّعْل/ ناڵبەند، سۆل درو.
نعم:
نَعَمَ. نَعِمَ الرجُلُ: رَفُهَ/ حەوایەوە، ئاسودە بو، دڵنیا بو.
- . - عيْشَه: رَفُهَ. طاب. إتَّسَعَ/ گوزەرانی باش بو.
- . - به عَيْناً. سَرّ و فَرِحَ/ پێخۆشحاڵ بو، شادان بو.
نَعِمَ العُودُ: إخْضَرّ و نضِرَ/ سەوز بو.
- المسحوقُ: اصْبَحَ ناعماً/ وردبو، هارِرا.
- . نعُمَ: لان مَلْمَسُه/ ساف بو، ساف و لوس بو، نەرم و شل بو.
نَعَّمَ: مَلَّسَ/ سافی کرد، لوسی کرد، پەرداخی کرد.
- : رَفَّهَ/ گوزەرانی باش کرد، بوژاندیەوە.
- الشيء: جعَلَهُ ناعماً/ هاریەوە، واڵابێژی کرد، وردی کرد.
انْعَم النَظَر في الأمر: حَقَّقَ النظر فيه/ دیقەتی لێکرد، تێی راما، بیری لێ کردەوە.
- الشيءَ: جعله ناعماً/ نەرمیکرد، سافی کرد، لوسی کرد، هاریەوە، واڵابێژی کرد.
- في الأمر: بالغ أو جادّ/ بەچاکی کردی، درێغی تیا نەکرد.
- الله صباحك: انْعِم أوعِم صباحاً جعل الله ذا لين و رَغد/ بەیانیت باش.
- الله النعْمة عليه و انْعمهُ بالنعمة: اوصلها اليه/ خوا پێی بەخشی، خوا دایە.
تَنَعَّمَ: تَرَفَّهَ/ گوزەرانی باش بو، کەوتە خۆشی و نازەوە.
- بالشيء: تَمَتَّعَ/ پێی رابوارد، خۆشی لێبینی.
نِعْمَ ما فعلت: احسنت/ چاکت کرد، دەست خۆش.
نِعْمَة: مِنَّة/ ناز، پێبەخشین، خۆشی.
- الله: فضل الله/ بەخشندەیی خوا، نازی خوا، چاکەی خوا.
حَديث - : مِقْمَل/ تازە پیاکەوتو، تازە دەوڵەمەند، نەدیو بدی.
ولي الـ - : مفضال/ بەخێوکەر، نمەکە دەر.
واسع الـ - : كثير المال/ ساماندار، دەوڵەمەند، دارا.
نعم الحياة: اطايبها/ خۆشیەکانی ژیان.
نُعْم. نَعْمَة: خلاف بؤس/ خۆشی، ئاسودەیی، دڵنیایی.
نَعيم: رَغد العيش/ خۆشی، خۆش گوزەرانی.
- : سَعادَة/ بەختیاری، کامەرانی.
- : فردوس/ بەهەشت، فیردەوس.
- الله: عطيته/ بەخشندەیی خوایی.
- البال: هادئ البال/ ئاسودە، بێخەم، دڵنیا.
إنعام: عَطيَّة/ بەخشیش، خەڵات، بەخشندەیی.
- النظر: إمعان/ دیقەت کردن، (لێ، تێ) ورد بونەوە.
مُنْعِم: مُحْسِن. مفضال/ دەست بڵاو، بەخشندە.
مُنَعَّم. مُتَنَعِّم: مُرَفَّه و مُرْتاح/ خۆش گوزەران، لەخۆشیا ئەژی.
كلام - : لَيِّن/ قسەی خۆش و نەرم و نیان.
منعام: كثير الإنعام/ دەست بڵاو، بەخشندە.
ناعِم: لَيِّن الملمس/ ساف، لوس، نەرم و (شل، نیان، نۆڵ).
- : ضد خَشِن/ ورد.
- البال: مطمئن. مُرتاح/ دڵنیا، بێخەم، بێباک، ئاسودە.
- الحركة: سهل/ هێواش، لەسەرخۆ.
- اللسان: مَلِق اللسان/ زمان لوس، زمان پاراو.
شَكَر - / شەکری وردە.
شَعْر - / قژی نەرم.

ن

عيش – : رَغد/ خۆش گوزەرانی.
نُعومة: لیِّن الملمس/ نەرمی، نەرم و شلی.
مُنْذُ اظفاره: منذ الصغر/ هەر لە منداڵییەوە.
نَعَم: بَلی/ بەڵێ.
– : حقاً/ بێگومان، بەراستی، بەدڵنیاییەوە.
– . انعام: مَواشی/ ئاژەڵ، ماڵات، رەشە وڵاخ.
نُعمان: دَم/ خوێن.
شقائق الـ – : نبات مُزهِر/ گوڵاڵە، چارەچەقیلە، گوڵەبەهارە.
نَعامة. نَعام: طیر کبیر الحجم/ وشتر (مر، مورخ، مەل).
– الدماغ: جلدة رقیقة تُغشِ الدماغ/ پێستی مێشك.
– القدم: بطن الرجل/ بەری پێ.
– : إکرام/ رێز.
– : الفرح و السرور/ خۆشی، شادمانی.
جاء کالـ – : خائباً/ لۆژلۆژ گەڕایەوە.
شالت او نفرت نعامته: مات/ مرد، گیانی دەرچو.
نعن:
نَعْنَع. نَعْناع: نبات/ نەعنا.
نعی:
نَعی فُلاناً: خَبَّر بوفاته/ هەواڵی مردنی راگەیاند، مردنەکەی بڵاوکردەوە.
– الأصحاب: دَعاهم الی دفن مَیِّته/ خەڵکی دەنگدا بۆ ناشتنی مردو.
– : بَکی/ گریا، لاواندیەوە.
– فَقْره: شَکاه/ کڕوزایەوە، نوزایەوە.
نَعَی ناع. ناعی: الذی یأتی بخبر المیِّت/ هەواڵی مردو راگەێن.
– . نَعی. نُعیان: إعلان خبر الوفاة/ هەواڵی مردن بڵاوکردنەوە.
نَعْیَة. نعوَة. مَنْعی. منْعاة: خبر الموت/ هەواڵی مردن.
نغر:
نَغَر. نغرَ: غَلی/ کوڵا، کوڵیهات، هاتەکوڵ.
– . – . تنغَّرَ: علی جوفه غضباً/ پیشی خواردەوە، رقی هەڵسا.
انْغَرَ البیض: فَسَد/ پیس بو.
نغز:
نغز: دَغْدَغَ/ ختوکەی دا.
– بینهم: حمل بعضهم علی بعض/ کردنی بەگژیەکدا، دانی بەشەڕ، لەیەکی تیژکردن.
– : نزغ: وَخَز/ تێوەی ژەند.
نغش:
نغش. تنغَّشَ: تحرَّك: و إضطرب/ هەژی، لەرزی، لەقی، جوڵایەوە.
ناغش: داعَب. لعبَ مَعَ/ یاری لەگەڵ کرد، گەمەی لەگەڵ کرد.
تنغَّش. إنْتَغش بکذا: عَجَّ/ جمەی هات، پڕ بو، ژاوەی ئەهات.
نُغاش. نُغاش. نُغاشّی. قطقوط. قصیر جداً/ ریوەڵە، گرگن، کورتە بنە، کوڵەبنە، بستەباڵا.
نغض:
نَغَض. انْغَض عَیْشَهُ: کَدَّرَهُ/ ژیانی لێتاڵ کرد.
تنغَّص عَیْشه: تکدَّرَ/ ژیانی لێ تاڵ بو.
نغل:
نغل الجرحُ: تقَیَّح. فَسد/ برین کێمی (کرد، تێزا)، پیسی کرد.
– قلبه علی: ضغن/ دڵی پیس کرد، رقی لێ (هەڵسا، هەڵگرت).
نَغْل. نغیل: ولد (الزنی، الزانیة)/ زۆڵ، بیژی، بیج، حەرام زادە.
نغم:
نَغَمَ نغم. نَغَم. تنغّم: دَنْدَنَ النغْمة/ لەبەرخۆیەوە گۆرانی ئەوت.
نَغْم. نَغَم. انغام الموسیقی: التطریب فی الغناء/ ئاوازی مۆسیقا.
نغْمة. نَغْمة: حُسْن الصوت فی الغناء/ ئاواز، دەنگ خۆشی.
نغی:
نغی. نَغا الیه: تکلَّم/ قسەی بۆ کرد.

**ناغى الصَبيَّ: كلَّمَهُ بما يُعْجِبُه**/ قسەی خۆشی لەگەل کرد.

– **المراة: غازلها**/ قسەی تەرو پاراوی لەگەڵ کرد.

– **الرجُلَ: باراه. غالبَهُ**/ بۆربۆرێنی لەگەڵ کرد، گرەوی لەگەل کرد، پێش برکێی کرد.

– **الصَبيُّ: تكلم**/ گڕوگاڵی کرد.

– **الطائر: غرّد**/ مەل خوێندی، چریکانی.

**نف:**

**نفّ الأرضَ: بذرها**/ تووی (پێوەکرد، چاند).

**نَفْنَفٌ: هواء الهواء الجيوّي**/ بەرگە هەوا.

– **: صُقْعُ الجبل**/ قەدپاڵی کوور، لاپاڵ.

**نفث:**

**نفث البصاقَ: رمى به**/ بەڵغەمی فڕێدا.

– **: بصَق**/ تفی کردەوە.

– **ـهُ: سَحَرَهُ**/ جادوی لێکرد.

– **الثعبانُ السُمَّ: رمى به**/ ژاری هاویشت.

– **غُلَّهُ علي: فجّرَ غضَبَهُ على**/ داخی خۆی پێ رشت.

– **المصدور: رمى بالنفاثة**/ کۆکی، چڵم و بەڵغەمی فڕێدا، سنگی خۆی پاك کردەوە.

**نَفْث. نُفاثة: بصاق**/ بەڵغەم، تف.

– **الشيطان: شعر غزلي**/ هۆنراوەی دڵداری.

**نَفّاثة. طائرة نَفّاثة**/ فڕۆکەی هاوێژەر، تەکان دەر، فیشکەدار.

**مُنفّث: يَطرد البلغم من الصدر**/ بەڵغەم هاوێژ.

**نافث. نَفّاث: ساحر**/ جادوگەر.

**منفوث: مسحور**/ جادوی لێکراو، نوشتەی لێکراوە.

**نفج:**

**نفَجَ. إنتَفَجَ. وَثَبَ**/ بازیدا، قونەیکرد، دەرپەڕی، فجوقی کرد.

– . – . **تَنَفّجَ الرجُلَ: إفتخر بما ليس له**/ بەشتی خەڵکەوە ئەنازیو خۆی هەڵکێشا.

**نفّاج: المفتخر بما ليس له**/ ئەوەی بە شتی خەڵکەوە ئەنازێ و خۆی هەڵئەکێشێ.

**نفاجة: رقعه مربعة تحت الإبط**/ بن موّڵ، گرۆڵە، تیرۆژو.

– **السروال**/ نافەك.

**نفح:**

**نفح الطيبُ: إنتشرت رائحته**/ بۆن (هات، بڵاوبوەوە)، بۆنی خۆش هات.

– **ت الريحُ: هبّت**/ با هەڵی کرد.

– **ـهُ بكذا: اعطاه إيّاه**/ دایە، پێیدا.

**نَفْحُ الرياح: هبوبها فى البرد**/ کزەی با.

**نفحَة الطيب: رائحته**/ بۆنی خۆش، بەرامە، بۆن و بەرامە.

– **الريح: هبّته**/ کزەی با، با هەڵ کردن.

– **: عطيّة**/ خەڵات، بەخشین.

**انفحَة. إنْفَحّة. مُنفحَة: مجْبَنة**/ هەوێنی پەنیر.

– . – . – **: المعدة الرابعة للمجترات**/ شیلاوگ.

**نفخ:**

**نفخ. نَفَخَ بفمه: اخرج منه الريح**/ فوی کرد، بای لە دەمی دەرهێنا.

– **النار أو فيه**/ فوی لێکرد.

– **البوق أو فيه**/ بۆرێی لێدا، فوی پیاکرد، لێیدا، کەڕەنای ژەن.

– **الشيءَ: ملأهُ بالهواء**/ فوی تێ کرد، بای تێکرد.

– **الشمعة: أطفئها**/ مۆمەکەی کوژانەوە، فوی لێکرد.

– **شدقيه إنتفخ: تعظم و تكبر**/ گوپی ئاوسان، خۆی گیف کردەوە.

– **فخّمَ**/ هەڵیدا، فوی تێکرد.

– **فيه من روحه**/ هێنایەوە هەناسە، گیانی تێخستەوە، فوی تێکرد.

– **ـهُ الطعام: ملأهُ**/ سکی پڕ بو، داکەوت، بایکرد.

**إنْتفخ: إمتلأ بالهواء**/ پڕ بو لە با، فوی تێ چو، کفی کرد.

– **: وَرَمَ أو إرْتَفع**/ ئاوسا، هەڵئاوسا، هەڵتۆقی، بەرزبوەوە، کیسی کرد.

**نَفْخ: ملء بالهواء**/ فو تێکردن، با تێکردن.

– **: كبر**/ لوت بەرزی، ترۆفیز، کەش و فش.

**نَفْخة: المَرّة من نَفْخ**/ فویەك.

– **ريح: هَبّة ريح**/ کزەبا.

- البطن. إنتفاخ البطن/ سك با كردن.

- : نُفاخ: وَرَم/ ئاوساوى، هەلتۆقين.

**نافخ:** الذى يَنفُخ/ با تێكەر، فو تێكەر.

**إنتفاخ. تَنفيخ:** تَوَرُّم/ ئاوسان، كيسكردن، خەمبابون، هەلّ تۆقين.

- : الأمتلاء بالهواء/ با تێچون، پڕبون لە با، كف كردن.

- البطن: إمتلاء/ باكردن، بازهلە.

**منفاخ. مَنفَخ:** آلة النفخ/ موشەدەمە، با تێكەر.

- العجلات/ پەمپ.

**مَنفوخ. مُنتَفَخ:** ممتلىء بالهواء/ فو تێكراو، پڕ لە با، كف

- : وارم/ ئاوساو، هەلتۆقيو، خەمبا، كيس كردو.

- : سمين/ شيشمان، كەتە، قەلەو، تێك سمراو.

- : مُتَكَبِّر/ لوت بەرز، بەترۆفين.

**نافخ. نَفّاخ:** مرباح/ بادار.

**نُفاخَة:** فُقاعَة ماء/ بلقى ئاو.

**نَفّاخَة/** ميزەلان.

**نافوخ:** قِمَّة الراس/ تەوقە سەر، تەپلەسەر.

**نفد:**

**نَفدَ الشيءُ:** فَنى. إنتهى/ تەواو بو، نەما.

**اَنفَذَ. إستَنفَذَ:** افنى/ تەواوى كرد، كارى كرد.

**نَفاد. إستنفاد:** فَناء/ تەواوبون، نەمان، لەناوچون، كاركران، لێبونەوە.

**نفذ:**

**نَفَذَ فى الشيء:** إخترقه/ ئەم ديو ئەو ديو سمى، كوناودەرى كرد، پيا تێپەڕى، گوزەرى كرد، دەلاندى.

- الأمرُ أو القول: جرى و تَمَّ/ راپەڕى، تەواو بو، پێك هات.

- المنزلُ الى الطريق: إتَّصل به/ خانوەكە بەسەر رێگەكەدا ئەيروانى، پێوەى نوساوە.

- الكتابُ اليه: بَلَغ اليه/ پێىگەيى، نامەكەى پێگەيشت.

- السَهْمُ: قُضيَ الأمر/ كار لە كار ترازا، كار تێپەڕى، بەسەرچو، مرد.

**نَفَّذَ. اَنفَذَ:** جعله يَختَرق/ پيايا (تێپەڕان، برد)، تێى پەڕان.

- . - الى: بَعثَ اليه. ارسل اليه/ بۆى نارد.

- . - الأمرَ: امضاه/ بەجێى هێنا، برديە سەر، بە ئەنجامى گەياند.

**نافذ:** فَعّال. مُؤثر/ بەهێز، كاريگەر.

- : ثاقب/ كون كەر، تێپەڕ.

- الكلمة: ذو نفوذ او سلطة/ خاوەن دەسەلات، قسە رۆيو.

- : معمول به/ باو، پەيرەوى (ئەكرێ، كراو).

**امرٌ - :** مُنجَز/ فرمانى بەجێ هێنراو.

**طريقٌ - :** مفتوح من الطرفَين/ رێگەى كراوە، دەرئەچێ.

**نُفوذ:** قُوَّة. سلطة/ دەست رۆيين، دەسەلات، هێز.

**مُتَنَفِّذ:** سليط. متمكن/ دەست رۆيو، بەهێز، دەستدار، بەدەسەلات، گزير.

**إنفاذ:** إرسال/ ناردن، گەياندن.

- . تَنفيذ: إجراء/ بەجێهێنان، جێبەجێ كردن، راپەڕاندن، بە ئەنجام (دان، گەياندن).

**إيقاف التنفيذ/** وەستاند، راگرتن.

**تنفيذى:** إجرائى/ جێبەجێ كارى، ئەنجامدان.

**الهيئة أو السلطة التنفيذيه/** دەسگاى بەجێهێنان.

**مَنفَذ. منفذ:** مَجاز/ رێڕەو، گوزەر، راڕەوە.

- - : مَخرَج/ دەربازگە، دەرچە، شوێن دەرچون.

- . - : خرق/ كون، كوناودەر، كراوە، كەلێن.

**مُنفَذ:** مُنجَز/ تەواو، بەجێهێنراو، جێبەجێ كراو، راپەڕيو.

**مُنَفِّذ.** مُنجز/ بەجێهێن، جێبەجێكەر، بكەر.

**نافذة:** شُبّاك/ پەنجەرە.

- : خَرق فى الحائط. أو غيره/ دەلاقە، كلاورۆژنە، كون.

**نفر:**

**نَفر منه:** جَزِعَ منه و تباعد/ سلەميەوە، لێى ترسا، لێى دوركەوتەوە.

- : هَرَبَ/ هەلهات، رايكرد، بۆى دەرچو.

– : وَرِمَ/ ئاوسا، هەڵتۆقی.
– : نَتَأَ/ دەرپەڕی، بەرزبوەوە، هەڵتۆقی.
– الى: اسرَعَ/ تاویدا، خێرای کرد، خۆی بۆ کوتا.
– القومُ الى القتال أو الأمر: هَبّوا/ چون بۆ کوشتار، بۆی چون، ملیان نا.
– منه: كَرِهَهُ/ لێی سڵەمیەوە نەیویست، بەدڵی نەبو.
– عنه: تباعَدَ. اعْرَضَ/ خۆی لێ (پاراست، لێ لادا، دورخستەوە).
نَفَّرَ. انْفَرَ: اجزع و ابْعَدَ/ ترسانی، دوری خستەوە.
– منه: جعله يَكْرَهُهُ او يَشْمَئِزّ منه/ وای لێکرد (نەیەوێت، رقی لێ بێت، دڵی لێ تێکەڵ بێت، قێزی لێبێتەوە).
نافَرَهُ تنافروا: تبادَلوا الكراهيَّة/ رقیان لەیەك (هەڵگرتبو، بو)، یەکتریان نەویست.
نَفَر: جماعَة/ کۆمەڵ، کۆ.
– : شَخْص/ کەس، یەك کەس.
– : جندي بسيط/ سەرباز، نەفەر.
نُفور: هُروب/ راکردن، هەڵ هاتن، سڵەمینەوە، سڵکردنەوە.
– : كراهَة/ رق، قین، رقەبەرایەتی، قێزلێبونەوە.
– : تَباعُد/ لێك دورکەوتنەوە.
تَنافُر: عدم مُطابَقَة و مُوافَقَه/ لەیەك نەچون، بۆ یەك نەبون، جیاوازی، بۆ نەبون.
– : خصام/ ناکۆکی.
– : تَباعد/ لێك دورکەوتنەوە.
مُتنافِر: مُتَباين/ جیا، جیاواز.
نافِرٌ منه: كارِهٌ منه/ رقی لێیەتی.
– : وارِم/ ئاوساو.
– : بارِز/ دەرپەڕیو، بەرز.
نفير: جماعَة/ کۆمەڵ، چەند کەسێك.
– : بوق/ کەڕەنا.
الـ – العام: قيام عامَّة الناس للقتال/ رەش بگیر، سەربازگیری.
نافورة/ کۆڵکوڵە، فوارە.
نفس:

نَفِسَ. نَفِسَ بالشيء: ظَنَّ/ گومانی کرد، لێی بەگومان بو.
– ـهُ: أصابَه بعين/ بە چاویەوە کرد، کردی بە چاوەوە.
نَفِسَ على فلان بِخَيْر: حَسَدَهُ عليه/ بەخیلی پێبرد، رەشکی پێ برد.
– الشيء على فلان: لم يَرَهُ اهلاً لَه/ پێی شایان نەبینی.
نَفُسَ: كان نفسياً مرغوباً فيه/ بەنرخ بو، گران بەها بو.
نَفِسَت. نُفِسَت. نَفَسَّت المراة: صارت نُفَساء/ ژان گرتی، لەجێگادا کەوت، بو بە زەیستان، چوە سەرکاسە.
نَفَّس فُلاناً: ازال كَرْابَهُ و غَمَّهُ/ خەمی رەواندەوە، دڵیدایەوە، رقەکەی خاوکردەوە، بەسەریاهات.
– الشيء المنفوخ: افْرَغَ منه/ بای لێ دەرهێنا، فشی کردەوە.
نَفَّسَهُ في الأمر: رَغَّبَهُ فيه/ لای شیرین کرد.
نافسَ: بارَى/ بەربەرەکانی کرد، پێش برکێی کرد، بۆربۆرێنی کرد.
– في الشيء: بالغ فيه و غالى و زايَدَ/ زۆری پێوەنا.
– في الشيء: رغب فيه على وجه المباراة والكرم/ خۆی پێوە هەڵکێشا.
تَنَفَّسَ: تَنَسَّمَ/ هەناسەیدا.
– : إستراح/ پشوی دا.
– الصعداء: إستراح من هَمّ أو تعب/ پشوی دا، حەوایەوە، لە خەم رەخسی، ئامێکی پیاهاتەوە، لەخەم رەخسی.
تَنافَسَ الرجلان: بالغوا في الأمر و زايدوا/ بەربەرەکانیان کرد، پێش برکێیان کرد، لەسەر یەکیان زیادو کەم کرد.
نَفَس (الجمع انفاس): نَسمَة/ هەناسە، پرزە، پەتۆ، نوزە.
– : بُخار الماء الغالي/ هاڵاو.
– : دُخَان/ دوکەڵ.

ن

- المؤلف أو الشاعر: طريقة كتابته/ شێوازی نوسین و هەڵ بەستی هۆنەر.
- ـاً واحداً: جُرعة واحدة/ یەك بین.
بـ - واحد: بصوت واحد/ بەیەك دەنگ.
طویل الـ - / نوزەدرێژ.
قطع - ـهُ/ نوزەی بری.
اخذ - ـهُ: تنَفَّسَ/ هەناسەی (دا، وەرگرت).
اخذ - ـهُ: إستراح/ پشوی دا.
اخذ - ـاً من السجارة/ مژی لێدا، قومی لێدا.
لفظ الـ - الأخیر: مات/ گیانیدا، دوا هەناسەیدا.
فاضت نفاسه: سکت. مات/ نوزەی تیا نەما، هەناسەی برا، مرد.
نَفْس (الجمع انْفُس و نفوس): روح/ گیان، دەرون.
- : عقل/ ژیری.
- . نفس: عیْنٌ حاسدَة/ چاوی پیس.
- : ذات. عیْن/ خۆ، هەرخۆی، هەمان.
- : شخص/ کەس.
- : مُراد. إرادَة/ ویستن، خواست.
- : همَّة/ پەرۆشی.
- : غظَمَة/ گەورەیی، شکۆ.
- : انَفَة/ تروفیز، کەش و فش، بایی بون.
- الشيء: عینه/ وەك یەکن، هەرئەوە، هەمان شت.
- : شهیَّة/ دڵبردن، دڵ قێچون، ئارەزو، حەز لێکردن.
- : رغبَة/ ئارەزو، تاقەت.
- الرجل: ذاته/ هەرخۆی، هەمان پیاو.
- الأمر: حقیقته/ راستیەکەی.
فی - الوقت/ لە هەمان کاتدا.
فی - الأمر/ لە هەمان کارو باردا.
صغیر الـ - بسیط/ ساکار، سادە، ساویلکە.
کبیر الـ - : کریم. رحب الصدر/ دڵفراوان، بەخشندە، پیاوچاك.
مُنقبض الـ - : مُکْتئب/ پەژارەدار، پەست.
الثقة بالـ - / باوەڕ بەخۆ، دڵنیابەخۆ، لەخۆدا راپەرمون.
الاعتماد على الـ - / پشت بەخۆبەستن.
السیطرة على - / خۆدابین کردن.
الاعتزاز بالـ - / خۆ (بینی، پەرستی).
تعزیز الـ - / خۆ بردنەپێشەوە.
خائر الـ - / دەستە ئەژنۆ.
ترویح الـ - : تسلیة. تنزُّه/ رابواردن.
ضبط الـ - / خۆ (گرتن، داری، دابین کردن).
فرض الـ - / خۆسەپاندن.
عزّة الـ - : انفة/ سەربەرزی، ئابرو.
طبّ الـ - / خۆپزیشکی.
محبّة الـ - / خۆپەرستی.
علم الـ - / خۆزانی.
مُناقض - ـهُ/ خۆدژ.
لیس له - : (رغبة و شهیّة)/ دڵی نابا، تاقەتی نیە.
شایف - ـهُ: غرّ/ خۆی دیوەتەوە، خۆی زۆر بە زل ئەزانێ، لەخۆبایی.
تلْعب - ـهُ / دڵی تێکەڵ دێت.
فتح - ـهُ/ دڵی کردەوە، دڵی برد، پێی خورا.
یاکل - ـهُ من الغیْظ/ خۆی ئەخواتەوە، پێش ئەخواتەوە.
کسر - ـهُ: اهانه/ دڵیشکان، شکانی.
جاء من - ـه/ لەخۆیەوە هات.
فی - ی أن افعل کذا/ زۆر دڵم پێوەیەتی کە بیکەم.
نِفاس: ولادة/ منداڵ بون، چونە سەرکاسە.
- : دم یعقب الولادة. السائل النفاسيّ/ خوێنی پاش منداڵ بون
نفسي. نفساني: روحي/ گیانی.
- . - : عقلي/ ژیری، دەرونی.
- . - : مُخْتصّ بالنفس/ ژیریی زان، دەرون زان.
تحلیل - أو - / شیکاری دەرونی.
طبیب - أو - / پزیشکی دەرونی.
نفسیاً: روحیاً/ لەخۆوە، لەروی دەرونیەوە.
تنفُّس / هەناسە (دان، وەرگرتن).
- إصطناعي/ هەناسەدانی دەست کرد.
أعْضاء الـ - : مُتنَفِّس/ ئەندامی هەناسە.
المسالك التنفسیة/ رێبازی هەناسە.

مُتنفِّس. يتنفَّس/ بانەدا، فوئەدات، با وەرنەگرێ.
تنفيس: إخراج الهواء من المنفوخ/ با لێدەرکردن، فش کردنەوە.
مُنافسة: مُزاحمَة/ پێش برکێ، شێك کاری، بەربەرەکانی، دژکاری، رقەبەرایەتی.
مُنافس: مُزاحم/ دژکار، شێك.
نَفيس ذو قيمة/ گران، گران بەها، بەنرخ، نایاب.
نفش:
نَفشَ. نفَّشَ القطن: شعثَهُ و مزَّقهُ/ شیکردەوە.
— الطائر ريشه. تنفَّش/ بالندەکە (خۆی، بالی) فش کردەوە.
تنَفَّشَ. إنتَفشَ القطّ. ،نفش صوفَهُ/ پشیلەکە خۆی (ریچ کردەوە، گف کردەوە).
نفش: الصوف المنفوش/ خوری (شی، کراوە).
مُنتفش. مُتنفِّش منفوش/ شی کراوە، بژ.
— — : رخو الجوف/ فشۆل، فش، فش و فۆل.
انف — او — : افطَس/ لوت پان، کەتۆش.
شعر — او — : اشعَث/ قژی بژ.
نفض:
نَفضَ الثوبُ: ذهَبَ لونه/ کال بوەوە، چوەوە.
— . نَفَضَ الثوب: هَزَّهُ ليزول عنه التراب/ تەکانی، رایوەشان، پروانی.
— — التُراب: ازالهُ/ خۆلەکەی لێکردەوە.
— . — الشجرة: هَزَّها/ وەرانی، تەکانی، رایوەشان.
— . — عنه ای شيء: تخلَّصَ منهُ/ لێی کردەوە، سڕی، لایبرد.
— المريضُ من مرضه: بَرِيءَ منهُ/ چاك بوەوە، ساخ بوەوە.
— . تنفَّضَ المكان بنظره: نظر جميع ما فيه حتى يعرفه/ چاوی بە هەموانا گێرا، بەهەمو لایەکدا روانی و ورد بوەوە.
— يدهُ من الأمر: قطع الأمل/ هیوای بڕی، دەستی لێشت، خام تەمابو، بەتەما نەما.
— ثهُ الحُمَّى/ تاکە بەریدا، خاوی کردەوە، سوکی کرد.
— . انفضَ القومُ: ذهب مالهم/ هیچیان نەما، کەوتنە ساجی عەلی.
انُفَضَ: انفَذَ/ تەواوی کرد، تەواو بو، هیچ نەما، برایەوە.
إنتَفضَ: إرتعدوا إرتَعَش/ لەرزی، موچرکی پیاهات، لەریەوە.
— . تنفَّضَ من التراب/ تەکێنرا، خۆلەکەی لێبوەوە، پروا.
إنتفاضة. وثبَة/ راپەڕین، راچلەکین.
نَفض. نفاض. نُفاض. نُفاضَة: الساقط/ وەریو، تەکیو.
نُفَضَة. نفاض. رعْدَة الحُمَّى/ موچرك، لەرز، داچلەکین.
تنفيض: رَجّ. هَزّ/ تەکاندن، راوەشاندن، پرواندن.
منفَضَة السجاير/ تەپلەکی جگەرە، کوژێن.
نفط:
نَفطَ. تنفَّط: إحترق غضباً/ رقی هەلسا، قینی هەلسا، تورەبو، ئاگری لێئەبوەوە.
— ت القِدرُ: غلَت/ کولا، هاتەکول.
نَفطَ. تَنفَّط: تقرَّح/ بلقی کرد، تلۆقی کرد، هەلزلەپی.
نُفطَة: سريع الغضَب/ تورە، تورەوتڕۆ، رقاوی.
نَفط نَفطَة. نِفطَة: بثرة ملأى ماء/ پیزۆکە، بلۆق، تلۆق، زلەپیو.
— . نفط: سائل طيّار سريع الاحتراق/ نەوت.
يَدٌ نافطَة: ذات نَفط/ دەستی بلقاوی، تلۆقاوی.
نفع:
نَفَعَ: افاد/ کەلکی (هەبو، گەیاند)، بەکەلك بو، سودی (هەبو، گەیاند)، بەسود بو.
— لكذا: صَلُح/ بۆی بو، بەکەلکی هات، پێیکەوت.
لا يَنفَعُ: لا يُفيد/ کەلکی نیە، بێکەلکە، بەکەلك نایەت، سودی نیە.
نفَعَ. إستَنفَعَ: جعَلهُ نافعاً/ کەلکداری کرد، کەلکی لێوەرگرت.
— . — : طلب نفعهُ/ (کەلك، سود)ی پێگەیاند.

ن

إنْتَفَعَ بـه و منـه حَـصَلَ علـى مَنْفَعَـة منـه/ (كـەڵك، سود)ی لێوەرگرت.
— بـه و منـه: إسـتعمله لنفسه/ بـۆ خـۆی دانـا، بەکەڵکی هێنا.
نفع: فائدة. عائدَة/ فەڕ، کەڵك، پیت، بوم، بەروبوم.
— : ربح/ سود، قازانج، دەستکەوت.
— : خَيْر/ چاکە، پیاوەتی، سایە.
الـ — العام/ سودی گشتی.
نَفّـاع. نَفـوع: كـثير النَفـع/ بەکـەڵك، پیاوچـاك، سودگەیەن، بە قازانج.
نافع: مفيد/ بەفەڕ، بەکەڵك، بەسود، کەڵکدار، سوددار، سایەدار.
إنتفاع. إستفادَة/ کەڵك وەرگرتن، سود پێگەیین.
— : ربح/ قازانج.
مَنفعَة: فائدة. عائدة/ کەڵك، پیت، بەروبوم.
— : ربح/ سود، قازانج، دەستکەوت.
— متبادلە/ سودی بەرامبەری.
نَفْعي: المنتحل مَذهَب النفعيَّة/ سودگەر، سودخۆر، خۆسود.
نَفْعِيَّة: مَذهب من يطلبون المَنْفَعَة/ خۆسودی.
مَنـافع الـدار: مَرافِقُهـا/ شـوێن کـەڵك، شـوێنە پێویستەکانی ماڵ.
مُنْتَفع: مستفيد/ کەڵك وەرگر، سود پێ گەییو.
نفق:
نَفَقَ. نَفِقَ الشيءُ: نَفَدَ/ تەوابو، کەم بوەوە.
— . — البيعُ او السوق: راجَت/ بـازاڕ جـولا، گـەرم بو، فرۆشت زۆر بو.
— . — الحيوان: مات/ مرد، تۆپی، مردار بوەوە.
نَفَّقَ. انفَقَ البضاعَة: رَوَّجَها/ بازاڕگەرمی کرد.
— البـضاعَة: باعها/ فرۆشـی، لـەناوی بـرد، دەسـتی پێوەنا.
انْفَقَ: إفْتَقَر/ هەژارکەوت، هیچی نەما.
— : صَرَف/ خەرجی کرد.
— . إسـتَنْفَقَ المـال او الـصِحَّة: صَـرَفَ. افنـى/ دایڕنا، لەناوی برد.
نافَقَ: اظهر خلاف ما يُبْطِن/ دوڕویی، دوزمانی کرد.
نافِق: ضِد كاسِد/ بازاڕگەرمی.
إنفاق: صَرْف/ خەرج کردن.
نَفَقَة: مَصْروف/ خەرجی، موچە.
— . إنفاق صَرف/ خەرج کردن، تێچون.
— المَعيشَة/ خەرجی ژیان.
— الزوجَة: مَعاش الزوجة المطلقة او المنفصلة/ پێژیان، نەفەقەی ژنی تەڵاق دراو، بۆ بڕینەوە.
على — فلان/ لەسەر حسابی..
منفاق. مُبَذِّر. مُسْرِف/ خەرج کەر، بە فیڕۆدەر، دەست (بە قرب، بڵاو).
نفاق. مُنافَقَة: مُداهَنَة/ ڕیایی، دوڕویی، دوزمانی.
مُنـافِق: مُـداهِن. مُخـادِع/ دوڕو، ڕیاکـار، دوزمـان، نەرمەبڕ.
نَفَق: سَرَب/ تونێل، کون، چوخم.
نفل:
نَفَلَ النَفَلَ: اعطاه إيّاه/ دەسکەوتەکەی دایە.
— القائـدُ الجُنْـدَ: جَعَـلَ لهـم مـا غَنَمـوه/ چـییان دەستکەوت لە تاڵانی دابەش کرا بەسەر سەربازدا.
إنْتَقَلَ. تنقَّلَ: فَعَلَ اكثر من الواجب/ لـە پێویـست زیاتری کرد.
نَفَـل. نافلَـة (جمعهـا انفـال و نِفـال): غَنيمَـة/ دەستکەوت، تاڵانی.
— . — : هِبَة/ خەڵات، بەخشین.
— . — : عَمَلٌ ليس واجباً/ کردەوەی نا پێویست.
— : زائد عن المطلوب/ لە پێویست زۆرتر.
— : نوع من البرسيم/ سێپەڕە، کەما.
نافلة: ولد الولد. حفيد/ کوڕەزا.
نَوْفَـل الرجـل المعطـاء/ دەسـت بـڵاو، بەخـشندە، خێرەومەن.
— : الشاب الجميل/ نەوجوان.
— : العطية/ بەخیشن.
— : البحر/ دەریا.
— : ذكر الضِباع/ نێرەی کەمتیار.
نفى:
نَفـى. نَفـا: ضـد اثبـت/ بەرپەرچـی دایـەوە، بـەدرۆی خستەوە.

- . - : أنكر/ داني پيانەنا، نكۆڵی كرد.
- . - : نَبَذَ/ نەیویست، فرێیدا، جیای كردەوە.
- . - : أبعَدَ. نَحّی/ دوری خستەوە، لایبرد.
- الرجُلَ من بلده. أبعده هجره/ شار بەدەری كرد، ئاوارەی كرد، رەهەندی كرد، دەربەدەری كرد.

**نافي**: طارَدَ/ راویناِ، شوێنی كەوت.

**يُنافي**. هذا يُنافي ذاك: يُباينه و يُخالفه/ پێچەوانەیە، دژ، جیاواز، ئەمە پێچەوانە یا دژی ئەوەیە.

**إنتفى**. إنتفت الحاجَة: ضد ثبت/ پێویست ناكات، ناویسترێ.
- الشعْرُ: تساقَطَ/ وەری، كەوت، روتایەوە، هەڵوەری، تولەك بو.

**تنافت الأشياء**: تخالَفت و تباينت/ جیاوازبون، لەیەك نەچون.

**نَفي** ضد إثبات/ بە درۆخستنەوە.
- : إنكار/ دان پیانەنان، نكوڵ كردن.
- : إبعاد. إقصاد/ دورخستنەوە، لابردن، دەركردن.
- من البلد، طرد/ شاربەدەر كردن، ئاوارە كردن، دەربەدەر كردن، رەهەند كردن.

**شاهد** - : شاهد دفاع/ گەواهی بەرگری، شایەتی بەرگری.

**حرف** - / ئامرازی نەكەر.

**مَنْفيّ. نَفيّ**: منبوذ/ نەویستراو، ناخۆشەویست، فرێدراو.
- . - : مُبْعَد/ دورخراو، لابراو، لاخراو، دەركراو.
- . - من بَلَدِهِ/ شاربەدەر، ئاوارە، دەربەدەر، رەهەند.
- : سالب. خلاف الموجب/ نەرێ، داپن، سارد.

**تناف. مُنافاة**: تناقُض. تَضاد/ لەیەك نەچون، دژ.

**مَنْفی**. مكان النفي/ شوێن ئاوارەیی، ئاوارەشوێن.

**نُفايَه. نُفايَه. نَفاء. نفاة. نَفاوَة الشيء**: الرديء من بقايا الشيء/ نەویستراو، پاش ماوە، گەنگە، خۆڵ.

**صندوق النفايات**/ تەنەكەی خۆڵ.

**نفير** (في نفر) **نفيس** (في نفس)

**نق:**

**نَقَّ. نَقْنَقَ الصفدع**: صات/ قیرانی.

**نَقاق**: ضِفْدَع/ بۆق.

**نقيق** صوت الضفدع/ قیرەی بۆق، قیرەقیر.

**نقاء** (في نقي)

**نقب:**

**نَقَبَ الحائط و غيره**: خَرَقَه و ثقبه/ سمی، كونی كرد.
- الارض: حَفَرها/ هەڵیكەن، پیاچوەخوارێ، چاڵی كرد، هەڵی كۆڵی، پشكنی.
- . نَقَّبَ. تنقَّبَ: بَحَثَ عن. فحص/ پكشنی، كنەی تیاكرد، توێژیەوە.

**تَنَقَّبَت. إنْتَقَبَت المرأة**: لبست النقاب/ پەچەی (گرتەوە، پۆشی).

**ناقَبَهُ**: فاخَرَهُ بالمناقب. باراه في الفضيلة و المحامد/ خۆی هەڵكێشا.

**نَقْب**. حَفْر/ هەڵكەندن، چاڵكردن، كنە تیاكردن.
- : ثَقْب/ كون كردن، سمین.
- : ثُقْب/ كون، چاڵ، كەلێن.

**تنقيب**: فحص. رَود/ پشكنین، توێژینەوە، كنەتیاكردن.
- : حَفر/ هەڵكەندن.

**مَنْقَب. نَقْب. مَنْقِب. منقَبَة**: طريق في الجبل/ رێبازی ناوشاخ.
- . مِنْقَبَة: اداة النَّقْب/ سمۆ، كون كەر، قەڵەم، فەردۆنی، مەكتەب.

**نُقْبَة**. اثر/ شوێن.

**مَنْقَبَة**: مَحْمَدَة/ ستایش، چاكە.

**مَناقِب الرَجُل**: محايده/ چاكەوپیاوەتی، جوامێری.

**نِقاب**: قِناع/ روپۆش، پەچە، دەمامك.

**نِقابَة**: جماعة مؤلفة من أصحاب المِهَن/ نەقابە، جڤات.

**نقيب**: رئيس/ سەرۆك، سەرۆكی یەكێتی.

**نَقيبة**: نَفس/ گیان، دەرون، خۆ.
- : عَقل/ ژیری، ئەقڵ.
- : طبيعة/ سروشت، خۆرسك.
- : مَشورة/ راوێژ.

ناقِب. ناقِبَة. نُقْب: قُرصَة الفراش من طول الضَجْعَة/ برين و كوتران و هەوی کەلەکە بەهۆی راکشانی زۆرەوە.

**نقح:**

نَقَحَ. نَقَّحَ: شَذَّبَ/ هەڵی‌پاچی، سەرپاچی کرد.

نَقَّحَ. اَنْقَحَ الكتاب: هَذَّبَهُ و اَصْلَحَهُ/ بژاری کرد، پیاچووەوە، هەڵەی لابرد.

– : خَلَّص جيده من رديئه/ بژاری کرد، چاك و خراپی لێك جیاکردەوە، پوختی کرد.

تنقيح: تهذيب إعادة النظر: مُراجَعَة/ بژارکردن، پیاچونەوە، هەڵەچن.

– الحبوب/ گێژو تەتەڵە، بژار.

**نقد:**

نَقَدَ الشيءَ: فَحَصَهُ ليعرف جَيِّدَهُ من رديئه/ سەرنجی‌دا، لێی راما، تێی روانی، لێی ورد بووەوە تا بزانێ چاك و خراپی.

– هُ الثمن: اعطاه إيّاه نقداً/ بەدەستی پێی دا، بەدراوی پێیدا، نەقد نرخەکەی دا.

– الطائرُ الشيءَ: نَقَرَهُ/ دەنوکی (لێدا، پیاکێشا).

– هُ بنظره: إختلس النظر اليه/ (بەدزییەوە، لەژێرەوە) سەیری کرد.

– . إنْتَقَد الكلام (او الفِعْلَ: اظهر مابه العيوب و المحاسن/ رەخنەی گرت.

إنْتَقَدَ الثَمَنَ: قبضه نقداً/ بەدەستی نرخەکەی وەرگرت.

– الكلامَ على قائله: أظهر عيبه/ رەخنەی لێگرت، ناتەواوی دەرهێنا.

نَقَدَ الضِرسُ: نَخِرَ/ کلۆر بو.

ناقَدَهُ: ناقَشَهُ/ وت و وێژی لەگەڵ کرد.

نَقْد. إنتقاد: فحص. تَنْديد/ رەخنە، رەخنەگرتن.

– : ما يُعطى من الثمن مُعَجَّلاً/ دەستی.

– . نُقود: مسكوكات/ دراو.

حساب الـ – . البيع بالـ – / بەدەستی.

ورق الـ – / دراو، دراوی کاغەز.

نُقود. نَقدِيَة: دراهم/ دراو پارە، درەم.

نقداً. بالنقْد: خلاف الدين/ بەدەستی، بەدراو، نەك بە قەرز.

إنتقاد: ضد إستحسان/ رەخنە، تانوت، بەرهەڵستی.

– هَزلي: تهكُّم/ گاڵتە، گاڵتە پێکردن، لاقرتێ، گەپ.

عُرضَةٌ للنقد/ جێی رەخنەیە.

مُنْتَقد: فُحص/ بژارکراو.

– : يُعترض عليه/ رەخنە (لێگیراو، لێنەگیری).

منقاد: منقار/ دەنوك.

**نقذ:**

نَقَذ. أنْقَذ. تنقذ. إسْتَنْقذ فلاناً من كذا: نَجّاه و خَلَّصَهُ/ رزگاری کرد.

نَقِذ: نجا و سلم/ رزگاربو، رزگاری بو.

نَقْذ. إنقاذ: نجاة. خلاص. سلامة/ رزگاری، رزگار (بون، کردن).

مُنْقذ: مَن ينقُذ. مُنجٍّ/ رزگارکەر.

**نقر:**

نَقَرَ: ضَرَبَ/ لێیدا، کوتای، دای‌پاچی.

– الحجَر او الخشَب: حفَرَه/ هەڵی‌کەند، هەڵی‌کوڵی، دای‌تاشی.

– في الحجر: كتبَ/ لەسەر بەرد نوسی، هەڵی‌کوڵی.

– الطائر: ضَرب بمنْقره/ دەنوکی پیادا.

– الطائر الحبَّ: لقطه/ هەڵی چنی.

– على الباب: قَرَعَ/ لەدەرگای‌دا.

– : قَرَعَ او فرك الأبهام على الوسطى فاحْدث صوتاً/ چەقەنەی لێدا.

– بظفر الاصبع الوسطى: نتف/ پەلەپیتکەی لێدا.

– عليه: عابه/ گاڵتەی پێکرد، تانوتی لێدا.

– ت. إنتقرت الخيْلُ بحوافرها: إحتفرت/ سمکۆڵی کرد.

– في الناقور: نَفَخ/ فوی پیاکرد، لێیدا، بلوێری ژەن.

– و نَقَّرَ عن الشيء: بحث/ گەڕا، بۆی گەڕا، پشکنی.

ناقَر: صاحَ/ مشت و مڕی کرد، لەگەڵی وت.

– : نازَعَ هاتر/ دژمنایەتی لەگەڵ کرد، لێی زویر بو.

نَقْر: حفر/ هەڵکەندن، هەڵکۆڵین.

– : ثُقْب/ كون كردن، سمين.

– الأصابع: دقّ الاصبعتين/ چەقەنە لێدان.

نُقْرة: حُفْرة. تجويف/ چاڵ، بۆشايى، كلۆر، كون، هولۆڵ، هەلۆڵ.

نَقّار: حفّار/ هەڵكەن.

– الخشب: طائر/ دار كون كەرە، دارەسمە.

منقار الطائر/ دەنوك.

– . منقر مِعْوَل. صاقور/ پاچ.

– الخشب و الحديد/ سمو، قەڵەم، كون كەر، فەردۆنى، مەكتەب.

نَقْر: غضبان/ تورە.

نَقْرة. ناقِرَة. مُناقرة: مُهاترة/ مشت و مڕ، چەنەبازى.

ناقور: بوق/ كەڕەنا

نَقير: اصل/ بنەڕەت، بنەچە.

– . مَنقور. محفور/ هەڵكەنراو، هەڵكۆڵراو.

نِقْرِس: مرض/ جومگەژان، نەخۆشيە توشى جومگەى پێ و پەنجە گەورەى پێ ئەبێ‌و و ئەيان ئاوسێنێ.

– . نقريس: طبيب ماهر/ پزيشكى ورياو چالاك.

نقز:

نَقَزَ. وثَبَ/ بازدىدا، قونەى كود.

– الطفلَ: رَقَّصَهُ/ هەڵىپەڕان.

نقس:

نقس إنْتقس الناقوسَ: قرَعَهُ/ لە زەنگىدا، زەنگى لێدا، بۆڵى لێدا.

– الرجلَ: عابهُ و سخرَ بهِ/ گاڵتەى پێكرد، پێى رابوارد، تێزى پێوەكرد.

ناقوس: جَرَس/ زەنگ، بۆڵ.

نقش:

نَقَشَ: لَوَّنَ و زَيَّنَ بألوان/ رەنگاورەنگى كرد، رازاندىيەوە، نەخشانى.

– فَصَّ الخاتم: حفرَهُ/ هەڵىكەند.

– التمثال: نَحتَهُ/ تاشى، پەيكەرى تاشى.

– البيتَ: دَهنَهُ/ بۆيەى كرد، ماڵەكەى بۆيە كرد.

– الشوكة: إستخرجها/ دەرىهێنا، دڕكەكەى دەرهێنا.

– الشعْرة بالمنقاش: نَتَفها/ موى دەركێشا، هەڵىكەند، دەرىهێنا.

ناقَشَ: جادل/ مشت و مڕى كرد، چەندوچونى كرد، وت ويژى كرد.

– ـه الحساب و فى الحساب: طلب منه البيان/ حسابەكەى لەگەڵ كۆڵيەوە.

نَقَّشَ: تَلْوين او تَزْيين/ رەنگ كرد، بۆيەكردن، رازاندنەوە، نەخشاندن.

– : حفْر/ هەڵكەندن، هەڵكۆڵين.

– : صورةٌ ملوَّنة/ وێنەى (رەنگاورەنگ، نەخشين).

نَقّاش الجدران و البيوت: صَبّاغ/ بۆيەچى.

– : حَفّار احجار و الواح معدنية/ هەڵكۆڵ، بەردتاش.

– تماثيل: نَحّات/ پەيكەرتاش.

نَقاشَة: حرفة النقاش/ بۆيەچێتى، نيگاركێش، نەخش كار.

مِنْقَش. مِنقاش حفر المعادن/ سمۆ، قەڵەم، فەردۆنى، مەكتەب.

منْقوش: مُلوَّن/ رەنگاورەنگ، رازاوە، نەخشين.

– : محفور/ هەڵكەنراو، هەڵكۆڵراو.

نِقاش: مُحاجَّة/ چەن و چونى، مشت و مڕ.

مُناقشَة: جِدال/ مشت و مڕ، چەن و چون.

– : مُحاوَرَة و مُحادثَة/ ئاخاوتن، گفت و گۆ، وت و وێژ.

نقص:

نَقَصَ: قَلّ. هَبَطَ/ كەم بوەوە، هاتەخوارێ، پوكايەوە.

– : صَغُرَ: ضد كبر/ بچوك بوەوە.

– . نَقَّصَ. انْقصَ. قَلَّلَ/ كەمى كردەوە.

– . – . – الثمنَ او الدرجة. قللها/ كەمى كردەوە، داىشكان.

– . و إنْتَقَصَ الرَجُلَ حقَّهُ: لم يَعطِهِ حَقَّهُ/ بە تەواوى نەيدايە، لێى (بڕى، كەم كردەوە).

– و – الرجلَ قدره: إسْتَحَقَ بهِ/ گاڵتەى پێكرد، لە نرخى كەم كردەوە، سوكى كرد.

– ـهُ كذا: عازهُ/ لێى بڕا، بەشى نەكرد، كەمى كرد، كورتى هێنا.

تَناقَصَ: نَقَصَ شيئاً فشيئاً/ كەم بووەوە، تا بهاتایە کەمی ئەکرد، پوکایەوە.
— القَمَرُ. امْحَقَ/ مانگ بچوك بووەوە.
إستنقص الثَمَنَ: طلب تنقيصه/ داوای کەم کردنەوەو داشکانی کرد.
— الشيءَ: وَجَدَهُ ناقِصاً/ ناتەواو بینی، بە ناتەواوی زانی.
— الشيء: وجده قليلاً/ کەم هاتەپێش چاوی، بەکەمی زانی.
نَقْص. نُقصان: ضد زيادة/ بەش نەکردن.
— . — : فقد. عَجْز/ کورت هێنان، کەم کردن.
— : ضد كمال/ ناتەواوی، نیوەچڵ.
— . نقيصَة: عَيْب/ خەوش، شورەیی، کەم و کوڕی، نەنگی، نام و نەنگی.
مُرَكَّبُ الـ — : عقد نفسية. الشعور بالنقص/ هەست بە ناتەواوی کردن.
ناقِص: ضد كامل/ ناتەواو، کەم، نیوەچڵ، کەم و کوڕ.
— : غير موجود/ نەبو.
— : بـه نقـص أو عيـب/ کـەم و کـوڕی تیایـە، ناتەواوە، خەوشاویە.
— كـذا: مَطـروح منـه كـذا فـي الحَساب/ لێـی دەرئەکەوێ.
— عن: اقل من/ کەمترە لە.
— كـذا: يـنقص منـه كـذا/ کـورت ئـەهێنێ، کـەم ئەهێنێ، بەش ناکا.
فعل — / کرداری ناتەواو.
مخروط — / قوچەکی قرتاو.
نَقيصَة: الخصلة الدنيئة/ سوکی، شورەیی، کەم و کوڕی، ناتەواوی، نەنگی، نام و نەنگی.
انْقَص: اقل/ کەمتر.
إنقاص. تنقيص: تقليل/ کەم کردنەوە.
— . — : تنزيـل/ داشـکاندن، ئێـدەرکردن هێنانەخوار.
مُناقَصَة ضـد مُزايَـدَة/ کـەم کردنـەوە، لەسـەریەك داشکاندن.
مُتناقِص اخِذ في النقصان/ تا بێ کەم ئەبێتەوە.
— : متضائل. مُمَحَّق/ بـەرەو نـەمان ئەچـێ، ئەپوکێتەوە.
نقض:
نَقَضَ البناء: هَدَّمَهُ/ روخاندی، تێکیدا، هەڵی‌وەشان.
— الحَبْلَ: حلَّهُ/ کردیەوە، شلی کردەوە.
— العَهْدَ او الأمْرَ: أفْسَدَهُ/ تێکیدا، پەشیمان بووەوە، پیسی کرد.
— العَهْـدَ او الأمـر: ألغـاهُ و ابطلـه/ هەڵی‌وەشاندەوە.
— الوصِيَّة او الشريعة: كَسَرَها/ شکاندی، فەرامۆشی کرد.
— التُهْمَة: ابطلها/ پەرچی دایەوە.
— الشريعة: كَسَرَها/ نەریتی شکاند.
— البُرهانَ او الحُجَّة: فنَّد/ بەدرۆی خستەوە، بەرپەرچی دایەوە.
— الولاءَ: أنكر العرفان و الإخلاص/ یاخی بو، بەلەسە بو، سپڵە بو.
— حُكم المحكمة: ابطل/ هەڵی‌وەشاندەوە.
— . ناقضَ: انكرَ/ نکوڵی کرد، نەچوە ژێری، دانی پیا نەنا.
ناقضَ: خالَفَ/ سەرپێچی کرد یاخی بو، هەڵگەڕایەوە.
تَناقَضَ القولان: تَعارَضا/ جیاوازبون، پێچەوانە بون، لەیەك نەئەچون.
— الرأيان: تَصادَما/ بەیەکیاناداو، دژی یەك بون.
— . تَنَقَّضَ. إنتقَضَ: إنْحَلَّ و إنكَسَرَ/ شکا، هەڵوەشایەوە.
إنْتَقَضَ الشعبُ على الحكومَة: إنكر الطاعَة/ یاخی بو، بەلەسەبو، سەرپێچی کرد، هەڵگەڕایەوە.
— : إنْحَلَّ و تَخَرَّبَ/ روخا، داروخا، هەڵوەشا.
نَقْض: تخريب. هَدم. إفساد. إبطال../ شکاندن، هەڵوەشاندن، تێك دانەوە.
— الحُكم: إلغاء أو إبطال الحكم/ لابردن، هەڵوەشاندنەوە.
— العهد: إفساد/ پەیمان شکاندن، پەشیمان بونەوە.

- الولاء: إنكار العرفان و الاخلاص/ پێنەزانین، یاخی بون، سپڵەیی.
لا يُنقَض: مُسَلَّم بە/ چـارنیـە، هەڵناوەشـێتەوە، دەسکاری ناکرێ.
نقض. نُقْض. البناء المنقوض: مهدوم/ خانوی، روخاو، تێکدراو.
- . - . انقاض: بقايا البناية المهدَّمة/ داروپەردو، چڵ و چێو.
نقيض: ضد. عكس/ دژ، پێچەوانە.
على طرفي - : ضِدَّهُ على خط مستقيم/ پێك ناگەن.
النقيضان: الأمران المتخالفان/ دوکاری جیاواز، لەیەك نەچو، پێچەوانەی یەکتر.
تَناقُض: تبايُن. مُخالفة/ دژوار، جیاوازی، ناکۆکی، پێچەوانە.
مُناقِض: ضد. على عكس/ پێچەوانە، بەپێچەوانە، جیاواز.
مُتناقِض: متعارِض: مُخالِف/ جیاواز، دژوار، پێچەوانە.
مُناقَضَة: مُخالَفَة. مُعارَضة/ جیاوازی، لەیەك نەچون، دژواری.
منقوض: محلول. مفكوك/ کراوە، شل.
- : مُعارَض/ جیا، پەسەند نەکراو.
- . يُنقَض. يُفنَّد/ بەدرۆ خراو، هەڵوەشاو.
نقط:
نَقَطَ. نَقَّطَ الحرفَ: جعل له نقطاً/ خاڵی بۆ پیتەکان دانا.
- . - الكلام: فصله بعلامات الوقف/ خاڵ رێژی کرد.
نَقَّط: لَطَخَ بِنُقط/ خاڵ خاڵی کرد، پەڵەپەڵەی کرد، پیسی کرد.
- الماءُ: قَطَر. جعله يقطر/ تکا، ئاو ئەتکا.
- العروسَ: اعطاها هَديَّة/ دیاری دا بە بوکێ.
نُقْطَة على الحرف او تحته/ پنت، خاڵ، نوکە.
- : مَكان. بُقْعَة/ جێگە، شوێن، جێ.
- : امر. مسئلة/ کار، باس، بارە.
- الخلاف/ بارەی ناکۆکی و جیاوازی.
- الضعف/ شوێن لاوازی.
- الدائرة: مركزها/ چەق.
- الوقف بين الجمل/ پنت، وێستە.
- الخفير او الشرطي/ بنکەی پۆلیس.
- العرس: هَديَّة/ دیاری.
- قَطرَة/ تکە، دڵۆپ.
- عنبر: شامَة/ خاڵی گۆنا، خاڵ.
منقوط. مُنَقَّط: مُرقَّط/ بەڵەك، پەڵاوی، خاڵخاڵ، خاڵبەند.
نقع:
نَقَعَ. انْقَعَ الشيءَ في الماء: اقَرَّهُ فيه/ تەڕی کرد، خستیە ئاوەوە، خوسانیەوە.
- . - غُلَّة قلبه: صَبّ جام غضبه/ داخی دڵی رشت.
- . - الماءُ العطَشَ: سكنه/ تینوێتی شکان.
- الماءُ في بطن الوادي: رَكَدَ/ ئاو وەستا، پەنگی خواردەوە، بو بە (زۆنگ، زەلکاو).
انْقَعَ. إستنقع الماءُ: اَسَنَ/ بۆگەنی کرد، گۆلی بەست.
نَقْعٌ: المصدر من نقع/ تەڕکردن، لە ئاو هەڵکێشان، خۆساندنەوە.
- : ماء مُستَنقَع/ ئاوی راوەستاو، گۆلاو، زۆنگ، زەلکاو.
نُقاعَة: نَقيع. مَنْقوع/ لە ئاو کێشراو، تەڕکراو، خوساو.
نَقوع مُنْقَع: الفاكهة المُجَفَّفة التي تُنْقَع في الماء/ خۆشاوی میوەی وشك کراو.
ناقِع: الذي يَنْقَع/ تەڕکەر، لەئاو هەڵکێشەر.
سُمّ - : قاتل/ ژاری کوشندە، ژەهری هەلایل.
شرابٌ - : مُنعِش/ سەفراشکێن، خەم رەوێن.
مُستَنقَع: سَبْخَه. غَيْظَة/ گۆلاو، زەلکاو، زۆنگ.
نقل:
نَقَلَ الشيءَ: حَوَّلَهُ من مكان الى آخر/ گواستیەوە، گوێزایەوە.
- : اَوصَلَ و سَلَّم/ گەیاندی، بردی.
- : حمَلَ/ هەڵیگرت.
- : حَرَّكَ/ جولانی، بزوانی، لەقانی.
- : غَيَّرَ مسكنه/ گواستیەوە، گوێزایەوە.

ن

— : نَسَخَ/ لەبەری نوسیەوە، نوسخەی لەبەرگرتەوە.
— عن فُلان: رَوى عنه/ لێیەوە گێڕایەوە.
— من لُغة الى اخرى ترْجَمَ/ گوڕی، وەریگێڕا.
— الخبَرَ او المرضَ. أوصل/ گەیانی، بڵاوی کردەوە.
تَنَقَّلَ: اكثر الإنتقال/ زۆر ئەجوڵێ و جێگە ئەگۆڕێ، جێگە بەخۆی ناگرێ.
— : تَحَوَّلَ من مكان الى آخر/ گواستیەوە، چوە جێگەیەکی تر.
نَقَلَ الأشياء: بدَّلَ مواضعها/ جێگاکانیانی گۆڕی.
ناقَلْتُهُ الحديثَ. نقلت اليه ما عندى و نَقَلَ الىَّ ما عنده: حَدَّثتُهُ وحَدَّثَنى/ قسەمان بۆ یەکتر کرد.
تناقلوا الحديث: نقله بعضهم من بعض/ دەماو دەم گێڕایانەوە.
إنْتَقَلَ: تَنَقَّلَ: تَحَوَّلَ/ گواستیەوە، گوێزایەوە، چوە جێیەکی تر.
— الى رحمة الله: مات/ مرد، کۆچی کرد، کۆچی دوایی کرد.
تناقلته الألسُن/ دەماودەم کەوت، کەوتە سەرزار.
— الأيادى/ کەوتە بەردەست، زۆردەستی بینی، دەستاودەست کەوت.
— الجرائد/ لە رۆژنامەکاندا بڵاوبوەوە.
نَقْل: تحويل من مكان الى آخر/ گواستنەوە، جێگۆڕین.
— : إيصال/ گەیاندن.
— : ترجمة/ گۆڕین، وەرگێڕان.
— : نَسْخ/ لەبەر نوسینەوە، لەبەرگرتنەوە.
— : تَقْليد/ لاسایی کردنەوە.
— : نِقل. مَنْقَل: نعل او الخف البالى/ سۆڵ و پێلاوی کۆن.
نَقْلَة: المرَّة من نَقَلَ/ جار، کەرەت.
ناقِل: حامل/ هەڵگر، گوێزەرەوە.
— : مُتَرْجِم/ وەرگێڕ.
— : ناسِخ/ لەبەرنوس.
— : موصل/ گەیەنەر.
إنتقال: تَحَوَّلَ من مكان الى آخر/ جێگەگۆڕین، گواستنەوە، گوێزانەوە.

— : تحَوُّل: تَغَيُّر من حال الى حال/ گۆڕاو.
— : وفاة/ مردن، کۆچ کردن، کۆچی دوایی.
تنَقُّل: تحَرُّك/ هات و چۆ کردن، گواستنەوە.
تَنْقيل: تبديل الموضع/ جێگە گۆڕین.
مَنْقول: يُنْقَل/ هەڵ دەگیرێ، ئەجوڵێ، ئەگوێزرێتەوە.
— : نُقِل/ گوێزرایەوە، گواستیەوە.
— : مَنْسوخ/ لەبەر نوسراوە.
منقولات: خلاف الثابت/ شت و مەك كە ئەجوڵێنرێ و ئەگوێزرێتەوە.
مُتَنَقِّل: غير ثابت/ ئەگوێزرێتەوە، ئەجوڵێ.
— : مُتَجوِّل/ گەڕۆك.
— : رَحّال/ کۆچەر، رەوەند.
نُقْلة: نَميمَة لقلقة الكلام/ قسەگواستنەوەو گێڕانەوە.
نَقْلى: سَماعى/ دەماو دەم، بە بیستن.
نَقّالَة: محَفَّة/ دەستەبەرە.
مَنْقَلة: مرْحَلَة/ قۆناخ، کاروان سەرا.
— : مقياس الزوايا/ مەنقەلە، سۆچێو.
نَقّال: مُتَحرك/ ئەجوڵێ، ئەگوێزرێتەوە، بزێو.
مُناقَلَة: النقل من مكان الى آخر/ گوێزانەوە، جێگە گۆڕین.
نواقل الدهر: نوائبه/ هەڵس و کەوتی زەمانە.
نَقَل: صغار الحجارة/ وردە بەرد، چەو، زیخ، چەگڵ.
نقم:
نَقَمَ. نَقِمَ. إنْتَقَمَ لنفسه منه: عاقبه/ تۆڵەی خۆی سەند.
— . — عليه: حَقَدَ/ (قین، رق)ی لێ هەڵگرت.
— — عليه حَقَّهُ: انكره عليه/ مافی خوارد، دانی پیا نەنا.
نِقْمَة. إنْتِقام: ثأر/ تۆڵە، تۆڵە (کردنەوە، سەندنەوە)، پێ‌نواندن.
— : غَضَب/ توڕەیی، رق، قین.
ناقِم: حاقِد/ بەقین، رقاوی، دڵڕەش.
— على الحياة/ بەرق لە ژیان، بێزار لە ژین.
— . مُنْتَقِم: الذى ينْتَقِم/ تۆڵەسێن.
نقه:

نَقَهَ. إنْتَقَهَ من مَرَضِهِ: صَحَّ/ چاك بوەوە، هەڵسا، بوژایەوە.
نَقَهْ. ناقَهْ: مُتعافٍ/ چاك، چاكەوەبو، هەڵساو.
نَقَهَ. نُقوه. نَقْهَة. نَقاهَة: إفاقَة/ چاك بونەوە، بوژانەوە.
دار: النقاهة/ بوژانگە.
نقي:
نَقِيَ (نَقاءً و نقاوَةً): نَظُفَ/ پاك بوەوە، خاوێن بوەوە، پاكەوە بو.
— : صَفَى و خَلَصَ/ رون بوەوە، زرنگایەوە.
نَقا. انقى العظم: استخرج مَخَّه/ مۆخى ئێسقانەكەى دەرهێنا.
نَقَّى. انْقَى: جعله نقياً/ پاكى كردەوە، خاوێنى كردەوە، زرنگانیەوە.
— . إنتقى: إختار/ هەڵیبژارد.
— القَمحَ مثلاً/ بژاردى، پاكى كردەوە، پاكژى كرد.
نَقاء. نَقاوَة/ خاوێنى، پاكى، پاكژى.
نَقاوَة: نُقاوه. نُقايَة الشيء خياره/ هەڵبـژێرراو، هەڵبژرادە، پوختە.
نَقِيْ. نَقِيٌ: صاف. نظيف/ روون، پاك، پوخت.
— . — : طاهر. غير ملوث/ خاوێن.
انقى: اكثر نقاءً/ پاكتر، خاوێنتر، پوختەتر.
إنتقاء: إختيار/ هەڵبژاردن.
تَنْقِيَة: تَصفية. تطهير/ پاك كردنەوە، خاوێن كردنەوە، پاكژكردن.
نكب:
نَكِبَ: أصاب بنكبة/ توشى بەلابو، كۆستى كەوت، سەرى لێ تێك چو، كارەساتى بەسەرهات.
— ت الريح: مالت عن مهبها/ باكەى گۆرى.
— . نكَبَ. تَنَكَّبَ عن: حادَ/ لایدا، پێچى كردەوە، وەرىگێرا.
— . — عن: عَدَلَ/ وازى هێنا، دەستى هەڵگرت.
تَنَكَّبَ عنه: تَجَنَّبَهُ و إعتزله/ خۆى (لێلادا، لێپاراست)، وازى لێ هێنا، لێى دوركەوتەوە.
— الشيءَ: ألقاه على عاتقه/ خستیە سەرشانى.
— على الشيء: إتَّكَأ عليه/ خۆى دا بەسەريا، شانى خستە سەر.
نَكْبَة. نكب: مُصيبَة/ كارەسات، بەلا، سەمەرە، فەتارەت، كۆست كەوتن، سەرلێتێك چون، لێقەومان، نەهاتى، قۆرت.
منكوب: مُصاب بنكبة/ كۆست كەوتو، سەرگەردان، كولۆڵ، لێقەماو.
مَنكِب: عاتِق: كَتِف/ شان، باهو.
نكت:
نَكَتَ: حَفَرَ/ هەڵیكەند، هەڵیكۆڵى، روشانى.
— العظمَ: اخرج مُخَّهُ/ مۆخەكەى دەرهێنا، دایتەكان.
— الرَجُلَ القاه على رأسه/ بەسەردا داى بەزەویدا.
نَكَّت في كلامه: جاء بالنكت/ نوكتەى هێنايەوە.
— على: مازَحَ/ نوكتەى پێكرد، گاڵتەى لەگەڵ كرد.
نُكْتة. نُقْطَة/ خاڵ، پەڵە، روشاوى.
— : مُلحَة. الجملة اللطيفة/ بۆ پێكەنین، نوكتە، گاڵتەوگەپ.
نَكّات. مُنَكِّت: الذى يَجيء بالنكت في كلامه/ نوكتەباز، قۆشمە، گاڵتەچى.
— . — : طَعّان في الناس/ گاڵتەچى، بەخەڵك رائەبوێرێ، قەشمەر.
تنكيت: إنتقاد هزلي/ پێرابواردن، رەخنە بە گاڵتەوە.
— : الإتيان بالنكت/ نوكتە هێنانەوە.
مَنكوت: مُلقى على راسه/ بەسەراكەوتو.
نكث:
نَكَثَ العَهْدَ او البيعَ: نَقَضَهُ و نَبَذَهُ/ پەشيمان بوەوە، پەیمانى شكان.
إنْتَكَثَ: إنْتَقَضَ/ هەڵوەشا، تێك چو، شكا.
نَكْث: نَقْض. كَسْر/ هەڵوەشان، تێكدان، شكان.
— : عدم وفاء/ سپڵەیى، بێوەفایى.
— العَهْد/ پەیمان شكاندن، ناپاكى، بێوەفایى، دەست برین، پەشيمان بونەوە.
ناكِثُ العَهد/ دەست بڕ، پەیمان شكێن، بێوەفا.
نكح:
نَكَحَ المراة: تَزَوَّجَها/ هێناى، مارەى كرد.

– ت المرأةُ: تزوجت/ شوى كرد، مێردى كرد، درا بەشو.

أنْكَحَ: زَوَّجَ/ داىبەشو، مارەى برى.

نكاح: زواج/ مارەكردن، ژن هێنان، شوكردن، هاوسەرگرتن.

ناكح. ناكحة: ذات زوج/ بەشو.

مَناكح: نساء/ ئافرەت، ژن.

نكد:

نَكَدَ. نَكَدَ العَيْشُ: إشْتَدَّ و عَسَرَ/ ژيان تاڵ بو، گوزەران ناخۆش بو.

نَكَّدَ عَيْشَهُ: جَعَلَهُ نكداً. كَدَّر عَيْشَهُ/ ژيانى تاڵ كرد، گوزەرانى ناخۆش كرد.

تَنَكَّدَ عَيْشَهُ: تَكَدَّرَ/ ژيانى لێتاڵ بو.

نَكَدٌ: كَدَرَ/ ناخۆشى، سەرلێتێك چون، بەدبەختى.

نكد: شَكس. وَعِق/ بێئابرو، بێحەيا،شەڕانى.

رجلٌ – و نَكد: قليل الخير عسر/ پياوى بێخێرو رەق.

أنْكَد. منكود الحَظّ: سيء الحَظّ. تعس/ بەدبەخت، بێشانس، هەناسەسارد، رەنجەڕۆ، كەساس.

منكود. مُنَكَّد: قليل/ كەم، ئايەخ، هيچ و پوچ.

نكر:

نَكِرَ الأمرَ أو الرَجُلَ. جَهِلَهُ/ خۆى لێ (هەڵەكرد، گێل كرد)، ئينكارى كرد، نەى ناسيەوە.

نَكَّرَ: اخفى/ شارديەوە.

– الإسمَ: جَعَلَهُ نَكِرَةً/ كردى بە ناسراو.

أنْكَرَ حقَّه: دَحَضَ/ مافى خوارد، دانى پيانەنا، نكوڵى كرد،ئينكارى كرد.

– ذاتە/ خۆى لەبيركرد، ئينكارى خۆى كرد.

– عليه فعْلَهُ: عابَهُ و نَهاهُ عنه/ كردەوەكەى بە ناشيرين داناو سەرزەنشتى كرد، پەسەندى نەكرد.

إستَنْكَرَ الأمْرَ: رفضَهُ. نَهاهُ/ ناڕەزايى دەربڕى، بێزارى نواند.

– . تَناكَرَ الأمْرَ: جَهِلَهُ/ خۆى لێ (هەڵەكرد، گێل كرد).

تَناكَرَ الأمرَ: تجاهَلَهُ/ خۆى وا پيشان دا هيچى لێ نازانێ.

– الرجل: تجاهلهُ/ خۆى وا پيشان دا كە ناى ناسێ.

تَنكَّرَ: تَخَفّى/ خۆى گۆڕى، چوە بەرگێكى ترەوە.

– له: لَقاهُ لقاءً بَشعاً/ زۆر ناشيرين ديدەنى و پێشوازى كرد.

نُكر. نُكران. نكير. إنكار: رَفض. دَحض/ دان پيانەنان، ئينكارى كردن.

نكران الجميل. إنكار الجميل. جحود المعروف/ سپڵەيى، پێنەزانين، لەبەرچاو نەبون.

– الذات/ خۆنەناسى، خۆ لەبيركردن.

ناكر الجميل: كَنود. عاق/ سپڵە، پێنەزان، نان كوێر.

نكرة: نقيض المعرفة. غير مُعَيَّن أو معروف/ نەناسراو، نەناس.

تَنَكُّر: إستخفاء/ خۆگۆڕين، خۆلێگۆڕين، چونە بەرگێكى ترەوە.

قناع الـ – / روپۆش، روگۆر، ماسكە، دەمامك.

مُنْكَر: غير مُعْتَرف بە/ دان پيانەنراو، نەويستراو.

– : ما ليس فيه رضا الله/ ئەوەى خوا نايەوێ بكرێ.

– : امر قبيح/ كردەوەى ناشيرين، كارى ناپەسەند.

– و نكير/ دومەلايكەى پرسيارکەرن، ئينكيرو مونكير.

مُتَنَكِّر: مُتَخَفٍّ/ روپۆشراو، خۆگۆڕ، بەرگ گۆڕاو.

نَكراء: دهاء و فطنة/ ژيرى، زيرەكى، بليمەتێ.

– : شِدّة/ تەنگانە، ناخۆشى، گۆتاوەڕۆ.

نكس:

نَكَسَ. نَكَّسَ: قَلَبَ/ (ئاوەژو، ئەم ديوئەوديو، سەرەوژێر)ى كرد، هەڵيگێڕايەوە.

– . – راسه: طاطاهُ/ سەرى (شۆڕ كرد، دانەواند)، ملى درێژ كرد، پێى لێراكێشا.

– . – داء المرض: اعادله/ نەخۆشيەكە گەڕايەوە سەرى، نەخۆشيەكەى گرتەوە، توشى بوەوە، بۆى گەڕايەوە.

نُكِسَ. إنْتَكسَ المريضُ: عاوَدَهُ المرضُ/ نەخۆشيەكەى گرتەوە، خراپ تر بو، وەك خۆى لێ هاتەوە.

**تـنكس**: انحطَّ عن اصله الطيب/ ناچیزه دەرچـو، یاخی بو

**نكَّس العَلَم**: انزل الی الوسط/ ئالای هێنایە ناوەڕاست، کەچی کرد

**نُكس. نكْسَة. إنتكاس**: العودة الی سابق الحال/ گەڕانەوە، بۆ دۆخی جاران.

**نكسه**: خيبَة. فشل/ یارك کەوتن، تێشکان، نوچ دان.

**تَنكُّس**: إنفساد الاصل الطيب/ ناچیزەیی، یاخێتی.

**مُـنكَّس**: منكـوس: مقلـوب/ هەڵاوگـەڕاو، ئـاوەژو، سەرەوخوار، نخون.

**نكش:**

**نَكَشَ إنتكش البئرَ**: طَهَّرَها/ پاکی کردەوە، دەریدا.

**نكص:**

**نكص عن كذا**: احجم/ وازیهێنا، دەستی هەڵگرت، پەشیمان بوەوە.

– **علی عقبيه. إنـتكص**: تراجع/ گەڕایەوە، کشایەوە.

**نكَّص**: جعله يتراجع/ پەیشمانی کردەوە، گەڕانیەوە.

**ناكص. منكص**: مُتنحی/ پەشیمان، کشاوە، گەڕاوە.

**نكف:**

**نَكِفَ. نَكفَ منه و عنه**: انِف منه و إمتنع/ بێزی لێکردەوە، لالوت بو لێی.

– **دمْعَتهُ**: مسَحها/ فرمێسکی سڕی.

**ناكَفَهُ الكلام**: قابله بمثله/ له رویا هەڵگەڕایەوە، وەڵامی دایەوە.

– : نازع/ مشت و مڕی کرد، چەن و چونی کرد.

– **فی البيع و الشراء**/ سەودای کرد، چەن و چونی کرد.

**إستنكف من كذا**: إمتنع انفةً و إستكباراً/ بێزی لێهاتەوە، قێزی لێهاتەوە.

– : إستكبر/ ترزل بو، خۆی بەزل گرت.

**غيثٌ لا يُنكَف**: لا ينقطع/ خـۆش ناکاتەوە، باران دوایی نایەت.

**جَيشٌ لا –** : لا يُحصی/ لەشکرێکی بێشـومارە، نازمێرێ، له ژمارە نایەت.

**بحْرٌ لا –** : لا يُسبَر غوره. لا يُبلَغ آخره/ نە سەری هەیە و نەبن، دەریایەکی بێبنە.

**مُناكفة**: مُنازعة. مُضايَقَة/ چەن و چونی، تەنگ پێ هەڵ چنین.

**نُكاف**: مرض الغُدّة النكيفيه/ ملەخڕێ، ئالوکەوتن.

**نكَفة**: غُدَّة بجوار الأذن/ لـوی ملـەخڕێ، ئـالوی ملەخڕێ.

**ناكف**: ممتنع. متبرىء/ لالوت، ناقایل، بەدڵی نیە.

**نكل:**

**نكَلَ و نَكِلَ عن او من كذا**: نَكَصَ و جَبُنَ/ له ترسا کشایەوە، وازی هێنا، پەشیمان بوەوە.

– . **نكَّلَ به**: مثَّل/ کردی بە نمونە، بەزمی پێکرد، پەنگی پێدا.

**نَكَّل. انْكَلَ**: دَفَعهُ و صَرَفَهُ/ دەستی پێوەنا، گەڕانیەوە.

– **به**: صنع به صنيعاً/ دەستی بڕی، بەزمی پێکرد، پەنگی پێدا.

– **ناكل**: الجبان الضعيف/ ترسنۆکی لاواز، ناپیاو.

**نكْل. نِكْل**: قَيْدٌ شديد/ جەڕاو، بەستنی قایم، کۆت و بەستنی جەڕاو.

– . – : **حديدة اللجام**/ ئاسنی لغاو، زمانەی لغاو.

**نكال**: ما يُجعَل عبْرةً للغير/ کراو به نمونە، به پەنگ.

**نكه:**

**نَكَهَ و نَكِهَ له و عليه**: تَنَفَّسَ علی انفه. شَمَّ ريحَ انفه/ بۆنی لوتی کرد.

**نَكْهَة**: رائحة الفم/ بۆنی دەم.

– : طعم/ تام و بۆن، بۆن و بەرامە.

**نكی:**

**نكی العَدُوَّ و فيه**: قَهَرَهُ/ بەزانی، شکانی، زاڵ بو، سەرکەوت.

– : أغاظ/ قینی گرت.

**نكايَة**: قهر/ بەزانن، شکاندن، سەرکەوتن، زاڵ بون.

– : إغاظة. كيد/ قین، رق.

– **فيه**/ له رقی ئەو، له قینی ئەو.

**نم:**

نَمَّ الحديثَ: أظهره بالوشايَة/ بوختانی کرد، بەشێوەی بوختان قسەی گێڕایەوە، گوایا ئەڵێن.
– الحديثُ: ظَهَر/ دەرکەوت، ئاشکرا بو، زانرا.
– بينهم: أفسد/ تێکی دان، ئاشوبی لەناویانا نایەوە، دوزمانی و فیتنەیی کرد لە ناویانا.
– علی: أظهر/ دەریخست، ئاشکرای کرد، خستیەڕو.
نَميمَة. نَمّ: وشايَة/ بوختان بەدەمەوە هەڵبەستن، دوڕویی، پاشملە باس کردن.
نَمّ. نمَّام. فَتَّان. واشٍ/ بوختان کەر، فیتنە، دوڕو.
نامَّة: حَرَكَة/ جوڵە، بزوکی، بزێوی.
– : حياة/ ژین، ژیان.
نمَّة: قَمْلَة/ ئەسپێ، مۆریان.
نَمْنَمُ: نَقَشَ و زَخْرَفَ و زَيَّنَ/ رازاندیەوە، نەخشانی.
نمْنَمَة: صَعْوَة. طائر صغير/ فیرنە گولە.
مُنَمْنَم: مُنَمَّق. مُزَيَّن/ رازاوە، نەخشاو.
– : متناسق الصُغر/ وردیلە.
– : مُنَقَّط. مُنَقَّش/ خاڵخاڵ، خاڵرێژ، پرخاڵ.
نِم نِم. نِمْنِم: خرز ناعم/ زەنگیانە.
نمر:
نَمِرَ. نَمَّرَ. تَنَمَّرَ: غضبَ/ تورە بو، رقی هەڵسا.
نَمَّرَ: رَقَّمَ/ ژمارەی لێدا، نمرەی لێدا.
نمر. نَمْر. نِمْر: حيوان/ پڵنگ.
نَمِرَة. فرارَة. أنثی النمر/ دەڵە پڵنگ، ما پڵنگ، پڵنگە مێچکە.
– . نُمْرَة: نُقْطَة/ خاڵ، پەڵە، پنت
– . – . نِمْرَة: رقم/ ژمارە، نمرە.
– . – . – : درجة. علامَة/ نیشانە، نمرە.
أنْمَر: ارقط/ پەڵاوی، پڵنگی، پڵ.
مُنَمَّر: مُرَقَّط/ پەڵاوی، خاڵ خاڵ، پڵ.
– : مُرَقَّم/ نمرە لێدراو، ژمارە کراو.
نَمير من الماء: الزاكی العذب/ ئاوی سازو خۆش.
نمس:
نمس السِرَّ: كَتَمَهُ/ نهێنیەکەی شاردەوە.
– نامَسَ الرَجُلَ: سارَّهُ/ نهێنی خۆی لا درکان، رازی خۆی لاوت.
ناموس: موضع السِرّ: صاحِب السرّ/ نهێن پۆش، باوەڕ پێکراو، نهێن گیر.
– : مَكّار/ فێڵباز، ساختەچی.
– : نَمَّام/ بوختان کەر، فیتنە، دوڕو، دوزمان، سەربە ئاشوب.
– : مَكمَن الصائد/ بۆسە.
– : شريعة/ یاسا.
– : قاعدة/ شێواز، نەریت، باو.
– و الواحدة ناموسه: بعوض/ مێشولە.
– كاذب/ مێشولە وردە، ورە.
– : عَرين الأسَد/ لانەی شێر.
ناموسِيَّة: نَسيج لوقاية البعوض/ کوللە، پەردەو کوللە.
نمش:
نمِشَ الجلد أو الوجه: صار فيه نَمَش/ شلّ بو، منجلّ بو.
نَمَشَ. انْمَشَ الرجل: كذب و أتی بالنميمة/ بوختانی کرد، درۆی (کرد، هەڵبەست).
نَمَشُ الجلد: نُقَط فی الجلد/ شلّی، پەڵەی پێست، منجلّی.
نَمِش. انْمَش: اكلف/ شلّ، پێست پەڵاوی، پلّ، منجلّ.
نمط:
نَمَط: طِراز/ شێواز، باو، بابەت، شێوە، سەمت، پێ.
حديث ال – / تازە بابەت، مۆدەی نوێ.
قديم الـ – / بابەتی کۆن، مۆدەی دێرین.
علی هذا الـ – / بەم شێوەیە، لەم سەمتە، لەم پێیە، بەم چەشنە، بەم جۆرە.
نمطی. رَتيب/ رۆتین.
نمق:
نَمَّقَ: دبَّج. حَسَّنَ و زَيَّنَ/ نەخشانی، رازاندیەوە، رێکی خست.
تَنميق: تَحسين و تَزيين/ نەخشاندن، رازاندنەوە، رێك خستن.
مُنَمَّق: مُزَخْرَف: مُدَبَّج/ نەخشاو، رازاوە، رێك خراو.
نمل:

نمِلَ. نَمِّلَ الجلدُ و الجسد: خدر/ میرولـەی کـرد، سربو.
نَمْل و الواحِدَة نمْلة: حشرة معروفة/ مێروله، مێرو، مور.
الـ – الأعمى او الأبیض: ارضَة/ مێروله سپی، مۆرانه.
الـ – الأحمر/ کێلکه، شەنگەمێرو.
نَمْلی: یُشبه النَمل/ مێرولەیی.
نَمِل: خَفیف الحرکة/ سوکەڵە، بزێو.
– . مُنَمَّل: خدِر/ سڕ.
– القوائم: خفیفها فی الحرکة/ خـۆش (ڕەو، دەو، بەز)، قاچ سوک، بزێو.
– . مَنمول: کثیر النَمل/ مێرولاوی، پڕ له مێروله.
نمل تَنْمیل: خَدَر/ سڕبون.
انْمَلَة. انْمُلَة (الجمع انامل): راس الأصبع/ سـەری (پەنجە، ئەموست، قامك).
قیـد – : قلیـل جـداً/ تۆزقـاڵی، کـەمێ، ئەوەنـدەی (تۆزێك، سەری پەنجە).
نمو:
نَما: کَبِرَ او کثُرَ او إزداد/ (گەورە، زۆر، زل، زیاد) بو، گەشەی کرد، فراژێ بو.
نُمو: کبر او إزداد او تکاثر/ (گەورە، زۆر زل، زیـاد) بون، گەشە کردن، پەرەسەندن، فراژێ بون.
نموذج. انوذج: مثال/ نمونه، وەك،.
نمی:
نمی (نَمْیی و نماء و نَمِیَ): کَبُرَ/ گەورە بـو، زل بـو، گەشەی کرد، پەرەی سەند، باژەڵەبو
– : إزداد/ زۆر بو، زیادی کرد.
– : إرتفع و غلا/ بەرزبوەوە، گران بو.
– الحدیثُ الی: عُزِیَ الیه/ درایه پاڵی، کرا به هی ئەو، لێیەوە ئەگێڕنەوە.
– الخَبَرُ: بَلَغَهُ/ هەواڵ گەیی، بڵاوبوەوە، پێیگەیی.
نَمّی. انْمَی: کَبَّرَ/ گەورەی کرد.
– . – : زَیَّدَ/ زۆری کرد، زیادی کرد.
إنتمی الی: إنتسب/ گەڕایەوە بۆ.
نُمُوّ. نماء. نَمیّ: إزدیـاد/ (گەورە، زۆر، باژەڵە، زیـاد) بون، گەشەکردن، پەرە (سەندن، دان).
– . – . – : تقدُّم/ پێشکەوتن.
تنْمیَة/ پەرەپێدان، گەشەپێدان.
نـام: ناضـج/ گـەورەبو، گەشـاوە، زۆر بـو، پێگـەییو، پەرەستێن.
نامیَّة: قُوَّة النمو/ مێـزی گـەورە کـردن و پێگەیانـدن، گەشندە، پەرەستێن.
البلدان – / وڵاته پەرەستێنەکان.
نمیمة (فی نم) نهار (فی نهر) نهایة (فی نهی)
نهب:
نَهَبَ. نَهِبَ. سَلَبَ. اخذَ/ تـاڵانی کـرد، بـردی، فڕانـدی، داگیری کرد.
– . – . تناهَبَ الأرض: عَدی سریعاً/ دایە (گـوڕ، غار)، تەنگی زەوی کێشایەوە.
نَهْب: جری سریع/ لۆقـە، غـار، گـوڕ، خێـرا ڕۆیـشتن، دەو.
– : غنیمة/ تاڵانی.
نَهْـب. نُهْبَـة نُهْبـی. نُهَیْبـی. نَهیبـه: سَـلْب. اخـذ الغنیمة/ تاڵان کردن، تـاڵانی، ڕاووڕوت، فڕانـدن، بـردن، بەغما.
نَهّاب. سالب. قاطع طریق/ جەردە، دز، تاڵان کەر.
مَنهـوب: مـسلوب. غنیمـة/ تـاڵانی، تـاڵان کـراو، دەستکەوت، فڕێنراو، داگیرکراو.
نهج:
نَهَجَ: تتـابَع نَفَسُهُ. لَهَثَ/ هەناسـەبڕکێی (بـو، کـرد، پێکەوت).
– السبیل: سلکه/ ڕێگەکەی گرت، پیاڕۆی، پەیڕەوی کرد.
– . اَنْهَـجَ الأمـرُ و الطریـقُ: وَضَـحَ/ دەرکـەوت، ئاشکرابو، ڕون بوەوە.
– . – الأمـرَ و الطریـقَ: اوْضَـحَهُ/ دەریخـست، ئاشکرای کرد، ڕونی کردەوە.
انْهَجَ. نَهَّجَ: جَعلَهُ یَلْهَث/ هەناسەبڕکێی پێخست.
إنْتَهَجَ الطریقَ: سلکه/ ڕێگەکەی گرت، پیاڕۆی.
– . إسْتَنْهَجَ سبیلَه: سلك مسلکه/ ڕێو شـوێنی ئەوی گرت، پەیڕەوی کرد.
نَهَجٌ. نَهیج. لُهاث/ هەناسەبڕکێ.

نَهَج. ناهج طريق واضح/ ڕێگەی ئاشكراو دیار.
– : اسلوب: خُطَّة/ ڕێباز، ڕێوشوێن، بەرنامە، نەخشە.
– : البلاغة: الطريق الرئيسي الى حُسْن البيان/ ڕێبازی ڕەوان بێژی.
مَنْهَج. منْهَج. منهاج: طريق واضح/ ڕێگەی ئاشكراو ڕون، بەرنامە.
– . – . – التعليم أو الدروس: خطة و اسلوب التعليم/ بەرنامە، بەرنامەی خوێندن و قوتابخانە.
– . – : اسلوب/ ڕێباز، ڕێو شوێن، بەرنامە.
– . – : خُطَّة/ پلان، پیلان، نەخشە.
نهد:
نَهَدَ الثدي: بَرَزَ/ مەمك گەورە بو، پێگەیی، ئەگیرێ، خڕ بو.
– ت النبت: كعبت ثديها/ كچەكە مەمكی كرد، مەمكی خڕ كرد.
– : قام: نهض/ هەڵسا، ڕاست بوەوە.
ناهَدَ: ناهَضَ. خاصَمَ/ دوژمنایەتی كرد، ناكۆكی كرد.
– : تحدَّى/ بەربەرەكانی كرد، بەرەنگاری كرد، لەڕویا (هەلگەڕایەوە، وەستا).
تَنَهَّدَ: تنفّسَ طويلاً/ هەناسەی هەڵكێشا.
تناهَدَ الاصحاب: تشاركوا على نفقه الطعام/ داكۆكیان كرد، كۆیان كردەوە.
– وا الشيءَ: تناولوه بينهم/ بەشداریان تیاكرد.
ناهد: ثَدي بارز/ مەمكی (قوت، قنج، خڕوخەپان).
– : إمراة نَهَدَ ثَدْيَها/ مەمك كردو.
– : اسد/ شێر.
غلام – : مُراهِق/ هەرزەكار.
نَهْد: شيء مرتفع/ بلند، بەرز، دیار، دەرپۆقیو، دەركەوتو.
– : ثَدي/ مەمك، مەمكۆڵە، مەمان، مەمە، سنگ.
تَنَهُّد: تَأَوُّه. تَحَسُّر/ هەناسە هەڵكێشان.
مُناهَدَة: مُخاصَمَة/ ناكۆكی.
نَهْدان: مَلآن/ پڕ، لێوان، سەرڕێژ.
نهيد. شريك طعام/ بەش خۆر.

نِهْد: ما تُخْرِجُه الرِفْقَة من النفقة بالسويّة/ برا بە شێتی، هەر كەس لەسەر حسابی خۆی.
نهر:
نَهَرَ الماءَ: جرى في الارض و جعل لنفسه نهراً/ جۆگەی بەست، بو بە جۆگەلە.
– الدمُ: سال بشدَّة/ فیچقەی كرد، دەرپەڕی.
– النَهْرَ: حَفَرَهُ/ جۆگەی (هەڵكەند، لێدا).
– :إنتهر: زَجَرَ/ تورە بو، پیا هەڵ (شاخا، كاڵا).
– . – : صاحَ مُتَوَعِداً/ قیژانی، هەڕەشەی كرد.
انهر النَهْرَ: وَسَّعَهُ/ جۆگە یا ڕوباری فراوان كرد، جۆماڵێ كرد، پاكی كردەوە.
نَهْر: مجرى الماء الكبير/ ڕوبار، چەم، زێ، جۆگە، جۆ، جۆبار، خڕ.
– من صَفْحة كتاب او جريدة: عمود. حَقل/ ستون.
نَهْري: مختص بالأنهر/ ڕوباری، هی ڕوبار.
سمك – / ماسی ڕوبار.
نبات – / ڕوەكی (ڕوبار، ئاوی).
سُفُن نَهْرِيَّة/ كەشتی ناو ڕوبار.
نُهَير: نهر صغير/ چەم، زێ، جۆ.
إنتهار: زَجر/ تورە بون، هەڵ (شاخان، شاخێن، كاڵان، كاڵێن).
– : زجر وطرد/ دەركردن بە تورەییەوە.
كَلَّمَهُ إنتهاراً: إنْتَهَرَهُ/ پیا هەڵ (شاخا، كاڵا)، لێی تورە بو.
نهار : ضد ليل/ ڕۆژ.
– . أنْهَر: شديد الضياء/ زۆر ڕوناك، وەك ڕۆژ ڕوناك.
ضوء الـ – / ڕوناكی ڕۆژ.
منتصف الـ – / نیوەڕۆ.
طلوع الـ – / ڕۆژ بونەوە.
نهاري: يَحدث في النهار/ بە ڕۆژ، هی ڕۆژ، كاروكرداری ڕۆژ.
نَهِر: كثير. وافر/ زۆر، زۆرو زەبەندە، فراوان، فرە.
نهز:
نَهَزَ: انْهَزَ. دفعَ/ پاڵی پێوەنا، دەستی پێوەنا، هەڵیسان.

– الشيءُ: قَرُبَ/ نزيك بوهوه، كاتى هات.
ناهَزَ: قارَبَ/ كاتى نزيك بۆتەوه، نزيكه.
– البلوغَ/ كاتى بلوغ بونيەتى، نزيكى پێگەيينه.
– الخمسين: دنا منها/ نزيكى پەنجايه، گەيوەتە پەنجا سالّى.
– و إنتهز الفرصة: إغتنمها/ هەلى (بەكارهێنا، پەرست).
إنتهز فرصة كذا/ دەرفەتێكى وەهاى هێنا، فلانە هەلى بەكارهێنا.
نُهْزَة: فُرصَة/ هەل، دەرفەت.
نَهّاز الفُرَص: إنتهازي: نَفْعي/ هەل (پەرست، دۆز).
إنتهاز الفُرَص: إغتنام و استغلال الفُرَص/ هەل (پەرستن، بەكارهێنان)، بۆ هەل گەڕان.
نهش:
نَهَش: عضَّ/ قەپى پياكرد، گەستى، گازى لێگرت.
– ـهُ الدهر: جَهَدَهُ و ادفعه في الحاجة/ هەلّس و كەوتى زەمانە هەژارى كرد، كەفتەكار بو.
نَهّاش: عضّاض/ گازگر، قەپ گر.
نهض:
نَهَض. إنتهض: قامَ/ راپەڕى، هەستا راست بوەوه.
– للأمرِ: قام و شرع فيه/ دەستى (دايه، پێكرد).
– للأمرِ: قام و إستَعَدَّ لَهُ/ ئامادە بو، خۆى بۆ ئامادە كرد.
– على: قام ضِد/ لە دژى هەستا، راپەڕى.
– الى: اسرع اليه/ بۆى راپەڕى، بۆى چو، پەلامارى دا.
ناهَض: قاوَم/ بەرگرى كرد، بەرهەلّستى كرد.
– : تَحَدّى/ بەربەرەكانى كرد، بەرەنگارى كرد، لەرويا هەلّگەرايەوه.
– : خاصَم/ دژمنايەتى كرد، ناكۆكى كرد.
انُهضَة: حرَكة للنهوض/ رايوەشان، هەلّيسان، خەبەرى كردەوه.
نَهض. نُهوض: قيام/ هەستا، راست بونەوه، راپەڕين.
نَهضَة: نُهوض: إنتعاش او تَحَرُّك/ بوژانەوه، ژيانەوه، جولّان.

– : حركة نحو التقدم/ راپەڕين، هۆشياربون، جولانەوه بەرەو پێشەوه.
– : طاقة و قُوَّة/ لێهاتويى، وزە، هێزو چالاكى، توانايى، تين.
ناهِض: قائم/ هەستاو، وەستاو، راپەڕيو، بەخەبەر.
– : ثابت/ جێگير، دامەزراو.
– : مجتهد/ تێكۆشەر، چالاك، خەباتكار.
مكان – : مرتفع/ بلّند، بەرز، ديار.
مُناهضة: مُقاوَمَة/ بەرهەلّستى.
نهق:
نَهَقَ. نَهق الحمار: صَوَّتَ/ زەڕى.
نَهْق. نُهاق. نهيق: صوت الحمار/ زەڕين، زەڕەزەڕ، زەڕەى كەر.
نهك:
نَهَكَ الثوبَ و غيره: إستعمله حتى بَلى و خَلق/ كۆن بو، پەكى كەوت.
– عِرْضَهُ: بالغ في شتمه/ قسەى ناشيرينى پێوت، جنێوى پێدا.
– . نَهِكَ. افنى. استنفذ/ تەواو بو، نەما، لێبوەوه.
– . – . إنْتَهَكَ: أضنى. إنْحَلَّ/ شەكەت بو، ماندو بو، هێزى نەما.
– . – . – قُوَّتَهُ/ لە پەل و پۆ كەوت، هێزى نەما.
إنْتَهَكَ الحُرمَة: هَتَك العرضَ. دَنَّس/ كارى ناپەواو ناشيرينى كرد، دەستى بۆ ناموس برد.
– الشيء: اساء إستعماله/ چەوت بەكارى هێنا.
– حُرمَة إمراة: إغتصبها/ بەزۆر (لاقەى ئافرەتى كرد، بنى پژان، كچێتيەكەى برد).
انُهَك: عَذَّبَ/ سزاى دا.
– : قَوَّضَ/ شەكەتى كرد، كفتى كرد، ماندوى كرد، چەوسانيەوه، لاوازى كرد، رەتانديەوه.
– : نَهَك: إستهلك/ بەكارى هێنا، پەكى خست، لەكەلّكى خست.
نُهِكَ. ضُنِيَ/ لاواز بو، پەكى كەوت، نەخۆش كەوت، لە پەل و پۆ كەوت، شەكەت بو.
لا يُنْتَهك: حَصين/ پتەو قايم، سەخت.

نَهَك. إنتهاك: إستنفاذ/ شەكەتی، هێز تیا نەمان، پەك کەوتن، کفتی، ماندویەتی.
— . — : سوء الاستعمال/ چەوت بەکارهێنان.
مُنْهك: مُتْعِب/ شەكەت کار، ماندوکار، کفت کار.
مَنهوك: مُسْتَنْفَد/ پەك کەوتو، پەرپوت، بەکارهێنراو.
— القوی. مُنْهَك: مُتْعَب/ شەكەت، کفت، ماندو، هیلاك.

نهل:

نَهَلَ. شَرِبَ/ خواردیەوە.
مَنْهل: موضع الشرب/ دەفرو شوێنی ئاو خواردنەوە، ئاوخۆرکە.

نهم:

نَهِمَ: اکل کثیراً/ زۆری خوارد، چڵێس بو، زۆر خۆری کرد.
— فی الأکل. اکل بنهم و شَرَه: إلتهم/ تێری نەئەخوارد، چڵێسانە خواردی.
— فی الشیء: رَغِبَ فیه جداً/ ئەیویست، تێری نەئەخوارد، هەر داوای ئەکرد.
نَهَم: بِطْنَة/ زۆر خواردن، زۆرخۆری، تێر نەخواردن.
— : شَراهَة/ چڵێس، خۆرایی.
نهم. نَهیم: شَرِه. مبطان/ زۆرخۆر، چڵێس، خۆرا، تێر نەخۆر، سك دڕاو.
مَنهوم بکذا: مولع به. لا یَشبَع منه/ چڵێس، تێری لێ ناخوا.

نهی:

نَهَی (نَهیاً). نَها (نهواً) عن. مَنَعَ/ نەیهێڵا، قەدەغەی کرد.
— . نُهِیَ. اُنْهِیَ الیه الخَبَرُ: بَلَغَ/ پێی ڕاگەیەنرا، پێی وترا.
نَهّی. انْهی الیه الخَبَرَ: اَبْلَغَهُ/ ڕایگەیاند، هەواڵەکەی گەیان.
اَنْهی: اتمَّ/ تەواوی کرد، لێبوەوە.
— : جَعَلَهُ یَنْتَهِی/ وای لێ کرد (تەواو بێ، ببڕێتەوە، کۆتایی بێ)، تەواو بو، کۆتایی هات.
— : أتی علی (دوایی، کۆتایی) پێهێنا، هیچی نەهێشت.

إنْتَهی: تَمَّ/ تەواو، تەواوبو، کۆتایی هات، دوایی هات.
— : زال. إنقطع/ بڕا، نەما.
— : الأمْرُ/ کار لە کار ترازا.
— امْرَهُ/ لێبوەوە.
— الأهل أو الموعد/ کات بەسەر چو، ڕۆیی، تێپەڕی.
— الشیءُ: بَلَغَ نهایَتَه/ بڕایەوە، هیچی نەما، کۆتایی هات.
— بکذا/ ئاوای لێهات، بەوە کۆتایی هات.
— به الی کذا/ ئەوە وای لێ کرد، بەوە وای لێهات، ئاوای لێهات.
— الیه الخبر: بلغ/ هەواڵەکەی زانی، پێی گەیشت.
— . تناهی الوقت/ کات تێپەڕی، بەسەرچو.
— عن کذا: کَفَّ/ وازی هێنا، دەستی هەڵگرت.
نَهو. إنهاء: إنجاز/ تەواوکردن، کۆتایی پێهێنان،، لێبونەوە.
— . نَهی: مَنع/ قەدەغەکردن، نەهێشتن، نەهێڵان، بەرگری کردن.
نُهیّی: تحریم. حَظْر/ قەدەغەکردن، حەرام کردن.
ناهٍ: مانع/ نەهێڵ، قەدەغەکەر، کۆسپ، بەربەست.
— : آمر بالإمتناع/ نەهێڵ، کەسی قەدەغەکەر.
ناهیك من کذا/ واز لەوە بێنە، جگە لەوە.
مَنْهِیّ عنه: مُحَرَّم/ لێی قەدەقە کراو، حەرام کراو.
نهایة. مُنتهی: اقصی/ ئەوپەڕی، دوایین، کۆتایی، ئەنجام، مەبەست.
— : حَدّ/ سنور، پەڕ، کەنار، سەر.
الـ — الصغری/ کەمترین، ئەم پەڕی، ئەم پەڕەکەی.
الـ — الکبری/ زۆرترین، ئەوپەڕی، ئەوپەڕەکەی.
الی الـ — / تا کۆتایی.
الی مالا — / هەتاهەتا، بێسنور.
لا — له: لیس له نهایَة/ کۆتایی نایەت، تەواو نابێ، بێپایان، نەبراوە.
فی الـ / لە کۆتاییدا، لە ئەنجامدا.
نهائی: أخیر/ کۆتایی، دوایین، پایان، خولی کۆتایی.
— : بات/ یەك لایی بو، کۆتایی پێ هاتو.
لا — / بێپایان، کۆتایی نییە.

**إنتهاء**: آخر/ كۆتايى، دوايى، پايان.
– : **إنقضاء**/ بەسەرچون، تێپەڕبون، بڕانەوە.
– : **زوال**/ نەمان، لەێبونەوە، بڕانەوە.
**حُسن الـ –** / جوان كۆتايى، بەجوانى كۆتايى هاتن.
**إنهاء**: **إنجاز. إتمام**/ تەواوكردن، كۆتايى پێهێنان، لەێبونەوە.
**مُتناه**: **محدود**/ سنوردار، ديارىكراو
**غير –** : **لاحد له**/ بێسنور، ديارى نەكراو.
**غير –** : **لا نهاية له**/ بێكۆتايى، بێئەنجام.
**تَناهٍ**: **الإنحصار ضِمن حَدّ**/ سنور بۆ دانان، ديارى كردن.
**مُنتهٍ**: **مُنْجَز. تام**/ تەواو، تەواو بو، كۆتايى پێهاتو.
– : **مُنْقَضٍ**/ تێپەڕيو، بەسەرچو، نەماو.
– : **لم يبق منه شيء**/ نەماو، تەواوبو، هيچى لێنەماوەتەوە.
**مُنتهى**: **آخر**/ كۆتايى.
– : **غاية**/ مەبەست، ئەنجام.
– : **أقصى**/ ئەوپەڕ، ئەوپەڕى، ئەوپەڕەكەى.
**نِهى**: **نُهاء**: **زجاج**/ شوشە، بلور.
**نُهى**: **نُهْيَة**: **عقل**/ ژيرى، هۆش، بير.
**نِهاء**: **رخام شَفيف**/ مەڕمەڕى رون.
– **نِهاية. آخر**/ كۆتايى، پەڕ، پايان.
– . – : **غاية**/ مەبەست، ئەنجام.
**نوء**:
**ناء**: **سقَط**/ كەوت، كەوتە خوارێ، هاتە خوارێ.
– **بالحمل**: **نَهضَ به مثقلاً**/ بە ناڕەحەت بە كۆمەڵەكەيەوە هەڵسا.
– **به او اناءَهُ الحِمْلُ**: **اثْقَلَه**/ بارى گران بو، بە بارەكەيەوە نالانى.
– : **نَهضَ بجهد و مشَقّة**/ بە گران و ناڕەحەتى هەڵسا.
– . **نَاى**: **بَعُدَ**/ دور بو، دور كەوتەوە.
**ناوَأ**: **عارضَ**/ سەرپێچى كرد، ناقايل بو.
**مُناوأة. نِواء**: **مُعارضَة**: **مُقاوَمة**/ سەرپێچى، ناقايلى، بەرگرى.
**مُناوِيء**: **معارض. مُقاوم**/ ناقايل، بەرگر، دژكار، ياخى، بەربەرەكانى كار، بەلەسە

**نوْء. انواء. نَوّ**: **إضطراب البحر**/ پشێوى دەريا، گەرداو.
– : **مَطَر**/ باران.
**الأنواء الجوية**: **علم تقلبات و الارصاد الجوى**/ كەش (زانى، ناسى)، كەشەوانى.
**مِنواة مُسَجَلة التقلبات الجوية**/ كەش نوس.
**مِنوئى**: **مختص بالارصاد الجوية**/ كەش (زان، ناس).
**نوب**:
**ناب عنه**: **قام مَقامَه**/ لەبرى بو، لەجياتى بو، بريكارى بو.
– **منابَهُ او عنه**: **كان نائباً عنه**/ نوێنەرى بو، جێى گرتەوە، چوە جێى.
– . **اناب الى**: **رجع مرة بعد مرة**/ زۆرجار گەڕايەوە.
– ـهُ. **إنتابَهُ امر**: **وقع له**/ كارەساتێكى بەسەر هات، توش بو.
– ـهُ **كذا**: **ناله. خَصَّهُ**/ دەستىكەوت، بەرىكەوت.
**انابَ. نَوَّبَ**: **وكّلَ**/ لە جێى خۆى داينا، كردى بە نوێنەرى.
**ناوَبَ**: **داوَلَ**/ نۆرەى گرت، سەرەى گرت.
**تناوَبَ**: **تَعاقَبَ**/ بەدواى يەكدا بون، دوابەدواى بو.
– **وا العمل و عليه**: **قاموا به مُناوَبَة**/ بەنۆرەو يەك لە دواى يەك ئيشيان كرد.
**إنتابَه**: **اتاه مَرَّةً بعد أخرى**/ بۆى هاتەوە، توشى بوەوە.
**نَوْبَة**: **دور**/ نۆرە، خول.
– : **فُرصَة**/ هەل، دەرفەت.
– : **مَرَّة**/ جار، كەڕەت، پات.
**بالـ –** . **مُناوَبَة**: **بالدور**/ بەنۆرە، بەسەرە.
**نيابَة**: **وكالة**/ جياتى، نوێنەرى، لەباتى، لەجێى.
**بالـ – عن**: **بالوكالة**/ لەجياتى، لەبرى، لە شوێنى.
**نيابَةً عن**: **بدلاً من**/ لەجياتى، لەبرى، لە شوێنى.
**نيابى**: **بالوكالة**/ نواندن، نوێنەرێتى.
– : **مكان اجتماع النواب**/ شوێنى كۆبونەوەى نوێنەران.
**مجلس –** : **مجلس النواب**/ ئەنجومەنى نوێنەران.
**نائب. مُناب**: **وكيل**/ بريكار، جێگر.

